# مێژووی ئەییووبی و مەملوکیەکان

نوسینی
دکتۆر أحمد مختار العبادي

وەرگێڕانی
نهاد جەلال حبیب الله

ناوی کتێب بەعەرەبی: في تأريخ الأيوبين والمماليک

نوسینی: دکتۆر أحمد مختار العبادی

ناوی کتێب بە کوردی: مێژووی ئەییووبی و مەملوکیەکان

وەرگێڕانی: نهاد جەلال حبیب الله

نەخشەسازی ناوەوە: شنۆ حمدامین

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم\٢٠١٠ ز

ژمارەی سپاردن: (١٢٤٠) ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە.

نارین کتێبخانەی نارین

هەولێر - چوارپیانی شێخ محمودی حەفید

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

ژ. ت/(٠٠٩٦٤) ٢٥١١٩٨٢ ٦٦

E- mail: nareen @ nareenco.com

Web site :www. nareenco.com

# پێشکەشە

لە یادەوەری مامۆستا کۆچکردوم

دکتۆر محمد موستەفا زیادە

وەك داننان بە فەزڵ و گەورەیی ئەم مامۆستایەمدا

ئەم هەوڵە نەوازشیە پێشکەش دەکەم

# پێشەکی

یەکێك لە ماوە دیارەکانی ناومێژووی ئیسلامی، ماوەی دەسەلات و فەرمان ڕەوایەتی هەریەك لە دەوڵەتی ئەیوبی و پاش ئەوانیش مەمالیکەکانە، کە بەشی هەرەزۆری جیهانی ئیسلامی ئەوکاتەیان لەژێردەستدا بووە.

ئەیوبیەکان بەدەسەلات گرتنەدەستیان و بەتایبەتیش لەسەردەمی (صلاح الدینی ئەیوبی) یەوە، توانیان تەکانێکی گەورە بەجیهانی ئیسلامی بدەن، و خۆڵ و تۆزی کەڵەکەبووی چەندین ساڵی فەرمانڕەوایەتی تورك و بوەیهی و سەلجوقی بتەکێنن، و وەرچەرخانێکی زێڕین لەو بوارەدا بێننەدی، دووبارە شان و شکۆ بۆ دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامی بگێڕنەوە، و بۆ ماوەی زیاترلە سەدەو نیوێك حوکمی ئەو دەوڵەتەبکەن بەناوی خەلافەتی عەبباسیەکانەوە، ئەمەش لەچەند بوارێکدا ڕەنگی دایەوە لەوانە هەوڵدان بۆ بەیەك کردنەوەی ناوچە دابڕاوەکانی خەلافەت، چ لەڕووی سیاسیەوە کەیەك حاکمیان هەبێت وەك میسر و شام لەسەردەمی (صلاح الدینی ئەیوبی)، چ لە ڕووی بیروباوەڕی ئاینی کە یەك ئاینزایان هەبێت کە دەوڵەتی (فاتمی) شیعەی لەناوبرد لەمیسر و بەمەش توانی لێدانێکی گەورە لە شیعەگەری بدەن لەجیهانی ئیسلامی و ئاینزای سونە بکەنەوە بە ئاینزای سەرتاسەری دەوڵەتەکە، ئەمانەو جگە لە ڕووبەڕووبوونەوە بەردەوامەکانیان لەگەڵ خاچ درووشمەکان بەجۆرێ کە توانیان بەرگری کارێکی بەهێزبن بۆ لەناوچوونی خەلافەتی ئیسلامی .

ئەم بارە لەدوای (صلاح الدینی ئەیوبی)، سەرباری ئەو ناکۆکیە گەورانەی کەوتە نێو بنەماڵەی ئەیوبیەکان لەسەر چۆنیەتی گرتنە دەستی دەسەلات، بەلام هەردرێژەی هەبوو، بەتایبەتی لەسەردەمی (مەلك عادل و مەلیك کامل و صالح نجم الدین ئەیوب و تۆران شا)دا، هەرچەندە خوێندنەوەو دیراسەکردنی ئەو مێژووی ململانێیانەش دووبارە ئەزموونێك و ئاوێنەیەکی گەورەیە بۆداهاتووی نەتەوەکانی ئێستا، ئەمە جگە لەچەندین لایەنی سیاسی و شارستانیەتی مەزنی ئەیوبیەکان کە

لـەماوەی دەسـەڵاتیاندا پێـشکەشی جیهـانی ئیـسلامیان کـردووە و تائێـستاش شوێنەواری هەندێکیان هەرماوە.

لە پاش ئەیوبیـەکان دەوڵـەتێکی تـر سـەری هەڵدا لـەجیهانی ئیـسلامیدا کـە لـە مێژوودا بە دەوڵەت یاخود ماوەی (مەمالیکەکان) کۆیلـەکان ناسـراوە، کـە لەشـان و شـکۆ و بـوونی دەسـەڵات ئەگـەر لـە ئەیوبیـەکان زیـاتر نـەبووبێتن ئـەوا کـەمتریان نـەکردووە، ئـەم کۆیلانـە لەدەوڵـەتی ئەیوبیـدا لەلایـەن نەوەناکۆکـەکانی بنەماڵـەی ئەیوبیەکانـەوە لەناوچـەکانی قـەفقاز و ئاسـیای ناوەڕاسـت و پـشت ڕووبـارەوە دەیانهێنان، و لە بازاڕەکانی(نخاسە) کۆیلە فرۆشتندا دەیانکڕین، بۆیـە بـە کۆیلـەی سـپی ناسـرابوون، هێنـانی ئەمانـەش بەمەبەسـتی بـەهێزکردنی سـوپای نـاوخۆیی خۆیان بوو بەتایبەتی پاش(صـلاح الـدین الایـوبی)، تـا لـەململانێ ناوخۆییەکانیانـدا ڕووبـەڕووی یـەکتری پێببنـەوە، دیـارترین بـەرفراوان بـوونی ئـەم کۆیلانـەش لـە سەردەمی(صالح نجـم الـدین ئەیـەوب)دا بـوو، بـەجۆرێك کەزۆربـەی سـوپاکەی لـەم مەمالیکانە پێك دەهاتن، ئەمـەش لەبـەر متمانـە نـەبوونی بـە مـیرە ئەیوبیـەکان تـا لەکاتی ناهەمواردا بەدەمیـەوە بـچن، بۆیـە بـەجۆرێکی وەهـا زیادیـان کـرد کـەپاش مردنی (صالح نجـم الـدین ئـەیوب) و هاتنەسەردەسـەڵاتی (تـوران شـا)ی کـوڕی زوو ڕاپەڕین و (تۆران شا)یان کوشت، و خێزانەکەی (صالح نجم الدین ئەیوب) کـە نـاوی (شجر الدر)بوو بکەن  بە پێشەوای میسر کە بۆخۆی لە مەمالیکەکان بوو .

بەگرتنەدەسـتی دەسـەڵات لەلایـەن (شـجر الـدر)ەوە وەرچـەرخانێکی گـەورە لەدەوڵەتی ئیبسلامیدا ڕوویدا، کە بۆیەکەم جار ژنێك دەسـەڵاتی بەشـێکی گـەورەی جیهانی ئیـسلامی گرتەدەسـت کـە میـسر بـوو، هەرچـەندە ئەمەلەلایـەن خەلیفـەوە قبوڵ نەکرا بۆیە (شجر الدر) ناچار مێردی بەیـەکێك لەسـەرکردە مەمالیکـەکان کـرد کـە (عزالـدین أیبـك)بـوو، بەدەسـەڵات گرتنـە دەسـتی (عزالـدین أیبـك) دووبـارە وەرچـەرخانێکی نـوێ هاتەوەکایـە ئـەویش بۆیەکـەمجار کۆیلەیـەك دەسـەڵاتی گرتەدەسـت، بـە گرتنەدەسـتی دەسـەڵاتیش لەلایـەن ئەمـەوە سـەرەتای دەوڵـەتی مـەمالیك دەسـت پێـدەکات کـە بۆمـاوەی زیـاتر لـە دووسـەدەو نیـو تاهـاتنی

عوسمانیـەکان حـوکمی بەشـی زۆری جیهـانی ئیـسلامیان کـرد، ڕەنگـە دیـارترین ڕۆڵەکانیان لە ڕزگارکردنی جیهان و بەری ئەفریقاو ڕۆژئاوا بێت لەدەست مەغۆلەکان کـە لەسـەردەمی سـوڵتان (قطـز)دا بـە سـەرکەوتنێکی گـەورە لـە جـەنگی (عـین جالوت)دا بۆیەکەمجار مەغۆلەکانیان شکاند، ئەمانەو جگە لە ڕۆڵـی سـوڵتان (ظـاهر بیبرس) لە ڕووبەڕووبوونەوەی خاچ درووشم و پاشماوەی مەغۆلـەکان و یەکخستنی دووبارەی جیهانی ئیسلامی بەتایبەتی میسرو شام، کە هیچیان لە ئەیوبیـەکان لـەم بـوارەدا کـەمتر نـەبوو ئەمانـە سـەرباری لایەنـە شارسـتانی و زانـستیەکان کـە لەسەردەمیاندا پێشکەوتنێکی بەرچاویان بەدەست هێنا .

لێرەدا حـەزمانکرد بۆبەرچـاو ڕوون بـوونی خوێنـەر وەك سـەرەتایەك ئـەم چـەند دێڕە بخەینە ڕوو، درێژەی ئەمانەو چەندین خاڵی تر بۆ خوێنـەر بەجێدەهێڵین، کـە لەم کتێبە بەنرخەوە زیاتر ئاگاداری لایەنەکانی ئەومێژووە پڕلەهەڵاوێرو ململانێ و ئەزموونەی بەشێکی گەورە ڕۆژهەڵات وەربگرێت .

چیرۆکی وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ ئەو کاتە دەگەڕێتەوە کاتێك لەسـاڵی (٢٠٠٨ — ٢٠٠٩) وانەی مێژووی (مەغۆل و مەمالیك)مان دەگوتەوە لە بەشی مێـژووی کـۆلێجی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی، وەك یەکێك لەبابەتە گرنگەکانی ئەوبەشـە بۆ خوێندکاری بەشی مێژوو، بەڵام ئەوەی لـەو ماوەیـەدا تێبینیمـان کـرد سـەرباری گرنگی زۆری ئەم بابەتە و پەیوەندی قوڵی بە مێژووی ڕۆژهەڵاتەوە، کەچی تائێـستا بـەزمانی شـیرینی کـوردی هـیچ سەرچـاوەیەکمان نیـە ئامـاژە بـەم مێـژووە و بەلایەنەکانی بدات، کتێبخانـەی کوردی لـەم بـوارەدا گـەلێك هـەژارە، خوێنـدکار و خوێنـەری کـوردیش بەنـەزانینی زمانـەکانی تـر بەتایبـەتی عـەرەبی زۆرئاگـاداری ئەومێژووە نابێـت و بـاش لایەنـەکانی بـۆ دەرنـاخرێ، بۆیـە پـاش ووردبوونـەوەمان بەنێو سەرچاوەکاندا و پـرس کردنمـان بەچـەند مامۆسـتایەکی پـسپۆڕی تـری ئـەم بوارە بڕیارمان دا کە ئەم کتێبەی پرۆفیسۆری بەناوبانگی میـسری (د.أحمـد مختـار العبادی) هەڵبـژێرین، کـە بۆخـۆی مەنهـەجی خوێندنـە لـە زانکـۆی ئەسـکەندەریەی میسر و بەشێوەیەکی زانستی و ئەکادیمیانەو بێلایەنانە نووسراوە .

برای بەڕێز کاك (نیهاد جلال حبیب الله)مان ئاگادارکرد کە بە دەست و پەنجە ڕەنگین و قەڵەمە بەبرشتەکەی ئەم کتێبە وەربگێڕێتە سەرزمانی شیرینی کوردی، تا خوێنەری کورد بەگشتی و خوێندکاری بەشی مێژوو لەزانکۆکانی کوردستان وەك سەرچاوەیەکی لاوەکی لێی سوود مەند ببن، و بەرچاو ڕوونیەك بێت بۆیان لەو بوارەدا، کاکە نیهادیش قۆڵی مەردانەی لێ هەڵماڵی و بەم جۆرەی ئێستای بەماوەیەکی کەم وەریگێڕایە سەر زمانی کوردی، کە جێگای خۆیەتی دەست خۆشی و پیرۆزبایی لەکاکە نیهاد بکەین بە وەرگێڕانی ئەم کتێبەو هەردەم قەڵەمەکەی بەبرشت بێت .

لەکۆتایشدا نامەوێ زیاتر و تەقلیدیانە باس لە بەشەکانی کتێبەکەو ناوەڕۆکەکەی بکەم، خوێندنەوەی ئەو بابەتە بۆ خوێنەر بەجێ دەهێڵین و هیوادارم ئەم کتێبەش ئەو مەبەستەی خۆی بپێکێت و ببێتە سەرچاوەیەکی سوود بەخش و کەلێنێکی کتێبخانەی کوردی بگرێت .

زریان حاجی
مامۆستا لە بەشی مێژوو زانکۆی سلێمانی
٣٠ /٢٠٠٩/٩ سلێمانی

# پێشەکی نووسەر

ئەم کتێبە باسی مێژووی ئەیووبیەکان و مەمالێکەکان لە میسر و شامدا لە ڕوانگەی ئەم کتێبەوە هەوڵمداوە گرنگی ڕۆلی سیاسی و ژیاری سوار چاکی مەملووك لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا و ئاستی کاریگەری لە ڕێکردەی ڕووداوە نێودەوڵەتی و هەرێمیەکانی سەردەمی ناوەڕاستدا بخەمەڕوو ئەو گەڕانەوەیش ئەوەی دەخواست شارەزای بنەڕەتی بەکارهێنانی مەمالیك لە کۆمەڵگەی ئیسلامی ئەو ڕێکخستنە پەروەردەییە سەربازیە ئیسلامیانەدا دابین کە شوێنی ئامادەسازی و پێکێهانی نینعە بە درێژی سەردەمە ئیسلامیەکان گرتۆتەبەر هەر لە سەردەمی سامانی و غەزنەوی و خوارزمی و سەلجووقیەکان و پاشان ئەیبوبیەکانەوە کە فەزڵی گواستنەوەی ئەو ڕێکخستنانە بۆ میسر بۆ ئەوانە دەگەڕێتەوە و ماوەی چەند سەدەیەك لەسەردەمی دەوڵەتی مەمالێکدا مانەوە و پوختەی ئەو ڕێکخستانەی تێدادەرکەوتن.

ئەنجامی ئەم ئەزموونە پێشووە مەملووکیانە کە وڵاتی ئەو دیو ڕووبار و ئەفغانستان و هێندو خوراسان و عێراقیان لە ڕۆژهەڵاتەوە وڵاتی مەغریب و ئەندەلوسیان لە ڕۆژئاواوە داگرتبوو، قلقشندی ئەو دیاردە باس دەکات و دەڵێت: (دەسەڵاتی مەماڵیك لە میسر دەستی دایە ئەوەی لەهەموو ناوچەیەك چاکتر لەجاران پێشینەی خۆی بگوازێتەوەو ڕێگەکەی گرتەبەرو بە شوێن ڕێ و ڕێبازەکەیدا چوو تا ئەوەی پوخت بوویەوەو بەجوانترین شێوە خۆی ڕێکخست و بەسەر هەموو ناوچە و دەسەڵاتەکاندا سەرکەوت پێشیانکەوت).[1] هەموو ئەمانە هۆکارەکانی ئەو سەرکەوتنانە ڕوون دەکەنەوە کە ئەو مەمالیکانە لە جەنگە جیهادیانەدا بەدییان هێناوە کە لەچەند بەرکی جیاوازدا لەیەك کاتدا دژ بە خارجپەرستان لە ڕۆژئاواوەو مەغۆل لە ڕۆژهەڵاتەوەئەرمەن لە باکوورەوە و نوبثیەکان لە باشوورەوە ئەنجامیان دەدات، ئەمە لە پاڵ ئەو چاکسازییە کارگێری و دەستکەوتە ئابووری و دامەزراوە بیناسازیانەی وایان لێکرد لە دیارترین

---

١ـ(صبح الأعشى:ج٤،ص٦).

دەوڵەتەکانی جیهان بێت لە ڕووی هێز و گەشەسەندنەوە.

پێشتر لەم بارەیەوە کتێبێکم بڵاوکردەوە بەناونیشانی(قیامة دولة المماليك الأولى في مصر و الشام)تیادا لەسەردەمی سوڵتان بیبرسدا کۆتاییم پێهێناوە، بەڵام پێم باشبوو لەم کتێبەدا درێژە بە مێژووی ئەو دەوڵەتە مەملووکیە بدەم کە بە دەوڵەتی مەمالیکی بەحری ناسروە و تا کۆتاییەکەی بڕۆم واتە تا کۆتایی سەردەمی بنەماڵەی قلاوون و دامەزراندنی دەوڵەتی دووەمی مەمالیك کە بە بورجی یان چەرکەسی ناسراوەو لەسەردەمی دەستی سوڵتان زاهیری برقوق دامەزرا خوای گەورەیش پشت و پەناو ڕێنموونێکەری.

نووسەر

ئەسکەندەریە ١٤/١١/١٩٩٤ز

# بەشی یەکەم

## مەمالیکەتورك و سەقلەبەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا

ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەی ڕۆڵی مەمالیکەکان لە مێژووی هەریەك لە دەوڵەتی ئەیووبی و دەوڵەتی مەمالیکەکان لە میسر و شام لەخۆدەگرێت، لێکۆڵینەوە مێژوویش بۆبابەتی لەم شێوە پێویستی بەو دیدو ڕوانینە کشتگیرە هەیە، کە ڕەچاو و شیکاری تەیار و بزووتنەوەکان بکات هەر لەسەر هەڵداینانەوە تا کاتی پێگەیشتنیان و کاریگەرییان لە ڕێکردەی ڕووداوەکاندا، ئەمەیش ئەوەمان لێدەخوازێت چارەسەری بنەڕەتی بەکارهێنانی مەمالێکەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامی بەگشتی بکەین، پاشان بچین بەدوای گەشەسەندنی هەڵە میرەیان و قۆناغەکانی گەشەسەندن و ئاستی بەشدارییان لە کارەکانی جەنگ و جیهاندا بەتایبەتی لەسەردەمی ئەیبووبیەکان و مەمالێکەکان کە ئەمەیش بابەتی لێکۆڵینەوەکەمانە، مەملووك کۆیلەیەکە کە دەفرۆشرێت و دەکردرێت، بەڵام ئەوە هەیە ناو نە کە لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا لەسەر دەستەیەکی کۆیلەی سپی پێست بەرتەسککراوەتەوە کە فەرمانڕەواکان لە بازاڕەکانی کۆیلە فرۆشیدا دەیانکڕێت تا لە ڕۆژانی ئاشتیدا چەند دەستەیەکی تایبەتی سەربازییان لێ پێك بهێنن و لە ڕۆژانی جەنگدا بیاندەنەوە پاڵ سوپای گشتیەوە، پاشان مەملووك بوو بە تاکە پێناوی جەنگی لە چەند دەوڵەتێکدا وەك دەوڵەتی مەمالێك لە میسر و شام.

مەبەست لە سەلجوقیەکان ناودارترینی جۆرەکانی کۆیلەی سپی ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی بوون.

بەکارهێنانی تورکەکان لە وڵاتانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا بڵاوبوویەوە چونکە پەیوەندی هەبوو بە نیشتمانی سەرەکییان لە نێوەندەکانی ئاسیادا، کۆیلە سەلجوقیەکانیش لە ڕۆژئاوای ئیسلامیدا بڵاوبوونەوە ڕێگەی سەرەکیشی ئەو

ڕێگەبوو کە لە ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیاوە دەستپێدەکرد بۆ ئیتاڵیا و فەڕەنساو لەوێوە بۆ ئەندەلوس و دوورگەی سقلّیە و مەغریب.

مەبەست لە سەقلّەیەکان لە کتێبە عەرەبیەکاندا دانیشتوانی وڵاتە جیاوازەکانی بولغاریای گەورەی کە زەوی ئەو وڵاتە لە دەریای قەزوینەوە بۆ دەریا ئەدریاتی درێژی دەبوویەوە.

بۆ ئاسانکردنی لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە وامان پێم باش بوو بەم جۆرەی خوارەوە بەشێوەی جیا بەتایبەتی قسەی لەسەر هەردەستەیەك بکەین.

## مەمالیکە تورکەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا

بێگومان سەردەمی کۆیلە تورکەکان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا زۆر لە پێشترە لە کۆیلەی سەقلەبی چونکە موسڵمانان لەسەر دەستی سەکردەی عەرەبی قوتەیبەی کوڕی موسلیم لە کۆتاییەکانی سەدەی یەکەمی کۆچی واتە سەدەی حەوتی زایینیدا لە ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتنە وڵاتی تورکستان و ئەودیو ڕووباری سەیحون و ڕووباری جەیحون و فەتحیانکرد، لەوکاتەوە کۆیلەی تورکی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا شوێن و پایەیەکی ناوازەی هەبوو لەبەر وەفاداری و دلێری و چاکی قەد و قیافەی و جوانی وبەژن و بالایان). زۆربەی ئەو کۆیلانە لە ڕێگەی دیلگرتنی ناوجەنگەکان یان لە ڕێگەی کڕین لە ڕۆژانی ئاشتیدا هێنرانە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی و وەك خزمەتکار و پاسەوان بەکارهێنران، ئەمە پێش ئەوەی موسڵمانان هیچ شتێك لە سەقلەبەکان وڵاتی سەقلەبەکان بزانن.

هێندەی نەبرد هەرێمەکانی ئەودیو ڕووباری(واتە: ڕووباری جەیحوون) وەك خوارزم و شاش و(نەشقەند)و ئەشرسنە و فەرغانە و سەمەرقەندی و بوخارا بوون بەچەند مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانی کۆیلەی تورکی دوای ئەوەی ئەو کۆیلانە ئامادەکران و پەروەردەیەکی سەربازی ئیسلامی دەکران دواتر دەنێردران بۆ بەشەکانی جیهانی ئیسلامی.

وا باوبوو والیەکانی ئەو هەرێمانە لەسەر شێوەی دیاری هەندێك لەو کویلانەیان بۆ خەلیفە یان وەزیر دەنارد تا ئەوەی نەناردنی ئەو جۆری دیارییانە بوو بە هێمایەکی شۆڕش یان سەرکەشی هەرێمەکاندا سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن ئەو تورکانە کە یەکەم جار لە ڕێگەی جەنگ یان کڕینەوە دەهێنراوە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامیەوە وەك کۆیلەکانی ترلە کارە ئاست نزم و ڕسواکانی وەك پاککردنەوەی ماڵ و سەرپەرشتیکردنی ئاژەڵ و کاری لەوجۆرەدا هەڵسوکەوتیان لەگەڵدانەدەکرا، بەڵکوو پایەکانی دەڵاسەت و سەرکردایەتی ناو دەوڵەتیان دەگرتە دەست، قسەکەی ئیبن و حەسولی مێژوونووس(کۆچکردووی ٤٥٠ك)لە کیتبەکەیدا (تفضيل الأتراك علی سائر الأجناد) پاڵپشتی ئەمە دەکات: تورکێك ئەگەر لە شوێنەکەی خۆیدا بچوایەتە دەرەوە ڕازی نەدەبوو مەگەر ئەوەی بە سەرکردایەتی سوپایەك یان دەبوو پەردەدا ریەکی هەبوایە یان سەرکردایەتی دەستەیەك بێت هەروەك ڕازینە دەبوو گەورەکەی لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و سواریدا لەگەڵیدا یەکسان بێت، هەر خزمەتێکێشی پێ بسپێردرایە دەبوو، چەند کۆیلەی و کەنیزەکێکی لەبەردەست بوایە وەك خزمەتکاری ماڵ و سەرپەرشتیاری ئاژەڵ و کاری لەوجۆرە).[1]

ئەمە وا دیارە بەکارهێنانی تورکەکان لە پیشەو ئەرکە گەورەکانی دەوڵەتدا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەردەمی یەکەمی عەبباس، جا کیندی لە کتێبەکەیدا(الولاة والقضياة)دەگێڕێتەوە کە خەلیفەی ئەبوو جەعفەری مەنسوور یەحیای کوڕی داودی سەرخەستی مەملوکی خۆی کردووە بە والی ئیمارەتی میسردا(١٦٢ـ١٦٤ك)وەسفکێشی کردووەکە ئەو هەواداریە نیشان دەدات کە مەملوك بە مامۆستاکەیەوە دەبەستێتەوە، ئەو لەوبارەیە دەڵێت: (ئەو کەسێکە لەمن دەترسێت وا لە خوانا ترسێت)ئەمەو تەبەری باس لەوە دەکات لە سەردەمی هارون ڕەشیددا شاری تەرسوسن لەسەر دەستی ئەبوو سەلیم فەرەجی خادمی تورکی بنیادنرا، هەروەها مەئموون لە پاسەوانی خۆیدا چەند مەملووکێکی تورکی

---

١ـ(عباس العزاوي: المجلة التركيه، الجزء الرابع، عدد ١٤، أنقرة.١٩٤٠).

بەکارهێناوە لەوانە ناوی ئەوانە دێنین: تۆلۆن کە فەرمانڕەوایی شاری بوخارا لە چوارچێوەی دیاری کۆیلەی تورکی لە ساڵی(٢٠٠ك)بۆی نارد، تۆلۆن لەناو کویلەکاندا بەرە بەرە پلەی بەرزبوویەوە تا بوو بە سەرکردەی پاسەوانی خیلافەتی عەبباس ئەو باوکی ئەحمەدی کوڕی تۆلۆنی دامەزرێنەری دەوڵەتی تۆلۆنی بوو لە میسرو شامدا.

پاشان خەلیفەی موعتەسەم هات کە دایکی تورك بوو، ئەم خەلیفەیە بەرفروانیکرد لە بەکارهێنانی مەمالیکە تورکەکاندا وەك سەربازی ناو سوپا تا ئەوەی ژمارەیان گەیشتە١٣ـ ١٩ هەزار سەرباز و لە باکووری بەغداد پایتەختێکی نوێی بۆ دامەزراندان کە شاری(سرّمن رأى)،(سامە راء)بوو، بەوجۆرە دەبینین موعتەسەم یەکەم کەس نەبووەکە چەند دەستەیەکی سەربازی لە تورکەکاندا پێکهێناوە، بەڵکوو ئەو یەکەم کەس بوو کە بەرفروانیکرد لە هێنانیان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، شتێکی ئاسایی بوو قەڵەمڕەوی ئەو تورکانە زیاد بکات دوای ئەوەی بوون بە ڕەگەزێکی گرنگی ناو کۆمەڵگە و سوپای ئیسلامی، جا کاتێك قەڵەمڕەوی خیلافەتی عەبباسی لە هەرێمەکاندا لاواز بوو، کاربەدەستانی ناوچەکان پەنایان برد بۆ سەربەخۆی وەرگرتن بە ناوچە هەرێمەکانیان، ئەو ڕەگەزەتورکیە بوو بە کۆمەڵەکەی ئەو بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازانە، وەك عەمری کوڕی لەیسی سەفاری دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفاری لە خوراسان کە پشتی بەست بە کڕینی مەمالێکی بچووکی تورك و بۆ پاسەوانی خۆی دەستەیەکی لێپێکهێنا هەروەك پشتی بەست بە پێشکەشکردنی زۆرێکیان بەسەرکردەکانی خۆی بەبێ ئەوەی لە خەزێنەی خۆیدا مووچەی ببڕێت تاوەکو بە نهێنی هەواڵی ئەو سەرکردانی پێبگەێنێت.

کاتێك دەوڵەتی سامانی لەسەر جێی دەوڵەتی سەفاری لە ساڵی ٢٩٠ك ــ٩٠٣ز دا دامەزرا و شاری بوخاری کرد بە پایتەختی خۆی، پاشاکان لەگەڵ ئەوەی لە بنەڕەتیدا فارسی بوون سوور بوون لەسەر ئەوەی مەمالێکە توورکەکان ڕابکێشن، ئەوان گرنگیەکی گەورەیان بە پەروەردەو ڕاهێنان و ئامادەسازییان دەدا تا ئەوەی زۆربەی سوپاکانیان بوون بە ئەوان نیزا مولمولکی تووشی(کۆچکردووی

٨٥كۆچى)وەزیری سەلجووقی لە کتێبەکەیدا(سیاسەت نامە).[١] وەسفێکی وردی ئەم نیزامە پەروەردەییە دەکات کە سامانیەکانی بۆ مەمالیکەکانی خۆیان دایاننابوون، لەوەیشدا دەڵێت:

مەمالیکەکان سامانیەکان لەسەر بنەمای خزمەتگوازی و دلێرییان و بە دووری لە پشت بە ڕەچەڵەك و شانوشکۆ پلەبە پلە پایەیان بەرز دەبوویەوە، جا کاتێك مەملووك دەکڕ درا ساڵێك لەسەر پێکانی خزمەتی دەکرد و کڵاوێکی لۆکەیی دەکردە سەر کە بە زانداجی.[٢] ناو دەبرا لەپاڵ گەورەکەیدا بوو کە سوارەی ئەسپەکەی بوو بوو لە ساڵی یەکەمیدا دەرفەت بە مەملووك نەدەدرا. بە هیچ جۆرێك سواری ئەسپ بێت ویەوە و ئەو بیانووەی بۆ لەسنور لادانی بۆخۆی هێنایەوە کە ئەو کەسە ڕەسەنە و ڕەچەڵەکی ناوا زە و هەڵکەوتەیە.[٣]

پاشان قەدەروای خواست ئەلبەتکینی والی خوراسان لەلایەوە سامانیەکانەوە بچێتە غەزنە لە ساڵی(٣٥١ك ـ ٩٦٢ز)و لە ناوچەرگەی شاخەکانی سولەیمان لە باکووری هیند بە هۆی مەمالیکە تورکەکانیەوە دەوڵەتێکی سەربەخۆی دابمەزرێنێت کە هیچ پەوەیوندیەکی بە سامانیەکانەوە نەبوو جگە لە لایەنی شوێنکەوتەیی ناوییەوە نەبێت، ئەویش دەوڵەتی غەزنەو بوو، ئەلبەتکین لە ساڵی(٣٥٢ك ــ ٩٦٣ز)دا کۆچی دوایی کرد و پاش چەند ساڵێکی کەم کاروباری ئەو دەوڵەتە درایە دەست سەبەکتکینی زاوا و مەملووکیش(٣٦٦ــ ٣٨٧ك/ ٩٧٦ ـ ٩٩٧ز)کە بە دامەزرێنەری حەقیقی دەوڵەت غەزنەوی یان سەبەکتکینی دادەنرێت.[٤] لە سەردەمی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی کوڕی سەبەکتکیندا(٣٨٨ـ ٤٢١ك / ٩٨٨ــ

---

١ـ(کتێبەکە بە زمانی فارسیە و شیفر(schefer)وەریگێڕاوە بۆ فەڕەنسی).

٢ـ(زندجی دەدرێتەوە پاڵ شاری زاندانە(zandanah)لە باکوری بوخارا کە پۆشاکی لۆکەیی ناسرابوو دەدرانەوە پاڵ ئەو شارە).

٣ـ(دەوترێت سەبەکتکین لەنەوەی کیسرا یەزگوردی سییەمی کۆتای پاشای ساسانی فارسی بووە و پاش مردنی یەزگورد کەسوکاری بە نایان بردووە بۆ تورکستان و دواتر لە سجستان سەقا مگیربون و لەوێ لەگەڵ تورکەکاندا یەکیان گرتووە).

٤ـ(Lane poolel medieval indaunder Mohammedan rule. P.٦٥).

١٠٣٠ن) کاتێك ئەم سوڵتانە ناوی هێناوە سامانیەکانی لە ناوچەی دەسەڵاتیدا لەکارخست و وتاری بۆ خەلیفە قادربیلاهی عەبباسی خوێندەوە دەوڵەوتی غەزنەوی گەیشتە ئەوپەڕی بەهێزی خۆی، خەلیفە نازناوی یەمینو دەولە و ئەمینولمیللەی بە سوڵتان مەحموودی بەخشی، ئەم سوڵتانە دوانزە جار هێرشی بردە سەر وڵاتی هیندی و هەرێمی بنجابی کرد بە ویلایەتێکی ئیسلامی کرە لاهور پایتەختەکەی بوو، پاشان لە دوای مردنی مەحموودی غەزنەوی لە ساڵی(٤٢١ك) بەهۆی دەکەوتنی سەلجووقیەکان بە سەرکردایەتی توغەولبەگ و دەستگرتنیان بەسەر زۆربەی ناوچەکانی غەزنەویەکاندا دەوڵەتی غەزنەوی لاوازو شێواو بوو و تەنها چەند ویلاتێکی باکووری هیندی لەدەوری شاری لاهوی بۆ مابوویەوە، بابەتی گرنگیدان بە مێژووی غەزنەویەکان لێرەدا ئەوەیە کە ئەوان لەسەر شێوەی کاری سامانیەکان بەزیاتر مەمالیکە توورکەکانیان لە سوپا و کارگێڕ و کاروباری دەسەڵاتدا دادەنا ئەلتنتاش(Alfunfash)ی مەملووکی سەبەکتکین ڕۆلی دامەزرێنەری دەوڵەتی خوارزمی لە ساڵی(٤٠٨ك ـ ١٠١٧ن).[1] دا ببنی و دەوڵەتی خوارزمیش لە پشبەستنی تەواو بە مامالیکە تورکەکان لە هەموو کاروباری دەوڵەتدا ڕێڕەوی پێشینەکانی خۆی گرتەبەر.

لە ساڵی(٥٨٢ك ـ ١١٨٦ن)دا دا غوریەکان بەسەرکردایەتی شەهابەدین غوری دەستیگرت بەسەر لاهوردا و بەمەیش دەوڵەتی غەزنەوی لەناو چوو، دەوڵەتی غوری(٥٤٣ـ ٦١٣ك/ ١١٤٨ـ ١٢١٥ن)دەدرێتەوە پاڵ شوێنی سەر هەڵدانی لە شاخەکانی غووری کە هەرێمێکی نێوان و غەزنەبوو لە ئەفغانستان، غوریەکان توانییان شانیشنەکەیان فراوان بکەن تاجی ناوچەی غەزنەویەکان لە ئەفغانستان و هێندی باکووری دا هەبوو گرتیانە دەستی، جا دەوڵەتی غوری دووەم دەوڵەتی هیندی ئیسلامیە دوای دەوڵەتی غەزنەوی، بەلاّم سوڵتانەکانی ئەم دەوڵەتە غوریە هەمیشە لە هیندا نەدەمانەوە، بەڵکوو لەشاری غەزنەدا پایتەختێکی دەسەلاّتی دادەمەزراند و لەڕێگەی مەمالیکە تورکەکانیانەوە سەرکردایەتی هیندیان دەکرد،

١ـ(تنتاش ناز ناوی خوارزشاهی هەڵگری و دەسەلاّتی ئەو دەوڵەتی لە بنەماڵەیەکدا پاش مردنی لە ساڵی(٤٣٢ك ـ ١٠٤٠ن)دا مایەوە(Ency. OfIslam Art. Aluntash)).

سـولتان مـەحمودی غـوری لـە کڕینـی مەمالیکەکانـدا زۆری چـوو و گرنگـی دا بـە پەروەردەکردن و ئامادەسازییان بۆ ئەرکی جیهادو غـەزا لێـی دەگێڕنـەوە هـەرکات یەکێك لەبارەی پێویستی بوونی کوڕێك مشتومڕی لەگەڵدا بکردایە تاکوو ئـەو کـوڕە لە دوای خۆی دەسـەڵاتی خێزانەکـەی بپارێزێـت. ئـەو وەڵامـی دەدایـەوە کـە ئـەوە هەزاران کوڕی هەیە کە مەمالیکە تورکەکانن.[1] هەندێك لەو مەمالیکانە بۆ پایـەکانی دەسەڵات و سـەرکردایەتی بەرزبوونـەوە، لەوانـە نـاوی ئەمانـەیان دێنـێن: تاجـەدین یەلـدر(yildiz)کـە فـەرمانڕەوایی کرمـانی دەکـرد، و ناسـرەدین کوبـا شـاغ لـە سـندوقوتبەدین ئەیبـەك لـە دلهـی کـە لـە هـەموویان قەڵـەمڕەوی بـەهێزتر بـوو.[2] موحمـەدی غـوری بـەهۆی هـەوڵی مەمالیکەکانیـەوە و لەسـەروو هـەموو یـشیانەوە ئەیبـەك تـوانی هـەموو ئـەو ناوچـانە بگرێتـە دەسـت کـە لـە بـاکووری شـاخەکانی فندهیاس(Vindhyas)لە هیند بوون تا ئاوەڕێژگەی ڕووباری کنج، بەمە ئیسلام هـەمووی گرتـەوە و پەرستگای هیندۆسیەکانی گـۆڕی بـۆ مزگـەوت و ژێردەسـتەی کردن و سەرانەی لەسەر سەپاندن.

قوتبەدین ئەیبەك پیاوێکی موسڵمانی پەیوەسـت بـە مەرجـەکانی ئیـسلامەبوو و ئەمەیش بەڕوونی لە دوژمنکاری توندیدا دژ بـە نیزامـی چینەکان دەردەکـەوێت کـە ئەو نیزامە لەهێنددا زاڵ بوو، هەروەها لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکدا بـە جیـاوازی چینەکانیانەوە لەسـەر بنـەمای یەکسانی دەردەکـەوێت کـە ئیـسلام داوای دەکـرد، مزگەوتێکی گەورە دلهی دەدرێتەوە پاڵ ئەیبەك کـە بـەناوی (هێـزی ئیـسلام) نـاوی نابوو، ئەو مزگەوتە مناری یەکی هەبوو دووسەدو پـەنجا پـێ بـەرزبوو بـە درێـژترێن منـاری جیهـان دادەنرێـت و تـا ئیـستایش مـاوەو بـەناوی(قطـب منـار)ناسـراوەو تایبەتمەندی نەخش و نیگاری خاوەی مۆرکی عەرەبی و هیندی هەیە.[3]

---

١ـ( Wolseley haig: The Cambridge History of India Voliiip ١٠ ٣٧).

٢ ـ(أبو الفداء: المختصر في أخبار البشر ج٣ ص٢٧).

٣ ـ(بڕوانـە: H.Dodwell. History of India I P.٢٥)دەڵـێن سـوڵتان تـتمس مەملوکی ئەیبەك بووەو کچەکەی هێناوە خەلیفە بووە لەسەر کورسی دەسەڵاتی دلهی ئـەو بـوو لە ساڵی (١٢٣١ـ ١٢٣٢ز). ئەو منارەی دروستکرد وەك ڕێزنان لە وەلیوڵڵا قوتبەدین کە عکـەعی

لە مارسی(١٢٠٦ز ـ ٦٠٣ك)دا سولّتان موحمەدی غوری لەسەر بەرەی سند بەدەستی یەکێك لە سەرکەشی ئیسماعیلیەکان کوژراوە بەمردنی ئەویش غەزنەو غوری لە مێژوودا شاردانەوە و شاری دلهی[1] وەك پایتەختێکی ئیسلامی دەولّەتی سولّتانە مەمالیکەکان لە هیند دەرکەوت.

ئەیبەك لە دوای مردنی گەورەکەی تەنها چەند سالّێك ژیاو دەسەلاّتی هیندستان لە نۆمبەری سالّی(١٢١٠ز ـ ٦٠٨ك)دا کۆتایی پێهات، ئەمەیش لە ئەنجامی کەوتنە خوارەوەی لەسەر پشتی ئەسپەکەی لەکاتی یاری ڕاکەو و فیرکەیان ـ جوکان ـ داو لە ئەنجامی ئەوەدا مرد.[2] لە دوای مردنی ئەیبەك ماوەیەك پشێوی گرتیەوە و تیایدا کوڕێکی ناتوانا کە بە ئارام شاە ناو دەبرا دەسەلاّتی گرتە دەست و لە کۆتاییدا یەکێك لە مەمالیکەکان دیارەکانی باوکی لایبرد کە مێردی کچەکەی بوو و ناوی شەمسەدین توتش بوو بە یارمەتی سەرکردەکانی تر لایبردو لە سالّی(١٢١٦ز)کە دەسەلاّتی دلهی خستە دەستی خۆی.

توتش بە دامەزرێنەری حەقیقی دەولّەتی سولّتانی مەملووکیەکان دادەنرێت، ئەیبەك ماوەیەکی پێویست نەژیا تا پایەکانی دەولّەتەکەی پتەو بکات و دامەزراندنی ئەنجومەنێك لە گەورە سەرکردەکانی مەمالیکی پێکهێنا کە بەناوی(ئەربەعین)چلی ناسرابوو، ئامانجی ئەوەیش پالّپشتیکردنی دەسەلاّتی

---

کە لە غەزنەو ملتان دادەنیشت پاشان لە کۆتاییدا لە دلهی سەقامگیربوو تا مردنی لە سالّی ١٢٣٥ز (رحلة ابن بطوطة ج٢ ص١٩).

١ـ(هەروەها بە دلهی و دلی ناودەبرێت(لقلقشندی: صبح الأعشی ج٥ ص ٦٨ـ ٦٩)دەکەوێتە ناو جەرگەی دەشتەکانی ڕووباری کینج لە شوێنێك کە سروشتی بۆ ڕەخساند بوو تابێتە پایتەخت بۆ هیندی باکووری. هەرکەس بچێت بە دوای مێژووی گشتی هیندا دادەبینێت ئاری دلهی شانۆیەکی چەند ڕووداوێکی جەنگی یەکلاکەرەوە بووە لەبەر گرنگی پێگە ستراتێژیەکەی. ئیبن بەتوتەی گەشتیاری تەنجی لەسەدەی هەشتەمی کۆچیدا(١٤ز)سەردانی کردووە واسفی دەکات: ئەو شارە گەورە و شکۆدارەی کە جوانی پتەوی پێکەوە کۆکردبوویەوە و ئەو شورەیەی هەبوو کە لەو ولاتانی دنیادا هاو شێوە نەبوو، گەورەترین شاری هیند بەلّکو و جیهانی ئیسلامیش لە ڕۆژهەلاّت بوو(رحلة ابن بطوطة ج١٢ ص١٦)).

٢ـ(Ency: Of Isfam Art: Aibeg).

مەمالێکەکان بوو لە هێند لە چاکەکانی توتمش ئەوەیە لەگێڕانەوەی مافی ستەملێکراواندا و دادپەروەری نواندنی لە ڕوویاندا بەتوندی هەوڵیدا و لێی دەگێڕنەوە فرمانی کردووە هەموو ستەم لێکراوێك بەرگێکی ڕەنگرێژکراو بپۆشێت و خەڵکی هیندیش هەموویان سپی بپۆشن، جا کەلای خەڵك دادەنیشت یان سواری ئەسپەکەی دەبوو کەسێکی بدیبایە جلی ڕەنگاوی لەبەردابوایە دەیڕوانیە کیشەکەی و لەو ستەمەی لێی کرابوو تۆڵەی لە ستەمکارەکە دەسەندەوە.[١]

هەروەها تایبەتمەندی سەردەمی ئەم سوڵتانە ئەوە بوو کە مەغۆڵ و جەنگیزخانی سەرکردەیان دەرکەوت کە هەڕەشەی لە هەموو جیهانی ئاسیایی دەکرد، یەکەم هەڕەشەی نزیکبوونەوەی ئەو مەترسیەیش لە هیندا ڕاکردنی بلدزی فەرمانڕەوای غەزنە بوو بە سوپاکانیەوە بەرەو ناوخۆی هیند لەبەردەم فشاری سوپا دارماوە خوارزمیەکاندا کە ڕووی سوپا مەغۆلەکاندا شکابوون.

ئەو سێ هێزە بەخێراییەکی توند بەرەو باشووری بەرەو خواردەبوونەوە و زنجیرە شاخەکانی باکووریان بەرەو ناوخۆی هیندا تێپەڕاند، بەڵام ئەم گەردەلوولە خێرا بەو خێراییە گەورەیش کە پێی هاتبوو ئاوابوو، ئەمەش بەختی هیند بوو کە مەغۆل چاویان و ڕوویان بڕی و لە هیندا پاشەکشەیان کرد لەبەردەم سوپا خوارومیەکان و جەلالەدین مونکە برتی سەرکردەیان کە کۆتا شاهی خوارزم بوو، چونکە ئەوان دوای ئەوەی نەیانتوانی لە بنجان بۆ خویان میرنشێنك دابمەزرێنن بەرەو فارس پاشەکشەیان کرد.

توتمش بەهێزتر لەوەی هەبوو لەو چەرمەسەریە دەرچوو کە هێزی مەغۆلی و خوارزمیەکان بەچەند هێزێکی ڕکەبەرەوە لەباکوری وەك یلدزو کوباشا پێکیاندادا و لەسەر ئەو ئاسان بوو دوای ئەوە هەموو ناوچەکانی ئەیبەکی مامۆستای لە باکووری هیندا بگێڕێتەوە و ڕکەبەرەکان لەناوببات.[٢] سەرکەوتنی توتمش گەیشتنە

---

١ ـ(رحلة ابن بطوطة ج٢ ص٢١).

٢ـ(یەلدزی فەرمانڕەوایی غەزنە لە ساڵی(١٢١٦ز)کوژراو کوباشای فەرمانڕەوای سندلەکاتی ڕاکردنی لە ساڵی(١٢٢٨ز)دا خنکا.(أبو الفداء المختصر في أخبار البشر ج٣ص١٢٢ـ١٢٣)" هەروەها( F. Pareja: Isiamohogia Ip. ٢٥٤)).

ئەوپەڕی کاتێك خەلیفەی موستەنسیربیلاهی عەبباسی لە بەغداد وەك سولّتانی هیند دانی بەدەسەڵاتیدا ناو نووسین و بەرگ و ئاڵا و بەندی لەسەرەتاکانی ساڵی(١٢٢٩ز ـ ٦٢٦ك)دا بۆ نارد.

بەمەیش توتمش بوو بە یەکەم پاشای هیند کە ئەوجۆرە پۆستەی وەرگرتبێت، لەوکاتەوە سولّتان توتمش چەند دراوێکی زیوی لێدا کە ناوی خەلیفەی عەبباسی لەپاڵ ناوی خۆیدا دەنەخشاند، ئەو کارە بەشتێکی نوێ دادەنرا لەسەر نیزامی دراو هیندی، جا فەرمانڕەوا موسڵمانەکان پێش ئەوە چەند دراوێکی بچووکی کانزاییان لەسەر شێوەی دراوی نیشتمانی لێدەدا کە چەند وێنەیەکی باوی هیندەکانن وەك گای سیفا.[1] لەسەردەنەخشێنرا، هەروەك ناوی فەتحوازان زۆربەی جار بەچەند پیتێکی هیندی دەنووسرا، جا توتمش بە یەکەم کەس دادەنرێت کە هینددا دراوی زیوی عەرەبی پوختی لێدا بێت.

سولّتان توتمش لەساڵی(١٢٣٦ز ـ ٦٣٤ك)دا کۆچی دوایی کرد و لێرەدا کەسایەتیەکی بەهێزی نەبوو دوای ئەو بۆ دەسەڵات شیاو بێت جگە لە کەسایەتی رەزیە تودینی کچی، ئەو ژنە سولّتانە پشکێکی زۆربەی زەیرکی هەبوو، هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بوو و شارەزایی لە باسی لە زۆربەی ڕێنماییە ئیسلامیەکاندا هەبوو، بۆیە باوکی فەزڵی ئەوی بەسەر کوڕەکانی تری خۆیدا دەدا چونکە ئەوان لە ئارەزوودا ڕۆچوو بوون، سولّتان بانگەوازی جێگیرایەتی بۆ ئەو کچەی کرد. کاتێك ئەو کچە دەسەڵاتی گرتە دەست توانایەکی گەورەو عەقلێکی دیاری نیشانداو مێژوو نووسانی هیند بەناوی(شاژنە دوران بلقیس جهان) واتە فیتنە جیهان لەناو دەبەن.[2]

ڕەزیەتودین نزیکەی چوار ساڵ لەسەر کورسی دەسەڵاتی دلهی مایەوە(٦٣٤ ـ ٦٣٨ك / ١٢٣٦ـ ١٢٤٠ز)ئەو کچە هەوڵی خۆی خستە گەڕ تا دیمەنی پیاوانە نشان

---

١ـ(سیفا)(Siva)ناوی خوای هیندەکانەو کاروباری وێرانی و کاولی دەدەنەوە پاڵ ئەو).

٢ـ( Biochef: Histoire Des Suitans Maiouks M Miouks vol. I. (p.٢٧٥.

بدات و بەرگی ئەوانی پۆشـی و لەبەردەم خەڵکدا بەبێ لەچك چوویە دەرەوە تـا لەسەر پشتی فیلەکەی سەرکردایەتی سوپاکەی بکات، لەگەڵ ئەو هەوڵە گەورانەی ئەو شاژنە لە کارگێری کاروباری دەوڵەتدا خستنەگەر بەڵام لەکۆتاییدا لەگەڵ ئەنجوومەنی سەرکردەکانی مەمالیك یان کۆمەڵی چلەکاندا پێکیدادا، ئەوانە قەڵەمڕەو و سەروەت و سامانیان خستبووە دەستی خۆیان ب تایبەتی لەدوای مردنی توتمش و ناوچەکەیان بە ئەرکەکانیشەوە لەنێوان خۆیاندا دابەش کرد بوو دوای ئەوەی هەموو ئازادەکانیان لە ئەرکە جیاجیاکاندا لەناوبردن.

ئەو مەمالیکانە دڵتەنگ بوون بە بینینی ئافرەتێك لەسەر کورسی دەسەڵات بەتایبەتی دوای ئەوەی پیاوێکی فارس لێی نزیکبوویەوە کە بەجەمالەدین یاقووت ناسرابوو و ئەرکی سەرکردەی سوارەکانی لەدەستدا بوو، ئەوانە شۆرشێکیان ئەنجامدا و شاژنە ڕەزیەتودین بە دلێریەوە هەولیدا سەرکوتی بکات بەڵام شکستی خواردو لە سیانزەی ئۆکتۆبەری ساڵی(١٢٤٠ن)کوژرا.[1] لەوکاتە دا مەغۆلەکان سەر لەنوێ لە هەرێمی سند دەرکەوتن و لەدیسەمبەری ساڵی(١٢٣١ن)دا دەستیانگرت بەسەر شاری لاهوردا و دانیشتوانەکەیان سەربڕی قراقوشی فەرمانڕەوای ڕایکرد بۆ دلهی ئیتر هەڵوێستە کەوای دەخواست کەسایەتیەکی بە هێزی دەربکەوت کە پێشڕەوی دەسەڵاتی بەدەستێکی ئاسنینەوە بگرێتە دەست ئەمەیش یارمەتی دەرکەوتنی ئەمیربلبان یان بلبنی یەکێك لە مەمالیکەکانی توتمش داو دوای ئەوەی لە دەسەڵاتی کوڕەکانی گەورەکەی لەناوبرد چوویە سەر کورسی دەسەڵات و نازناوی غیاثە دینی وەرگرت.

گێڕانەوەی هاوچەرخەکانی ئەوەیشی بۆ زیاد دەکەن کە بلبان لە بنەڕەتێکی هەڵکەوتە و خانەدانەوە دەرکەوێتەوە و کە فو کولی بۆ جیهادی دژ بە مەغۆڵ وای

---

١-(Wolseley Halg: Cambrldge History of IndiaIIIp.٦٠)(تێبێنی ئەوە دەکرێت هەڵویستی ئەو شاژنەبە تەواوەتی لە هەڵوێستی شاژنی شەجەرەتودور دەچێت کە دوای ئەو بە دەساڵ(١٢٥٠ن)فەرمانڕوەایی میسری کردو دەسەڵاتەکەی بوویە هۆی ناڕەزایی ڕای گشتی ئیسلامی و ئەویش بە کوشتنی کۆتایی پێهات (المقریزي: السلوك ج١ ص٣٦٨).

لێکرد هەر لە هەرزەکاریەوە ماڵ و کەسوکاری خۆی بەجێهێڵێت و لە تورکستان کۆچ بکات، پاشان وا ڕوویدا دزراو لە هیندستاندا فرۆشرا و سوڵتان توتمش کڕی، گێڕانەوەکە ئەویش زیاد دەکات کە ئەو سوڵتانە لەسەرەتادا لەبەر قەزەمی و بالاکورتی بلبان ئامادەنەبووە بیکڕێت، بلبانیش هاواری کردووە(یا خوند عالم)واتە(ئەی گەورەی جیهان)ئەو مەمالیکانەی تر بۆچی دەکڕێت؟ سوڵتانیش بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە(بۆ خۆشم کڕیوە)بلبانیش وەڵامی دایەوە: (دەی منیش بکڕی بۆ خوای گەورە)سوڵتانیش داواکەی قبوڵ کردو دواتر بەخێرایی لێهاتووە ئەو کەسە دەرکەوت و پلەی بە پلەی بەرزە دەبوویەوە تا تێکەڵ بوو بە کۆمەڵەی چل مەملووکەکان.[1]

بلبان بەکەسایەتیەکی سەربازی توندو یەکلای دادپەروەر ناوبانگی دەرکرد بوو و یەکەم کارێك گرنگی پێدا دانانی سنووری بوو بۆ سەرکەشی کۆمەڵی چل مەملووکەکان، ئەو سیاسەتی توندو تیژی و دووبەرەکی لە نێویاندا بەکارهێنای تا ئەوەی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی لەناوبردن، هەروەها دەستی تاوانبار و جەردەکانی بڕی کە دەرفەتی کۆتا بارگرژیەکانیان قۆستبوونەوە لە ڕێگەکانی نێوان دلهی و بەنغال(بەنگلادش)دا بڵاوبوونەوەو خراپە و وێرانییان دەنایەوە، بلبان ئەو دارستانانەی لادا کە بوو بوون بە پەناگەیەك بۆ ئەو چەتانەی و لە شوێنیاندا قەڵاو بورجی چاودێری دانا، بەمەستی ئاسایش ناوچەکەی گرتەوە و پەیوەندی نێوان دلهی و بەنغال تا ماوەیەکی دوورودرێژ گەڕایەوە.

هەروەها بلبان گرنگیدا بە دامەزراندنی کارگێڕیەك بۆ هەڵگری لە هەموو شارە جیاوازەکاندا کە چەند هەواڵگرێك لەلایەن خۆیەوە سەرنج ڕشتیان دەکرد بە هەڵگران یان نامە بەران ناسرابوون.

ئەو کەسانە لە ژێر چاودێری خودی سوڵتان و لەسەر بنەمای هەڵبژاردنی شەخستی سوڵتان دەستنیشان دەکران، ئەمەیش لەبەر گرنگی ئەو کارانەی لە

---

١ـ(ابن بطوطة: رحلة ابن بطوطة ج٢ ص٢٣).

هەموو بەشەکانی دەوڵەتدا پێی هەڵدەسان چونکە لە ڕێگەی پەیام و هەواڵەکانی ئەوانەوە سوڵتان ئاگای لە بارودۆخی هەموو شارێك و سیاسەتی کار بەدەستەکەی لەوێ دەبوو، بۆیە بلبان لەسەر ئەوە سوور بوو دەسەڵاتی والیە ناوچەییەکانی سەربەست بێت و ڕاستەوخۆ ملکەچی دەسەڵاتی خۆی بن، مێژوونووسان دەگێڕنەوە بلبان فرمانی لەسێدارەدانی یەکێك لەو هەواڵگرانەی دەرکردووە چونکە ڕووداوێکی گرنگی بۆ باسی نەکردووە کە لەو شارەدا ڕوویدا بوو کە ئەو ڕاسپێردرابوو هەواڵەکانی پێ بگەیەنێت بەبێ ئەوەی باکی لەو فرمانە هەبێت.[1]

لێهاتوویەکانی بلبان لەوەدا دەرکەوتن کە ساڵی (٦٧٨ك ـ ١٢٧٩ز)بەسەر هێزەکانی مەغۆلدا سەرکەوتن کە هەرێمی سندیان بڕی، بەمەش شیاوی نازناوی(ئەلق خان)واتە ئەمیری بەهێز بوو، سەرکەوتنەکانی بلبان بەسەر مەغۆلدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئامادەسازییە گەورانەی کە سولتان پێی هەستا بۆ ڕێگرتن مەترسیە کە چەند کۆگا و خەزێنەیەکی گەورە خۆراکی ئامادەکرد کە تیایدا بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەبێ خراپ بوون شبەکی کشتوکاڵی دەمانەوە، ئیبن بەتووتە لەو بارەیەوە دەڵێت: دەمبسی لە بڕێك لەو خەزێنانەدا دەهاتە دەرێ و ڕەنگی ڕەش بوو، بەڵام تامێکی خۆشی هەبوو، هەموو ئەمەیش لە خەزێنەی سوڵتان بلبان بوو بۆ ماوەی نەوەد ساڵ) ئەمە و سوڵتان بلبان گرنگی دابە بەهێزکردنی سەرسنووره هیندیەکان بەسەربازکردنی هۆزەکانی لەژێر سەرکردایەتی شێرخان سنقری ئامۆزایدا، هەروەك

---

١ ـ(Walseley Haig Dp. Cit. III p.٧٤ هەروەها (رحلة ابن بطوطة ج٢ ص٢ـ٣)کە ئیبن و بەتووتە باسی لە ڕنگی هەولگران دەکات بەتایبەتی ئەگەر کەسێکی بێگانە بهاتایەت بۆ هیند(ئەگەر هەواڵینیران هەواڵی کەسێکیان بناردایە بۆ سوڵتان کە بهاتایە. بۆ ناوچەکەی. پێیات دەوت کەسێك هاتووە کە سێوە و بەرگی وایە بەرگی هاوەڵ و سەربازی و خزمەتگوزار و ئاژەڵەکان و ڕەیکخستنی لەبزووتن و سەقگیربوون و هەڵسان و دانشتن و هەموو هەڵسووکەوتێکیدا بۆ دەنووسی و هێچیان بیرنەدەچوو)ئیبن و بەتوتە لە هەمان پارەوە(ص٩)ئەمەش بۆ زیاد دەکات: (لە شاری ملتان نامە بەرکە ناوی دەنان بوو سەرمەر قەندی بووە. والی ئەو شارە و ڕووداوەکانی و هەواڵی ئەو کەسانەی بۆ سوڵتان دەنووسی کە دەهاتنە ئەوێ هات بۆلامان).

هێزێکی بەهێزی خێرایی ئامادەکرد بۆ ڕێگری هەر هێرشێکی کتوپڕ کە مەغۆڵ لەناکاو دا پێی هەستان ـ ئەمەش لەسەر قسەی ئەو ـ تا شاری دلهی بەرەو ڕووی سەرەنجامی تاڵی بەغداد نەبێتەوە.[1]

بلبان موحەممەد خانی کوڕە گەورەی شەهیدی خۆی لە جەنگێکی دژ بە مەغۆل لە هەرێمی ملتاندا لە دەستدا، ئەمەش لە ٩ی ماسی ساڵی(١٢٨٥زـ ٦٨٤ك)دابوو. بلبان زۆر بەتوندی بۆی بە ئەستەم بوو پاش دوو ساڵ لە مەرگی کوڕەکەی خۆیشی مرد.[2]

سوڵتان بلبان بە یەکێك لەو کەسانە دادەنرێت کە دوای خۆیان جێگیری بەهێزیان بە جێنەهێنت، چونکە ڕا ڕاستی و توندبوونی نەیهێشت چەند کەسایەتیەکی بەهێز دوای خۆی دەرکەون، ئەو کۆمەڵی چل مەمالیکەکان لەناوبرد و لە خاوەن پایە و قەڵەمڕەوەکانی فەرمانڕەواو زانایانی دوور خستەوە(لەوانە ناوی ئەمیر خسرەوی شاعیری دێنێن). هەموو هیواکانی ئەو لەسەر کوڕە گەورەکەی بوون کە لەسەردەمی خۆیدا مرد، لەبەرئەمە لەدوای مردنی خۆی باروو دۆخی ناوچەکە شێواو دەفەرت بۆ دامەزراندنی بنەماڵەیەکی نوێ هاتە کایە کە ئەویش بنەماڵەی خالجییەبوو.[3] کە لەساڵی (١٢٩٠زـ ٦٨٩ك)و لەژێر سەرکردایەتی جەلالەدین فەیروز شاهدا دەستیگرت بەسەر کورسی دەسەڵاتی دلهیدا، بەمیش دەوڵەتی مەمالیکە تورکەکان لە هیندستاندا کۆتایی پێهات.

---

١ـ(Walseley haig dp. Cit. IIIp.٧٦).
٢ ـ(Walseley Haig Dp. cit.III. B٢).
٣ ـ(بنەماڵەیەکی ئەفغانین دەدرێنە پاڵ شاری خالج لە ئەفغانستان. دەلێن بنەماڵەیەکی بەبنەڕت تورکین پاشان بەرەو ئەفغانستان کشان و لوێ نەریت ڕیگەیان لە خەڵکەکەیەوە وەرگرت).

## * سەقلەبەکان لە ڕۆژئاوای ئیسلامیدا:

فراوانخوازی لە بەکارهێنانی مەمالیکەکان تەنها لەو دەوڵەتانەدا بەرتەسکنەبوویەوە لە بەشی ڕۆژهەلاتی دەوڵەتی عەبباسیدا بوون، بەڵکوو بەرەو هەموو وڵاتانی تری ئیسلامی چوو لەونێواندەشدا مەغریب ئەندەلوس، ئەگەر جۆرەکانی مەمالیکەتوورکان لەسەردەمی سەفاری و سامانی و غەزنەوی و غوریەکان لە ڕۆژهەلاتدا زیادی کردبوو، ئەوا ئومەویەکان لە ئەندەلوس جۆرێکی نوێی مەمالیکیان زیادکرد کە سەقلەبەکان بوون ئەو سەقلەبانەی ڕێگەی سەرەکییان لە ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیاوە بۆ ئیتالیاو فەرەنساو لەوێوە بۆ ئیسپانیای ئیسلامی یان ئەندەلوس لە ڕێگەی ڕووباری رون و قەتالونیا دەست پێدەکرد تا پجانە(Pechina)لەسەر کەناراوی ڕۆژهەلاتی ئیسپانی لە پاڵ مریەدا.

وشەی سەقلەب(Esclave)فەرەنسیەکی کۆنە و واتاکەی بەکۆیلە دێت، ئەم ناوە جوگرافینا سەرعەرەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا لەگەلەسلاڤیەکانیان بەگشتی دەنا، چونکە هەندێك لە جەرمانەکان کەوتبوونە بەکۆیلەگرتنی ئەو گەلە سلاڤیانە و فرۆشتنی پیاو و ئافرەتەکانیان بە عەرەبەکانی ئیسپانیا، بۆیە عەرەبەکان ناوی سەقلەبەکانیان لێنان، پاشان وشەکەیان بە بەرفراوانتر بەکارهێنا و لەو کۆیلانەیان دەناکە لە هەرگەلێکی مەسیحیەوە بیانهێنابنایە، ئیبن حەوقەلی گەشتیارکە لە سەردەمی چوارەمی کۆچیدا سەردانی ئیسپانیای کردووە باس لەوە دەکات سەقلەبەکان لە کەناراوی دەریای ڕەش و ەلە لماردیا و کلابریا لە ئیتالیایشەوەو لە قەتا لونیاو جلیقیە غالیسیا)لە باکووری ئیسپانیاوە دەهێنران، ئەمەش وا دیارە لەئەنجامی شالاوەکانی چەتە دەریاییە مەغریب و ئەندەلوسیەکان بۆ سەر کەناراوەکانی ئەورووپیەکانی دەریای سپی ناوەڕاست ڕوویدەدا.

زۆربەی سەقلەبەکان بە منداڵی هێنران بۆ ئەندەلوس و پەروەردەیەکی ئیسلامیانەکران ولەسەرکاروباری کۆشك وپاسەوانی و سوپا ڕادەهێنران و ژمارەیەکی زۆریان توانییان لە کۆمەڵگەی قورتوبیدا پایەیەکی باڵا داگیربکەن، ئیتر

ئەدیب و شاعیرو خاوەن کتێبخانەی گەورەکان تێدا پەیدابوو، هەروەك هەندێکیان توانییان بگەنە پایەکانی سەرکردایەتی لە دەوڵەتدا.

ئەمەو دیارە ئومەویەکان لە ئەندەلوس مەمالیکە سەقلەبەکانیان لە کارگێری و سوپا دا بەکاردەهێنا بۆ سنوور دانان بۆ قەڵەمڕەوی ئەرستۆکراتی عەرەبی لە دەسەڵاتداو لاوازکردنی دەستڕۆیی سەربازانی عەرەب و بەربەر، نمونەی ئەمەیش عەبدوڕەحمان ناسربوو(نەجدە)ی مەملووکی سەقلەبی خۆی کرد بە سەرکردەی هەڵمەتی ئاڕاستەکراوی دژی بە بەرامیروی دووەمی پاشای لێوە وهاوپەیمانەکانی لە شانیشینی نەبرە، ئەمە ئەو هەڵمەتەبوو کە شکستی موسڵمانەکان لە جەنگی شمنقە(Slmancas)لە ساڵی(٣٢٧ك ـ ٩٣٩ن). کۆتایی پێهات، دەڵێن هۆکاری ئەو شکستە گۆڕانی دەروونی عەرەکان بوو لەوەی سەقلەبەکانیان پێش ئەوان خست و سوێندیان خواردبوو لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگەکەدا سەقلەبەکان بە تەنها بەجێ بهێڵێن، ئەمەش بوو بەهۆی شکست و کوژرانی نەجدەی سەرکردەی سەقلەبی و ڕاکردنی عەبدوڕحمانی سێیەم بە کەمتر لە پەنجا سوارەوە دوای ئەوەی بەشێوەیەکی سەرسوڕمانەوە ڕزگاری بوو.

لە سەردەمی خەلیفەی حەکەم موستەنسیری کوڕی عەبدوڕەحمان سێیەمدا سەقلەبەکان ڕۆلێکی هاوشێوەی ڕۆڵی خۆیان لەسەردەمی باوکیدا لە ڕووی قەڵەمڕەو و گەورەییەوە ئەنجامدا. لەکاتی مردنیدا سەقلەبەکان وایان دەزانی گەورەی بارو هەڵوێستەکەن، ئیبن عوزارا باس لەوە دەکات سوپای قورتەتوبە زۆربەی لە سەقلەبەکان بوو و سەرکردایەتیەکەیشی لەدەستی دوو لەگەورە سەقلەبەکاندا بوو کە ئەوانیش فائیق و جوئزرحەکەمی(وەك دانەوە پاڵی ۆلای موستەنسیر)بوو. فائیق و جوئزر هەوڵیاندا هەواڵی مردنی حەکەمی دووەم بشارنەوە تا بەبێ بانگەوازی هیشامی جێگرەوەی دەسەڵاتی لابدەن چونکە منداڵێکی بچووك بوو، ئەوانە هەوڵیاندا گەنجێکی خاوەن سەردایەتی تەواو کاند بکەن کە ناوی موغیرە بوو و لەنەوەکانی عەبدوڕەحمانی سێیەم بوو، بەڵام ئەوان بینییان کەسانێك لەوەزیرەکان وەك جەعفەرموسحەفی و مەنسورە کوڕی ئەبو عامر لە

ڕوویاندا دەوەستن، مەنسوور توانی پیلانی تیرۆرکردنی موغیرەی کاندیدی حیزبی سەقلەبی دابڕێژێت، بەمەیش کەش و بارەکە بۆ هیشامی کوڕی حەکەم موستەنسیر چۆڵ بوو کە نازناوی هیشان موئەیدی بوو، دوای ئەو مەنسووری کوڕی ئەبوو عامر توانی ڕیزی ئەو سەقلەبانە لە کۆشکی خیلافەتدا و لە جیاتی سەقلەبەکاندا مەمالیکی تر دابنێت کە بەناوی مەمالێك یان گەنجانی عامریەوە ناسرابوون.

ئیبن بەسام لە کتێبەکەیدا(الذخيرة)باس لە یەکێك لەو گەنجانەدەکات و وەسفێکی جوانی دەکات و دەڵێت، (ئیبن ئەبوو عامر گەنجێکی هەبوو بە فانین ناو دەبراو هاو وێنەی لە زانستی قسەی عەرەب و هەرچیەك پەیوەست بەو ئەدەبە نەبوو، ساعیدی لوغەوی لە بەردەمیدا وەستاو مشتومریان کرد، ئەویش لەڕوویدا دوا و کەوتنە مشتومڕ تا بێنەنگی کرد، بەمە مەنسوور زیاتر سەرقاڵی بوو). ئیبن ئابا ر وا وەسفی دەکات کە یەکێك لە سەقلەبەکان کە ناوی حەبیبی سەقلەبی بوو لەسەردەمی خەلیفەی هێشام موئەید دا کتێبێکی داناو تیایدا دەمارگیری بۆ نەتەوەکەی خۆی هەبوو ناونیشانەکەی بریتی بوو لە(الأستظهار والمغالبة على من أنكر فضائل الصقالبة)بە داخەوە ئەو کتێبە فەتاوە، ئیبن بە سام لە کتێبەکەیدا(الذخيرة)باس لەوە دەکات ئەو کتێبەی دەستکەوتووە و کۆمەڵە شیعرێکی سەقلەبی و هەواڵ نایانیان لەخۆدەگرێت.

لەپاڵ ئەو ئیمتیازە ئەدەبیەدا سەقلەبەکان تایبەتمەندی چەند ڕەنگێکی ئاوازو سەمایان هەبوو کە دەدرایەوە پاڵ ئەوان دەڵێن ئاوازی سەقلەبی و سەمای سەقلەبەکان، مێژوونووسی هاوچەرخ ئەبوو بەکری تەرتووشی وەسفێکی جوانی ئەو سەمایەمان بۆ دەکات و باسی سەمای ئیسپانی لە ئەمرۆماندا دەکات و دەڵێت: (بۆ هەر ئاوازێکی ناوێکی داهێنراویان دەیانوت ئاوازی سەقلەبی، جا کاتێك ئەمە ئایەتەیان دەخوێندەوە(و إذا قيل إنّ و عد الله حق)لە هەر ئایەتەدا وەك سەمای سەقلەبەکان بە پێکانیان سەمایان دەکردو جەلاجیلیان تێدا بوو بە دەستەکانیان لەسەر ئیقاعی پێکانیایان چەپڵەیان لێدەدا و دەنگیان وەك چەپڵەی دەست و سەمای پێ دەر دەبڕی، هەموو ئەمانە لەسەر چەند ئاوازێکی هاوسەنگ بوون).[1]

---

١ـ(أبو بكر الطرطوشي: كتاب الحوادث و البدع ص٧٨(تونس ١٩٥٩)).

ئەم ئیمتیازە ئەدەبی هونەییە ڕێگری ئەوە نەبوو کە سەقلەبەکان لەکاتی ئەوەی خیلافەتی ئومەوی لە ئەندەلوس هەبوو ڕۆلێکی خراپ بەشێوەیەکی گشتی ببینن، ئەوان لەو پیلانانەدا بەشدارییانکرد کە لە قورتوبە و هەموو ناوچەکاندا سەریانهەڵدا، جا دەبینین هەندێك جار سەردەکەوتن و جاریش شکستیان دەخوارد،بەڵام ئەوان گیانی پێشڕەویو چاوچنۆکی و خۆشە پێنییان نیشان دەدا، فیران عامری سەرۆکی حیزی سەقلەبەکان لە قورتوبەی پایتەخت سەرکردایەتی دەکردن، لە مەحیزبەوە چەند دەوڵەتۆکەیەکی سەقلەبی لە ڕۆژهەڵاتی ئەندەلوس دامەزران لەتەرتوشەو ئەلمریە و مرسیە و دانیە و بلنسیە لە سەردەمی پاشایانی تاقمەکان لە سەدەی پێنجەمی کۆچی(١١ن)دا پەیوەندیەکی هاوپەیمانی ئەو دەوڵەتۆکانەی کۆ دەکردەوە و بە دەوڵەتی سەقلەبی عامری ناو دەبرا چونکە بەرپرسەکانی لە مەمالیکە عامریەکان بوون وا تە مەنسووری کوڕی ئەبوو عامرو کوڕەکانی. دەسەڵاتی ئەو سەقلەبانە بەسەر کەناراوی ڕۆژهەڵاتی ئەندەلوسیدا درێژبوویەوە کە لە ڕووباری ئەبرو لە باکوورەوە تا سەرسنووری مریە لە باشوورو جەزائیری شەرقی(بلیار) لە ڕۆژهەڵات درێژ دەبوویەوە.

لەناودارترین ئەو سەقلەبانە بەرپرسی شاری دانیە موجاهید عامری سەقلەبی بوو کە توانی دەستبگرێت بەسەر دوورگەکانی بلیار و دوورگەی سردانیە داکی کردی بەسەرە پردێك تا لە وێوە هێرش بکاتە سەر ئەو ناوچانەی بەدوایدا دێن کە کەناراوە ئیتالیەکانن ئەو توانی هێرش بکاتە سەر شاری لونی و کردی بە بنکەیەکی جەنگی بۆ هێرشبردنە سەر ناوچە کەناراویەکانی ئیتالیەکانی دەرووبەری، ئەو شارە دەکەوێتە نێوان بیزاو جەنەوە و تایبەتمەندی مەڵبەندی گرنگی بازرگانی خۆی هەیە لەو ناوچەیەدا، بەوجۆرە موجاهید عامری توانی دەستبگرێت بەسەر حەوزی دەریای سپی ناوەڕاستداو قەڵەمڕەوی ئەندەلوسیەکان لەو ناوچانەدا درێژ بکاتەوە.

سەقلەبەکان تەنها لە ئەندەلوسدا بەکارنەدەهاتن بەڵکوو گوازرایەوە بۆ مەغریبی ئیلامیش و لەوێ بەکارهێنانیان لە نێو پاشا و فەرمانڕەواکانیدا لە سەدەی

سێیەمەوە تا سەدەی پێنجەمی کۆچی بڵاوبوونەوە، ئەندەلوس بەهۆی دراوسێیەتیەوە مەڵبەندێکی گواستنەوەی ئەو کۆیلانە بوو بۆ دەوڵەتانی مەغریبی دوور بەشێوەیەکی تایبەت، لەکاتێکدا دوورگەی سقلیەی ئیسلامی مەڵبەندێك بوو بۆ بڵاوبوونەوەی لە دەوڵەتانی مەغریبی نزیکدا.

کاتێك بەکری باسی شانشینی نکوریان دەوڵەتی بەنی سالحمانی بۆ دەکات کە ناوچەی ریف لە باکووری مەغریبی دووردا دامەزرا.(١) ئاماژەبەوەدەکات کە ئەو دەوڵەتە پشتی بە مەمالیکە سەقلەبەکان بەستووە و هێندە زیادی کردون تا قەڵایەکی تایبەتی لەپاڵ نکوری پایتەختدا بۆ دروستکردون کە بە قەڵای سەقلەبەکان یان گوندی سەقلەبەکان ناسراوە، قەڵەمڕەوی ئەو سەقلەبانە لەسەردەمی مەلیك سالحی کوڕی سەعیدا تا ئاستێك زیادیکرد کە دوای مردنی ئەو لە ساڵی(٢٦٢ك ـ ٨٧٥ز)دا سەقلەبەکان هەوڵیاندا داواکانی خۆیان بەسەر سەعیدی کوڕی سالحی کوڕیدا بسەپێنن، بۆ یەك ڕۆژێك چوونەلای و داوای ئازاد بوونیان لێکرد، ئەویش پێی وتن: (ئێوە سەربازو کۆیلەی ئێمەن، ئێوە وەك ئازاد وان و ناچنە ناو مێراتەکان و دابەشکاری بەسەر ئێوەدا ناکرێت، ئیتر داوای ئازاد بوونتان لە چیە؟ (ئەوانیش زۆر لێیان دووبارەکردەوە، ئەویش ئامادەنەبوو- تا ئەوەی ویستێکی و توندی و تووڕەیی لی بەدیکردن، ئەوان عوبەیدوڵڵای برای و ڕەزای مامی کە کونیەی ئەبوو عەلی هەبوو پێشخستن و ئەو دوانەیان بەرەو کۆشك کشاندن، سەعیدش لە بەرزایی کۆشکەوە بە گەنج و ئافرەتەوە لەگەڵیاندا جەنگاتا شکستیان خواردو هەمووان لێیان هەستان و دەریانکردن بۆ گوندێك لەسەروو

---

١ ــ(نکور شاری مندرسە لە باکووری ڕۆژهەلاتی شانیشنی مەغریبی و لە ناوچەکانی سەرسنوری موزمەیەکە ئیسپان گۆڕییان بۆ و ئیماس پاشان موسڵمانان کردیانبە(حسیمە)ی ئێستا کە بە(سان خورخو)یش ناودەبرێت وملکەچی قەڵەمیڕەوی ئیسپانیە. شانیشینی بکورد دەڵەتێکی عەرەبی سوننی مالیکی بوو کە ڕۆلێکی گەورەی بینی لە بلاوکردنەوەی ئیسلام و زمانی عەرەبی لە نێوان بەربەری ریف لە غومارەی و سەنهاجە، هەروەك بەرەو ڕووی تەیاری خەواریج و شیعە بوویەوە و لە پشت ئەمەوە دوچاری نارەحەتیەکی گەورەبوو کە بەهۆیەوە ئومەویەکان پاڵپشتیان لە ئەندەلوس بۆی کەمیکرد، ئەو دەوڵەتە چەند سەردەمێکی دوورو درێژ ژیان تا خەوە مورابیتەکان لە ساڵی(٤٧٣ك)دا فەتحیانکرد وێرانیان کردو بنیادنە نرایەوە).

شارەکەوە کە بە گوندی سەقلەبەکان ناسرابوو، لەوێ حەوت ڕۆژ سەنگەریان گرت، دواتر سەعید پاش جەنگێکی قورسی بەسەریاندا سەرکەوت.[1] لە مەغریبی نزمیدا ئەغلەبەکانیش(١٨٤ـ ٢٩٦ك ـ ٨٠٠ـ ٩٠٩ز)پشتیان بەست بە سەقلەبەکان، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ساڵی(٢١٣ك ـ ٨٢٧ز)دا بەسەرکردایەتی قازی قەیرەوان ئەسەدی کوڕی فورات هێرشیان بردە سەر دوورگەی سقلیە، هەڵمەتەکان کەشتیگەلەکانی بەرەو کەناراوەکانی دالماسیا و بۆ کلابریا و لۆمباردیا لە باشووری ئیتاڵیا درێژبوویەوە.

وا دەرکەوێت دوورگەی سقلیە دوای ئەوە بووە بە وێستگەیەك بۆ دیلانەی لە وولاتەوە دەهاتن وەك ئەوەی ئیبن حەوقەل ئاماژە بە کۆبوونەوەی سەقلەبەکان لەوێدا دەکات و وەك شارێکی بنیادنراو لە دەوروبەری شاری بلرم (palermo)لەسەر کەناراوی باکووری دوورگەی سقلیە وەسفی دەکات.[2]

پێدەچێت گەورەترین بەڵگەی زۆری بەکارهێنانی سەقلەبەکان لە دەوڵەتی ئەغلەبیدا ئەوە بێت کە ئیبن خەتیب لە وەسفی کۆچی کۆتای پاشا ئەغلەبەکان زیادە تولڵاهی سێیەمدا بۆ میسر دەیگێڕێتەوە لەکاتی ڕووخانی دەوڵەکەی لەسەر وەسفی فاتیمیەکان کە دەڵێت(کەوت هەڵگرتنی ماڵ و سامان و بەرگی گرانبەها و تایبەتمەندکردنی جەوهەر و هەڵبژاردنی چەکدا... پاشان لەنێو کویلە سەقلەبەکانیدا هەزار خزمەتگوزاری هەڵبژارد و لەنێوەندی هەریەکەیاندا هەزار دیناری دانا).[3]

پاشان دەوڵەتی فاتیمی لەسەر پاشماوەی دەوڵەتی ئەغالیبەکان لە مەغریب دامەزراو کەشتیگەلەکانی و بنکە دەریاییەکانی مەغریب و لە دوورگەی سقلیەدا بەمیراتگرت، هەروەك لە وەرگرتنی مەمالیکە سەقلەبەکان و ئەوانیتریدا لەپاڵ پشت بەستن بە هێزی خەڵکی وڵات لە مەغرییبەکان لەسەر هەمان سیاسەت چوو لەسەر

١ـ(البكري: كتاب المغرب في ذكر بلاد إفريقية و المغرب ص٩٣ـ ٩٤).

٢ ـ(ميشيل أماري: المكتبة الصقلبية ص١٢٠).

٣ ـ(أبن الخطيب: الأعلام ـ القسم الثالث الخاص ـ بالمغرب ـ ص٤٣ نشر أحمد مختارو إبراهيم الكتاني (الدار البيضاء ١٩٦٤)).

ئەم بنەڕەتەیش هربرکی ڕۆژهەڵاتناس تشکوسلوڤاکی وا دەسەپێنێت کە جەوهەر سقلی سەرکردەی ناسراوی فاتیمی سەقلەبی بووە لە دیلەکانی کەنارەکانی دەلماسیا بووە و سەقلی نەبووە، بۆئەمەیش گێڕانەوەیەکی لیۆنی ئەفریقی(حەسەن وەزان)و چەند بەڵگە نامەیەکی لاتینی دێنێت.[1] ئەمە لە پاڵ ئەوەی سەقلیە لەوکاتەدا دوورگەیەکی ئیسلامی بوو و خەڵکەکەیشی ئەهلی زیمە بوون و ملکەچی کۆیلەیی نەبوون، هەرچەندە ئەگەر قسەکەی هربرك ڕاست بێت ـ ڕاستتر وایە جەوهەر لەسقلیە سەقامگیربووبێت ـ دوای دیلبوونی ـ ماوەیەك پێش چوونی بۆ مەغریب، بۆیە لەگەڵ ئەوەی خۆی سەقلەبیە دەدرێتەوە پاڵ سقلیە.

هەرچۆنێك بێت، ئەوەی گومانی تێدانیە ڕەگەزی سەقلەبی لە ڕیزی ڕەگەزی دیارەکانی مەملووکیدا یەکە دەوڵەتی فاتیمی پشتی پێ دەبەست.[2] ئایا لەماوەی بەرپابوونی لە مەغریبدا بێت وەك پێشتر وتمان یان دوای گواستنەوەی بۆ میسرو شام هەروەك لە بەشی دواتری تایبەت بە مەمالێکی میسردا دەدەکەوێت.

---

١ ـ(لەو تارێکدا کەپێشکەشی کرد(صقالبة الفاطمیین)الەساڵی١٩٦١لە کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی ریبان کە ئەو کات من لوێ مامۆستا بووە).

٢ـ(لە وێنەی گرنگیدانی فاتیمیەکان بە سەقلەبەکان ئەوەبوو کە دەگێڕنەوە خەلیفەی، و عیزلید ینیلاهی فاتیمی لە پاڵ چەند زمانێکی تردا بە باشی زمانی ئەوانیشی دەزانی و پێیان کاریگەربوو).

# بەشی دووەم

## مەمالیك لە میسر لە دەوڵەتی تۆڵۆنیەوە تا سەرەتای دەوڵەتی ئەییووبی ( ٢٤٥ـ ٥٦٤ك ـ ٨٦٨ـ ١١٩٣ز)

پێش ئەوەی مەمالیکەکانی دەوڵەتی خۆیان دابمەزرێنن بە ماوەیەکی دوورو درێژ میسر بە بەرفراوانی مەمالیکیان بەکارهێنا، پێدەچێت یەکەم کەس کە لەوەبەرپرسیاربێت خەلیفەی موعتەسەم بێت کە تەواو تامەزرۆی بەکارهێنای تورك بوو، کەندی دەگێڕێتەوە کە موعتەسەم نامەی بۆ والیە تورکیەکەی لەسەر میسر نووسی کە ناوی(کەیدەر)، یان (نەسری کوڕی عەبدڵڵا)بوو و فرمانی پێکرد تا عەرەبەکان لە دیوانی سوپا لاببات و بەخشش و مووچەیان تیایدا ببڕێت.[١] کاتێك کەیدەر ئەو کارەی کرد، یەحیای کوڕی وەزیری جەروی لەگەڵ کۆمەلێك لە لەخم و جوزامدا چوویە دەرێ و وتی: (ئەمە کارێکەکە لەوە باشترە نانوێنێن چونکە ئەو لە ماف پشکی خۆمان بێبەشی کردوین) بەوە نزیکەی پێنج سەد کەسی بۆ کۆبوویەوەو موزەفەری کوڕی کەیدەریش چوو بەرەو ڕوویان لەلای دەریاچەی(تەنیس)لەگەڵیاندا جەنگاو بڵاوەی پێ کردن دوای ئەوەی یەحیای کوڕی وەزیری بەدیلگیرا، لەوکاتەوە سەرباز و والیەکانی میسر لە مەمالیکە توورکەکان یان لەنەوە و کەسانی ئەوان بوون.[٢] هەروەك سەربازی و والی هەرێمەکانی تریشیان لێ دەرکەوت لەوانەیش ئەحمەدی کوڕی تۆڵۆن بوو.

---

١ ـ(الكندي: الولاة والقضاة ص١٩٣).

٢ـ(المقريزي: الخطط ج١ص١٥٢).

## مەمالیکەکانی دەوڵەتی تۆڵۆنی:

تۆڵۆن مەملووکێکی تورکی بووکە فەرمانڕاوەیی بوخارا(نوحی کوڕی ئەسەدی سامانی)کە لە مەڕووبوو لە ساڵی (٢٠٠ك ــ ٨١٥ز)دا لەڕیزی کۆمەڵێك کویلە و دیاریدا ناردی بۆ خەلیفەی مەئموون، تۆڵۆن لە ژیانی مەملووکەکانی ناو کۆمەڵگەی عەبباسیدا پلە پلە سەرکەوت تا بوو بە سەرۆکی پاسەوانی خەلیفە و توانی پەروەردەیەکی سەربازی ئیسلامی ئەحمەدی کوڕی بکات کە ئامادەسازیەك بوو بۆی تا لە ساڵی(٢٥٤ك ــ ٨٦٨ز)دا ببێت بە فەرمانڕەوای میسر.[1]

شتێکی ئاسایی بووتا ئیبن تۆڵۆن لەویلایەتەکەیدا پشت بەمەمالیکەکان ببەستێت کە هاورەگەزی خۆی بوون بەڵام ئەو نیازی جۆرە سەربەخۆییەکی لە میسر دا هەبوو، شێوەیەکی تایبەت گرنگی بە سوپادا.[2] ئەحمەدو فەرمارەوەیهی کوڕیشی دوای خۆی بە مەمالیکە توورکەکان قایل نەبوون، بەڵکوو لە سوپاکەیدا دەستەیەکی لە عەرەب ئازادەکان پێکهێنا، ئەمە وێرای چەند دەستەیەك لەکۆیلەی ڕەش و دەیلەم و ڕۆمەکان، مێژوو نووسانی عەرەب لەسەر گەورەیی ئەو سوپایە کۆکی تا ئەوەی ئەحمەدی کوڕی تۆڵۆن ناچار بوو چەند نیشنگەیەکیان بۆ بنیاد بنێت بە قەتائیع (پارچە زەویەکان)ناسراوە و ناوچەی تایبەتی نیشتەجێبوونی هەریەکەیان بوون، گێڕانەوەی عەرەبیەکان ژمارەیەکی گەورەی وا بۆ ئەو سوپایە دادەنێن کە زۆر لە ڕاستی دوور نیە، جا مقریزی لە کتێبەکەیدا(الخطط)باس لەوە دەکات ئیبن و تۆڵۆن هیندی مەمالێکی توورکی کڕی تا جگەیشتە بیست و چوار

---

١ ـ (لەڕاستیدا هەندێك والی میسرو ناوچەکانی تریش لەو قۆناغە تورکیەی مێژووی ئیسلامیدا عەرەب بوو وەك عەنبەسەی کوڕی ئیسحاق کە کۆتایی عەرەب بوو لەساڵی(٢٤٢ك ـ ٨٥٦ز)لەسەردەمی خەلیفە متەوەکیلدا والی میسر بێت، دوای ئەوەی میسر بوو بە هەرێمێك بۆ دەستەیەکی والیە تورکەکان کە زۆربەی جار بەبێ ئەوەی بۆی بچن یەك لە دوای یەك دەهاتنە سەر دەلاسەت، لەو هەندە جاریش هاتنی ئەحمەدی کوڕی تۆڵۆن بوو تالە جیاتی بایکیاك بێت بەوالی میسر، بڕوانە: (الكندي: ص٢٠٢، البلوي: سيرة أحمد بن تولون ٣٣ـ ٤٣).

٢ ـ (Zaki Hasan: Les Tulunides P.١٦٥).

هـەزار مـەملووك، لـەکڕینی کۆیلـەی زەنجیـشدا گەیـشتە چـل هـەزار، لـەبارەی عەرەبیشەوە تا حەوت هـەزار ئـازادی بـەکرێگیراو چـوو.[1] ئـیبن ویئـاس لـە ئـیبن و واسف شاهەوە وەردەگرێت و دەڵێت مەمالیکە دەیلەمیەکانی ئیبن تۆلـۆن بەتـەنها گەیشتە بیست و چوار هەزرا مەملووك.[2]

بـەڵام پێویـستە ڕوون بێـت کـە زۆرێـك لەوانـەی بـە کۆیلـەیی چـوونە نـاو تۆلۆنیەکانەوە دواتر ئازادبوون ئەمەیش لەسەر ئاستی سەربازی سـەرکردەکان یـەك شێوەیە، چونکە دیارە ئیبن و تۆلۆن ژمارەیەکی زۆری لەسەربازەکانی ئازاد کرد تـا سوپایەکی نایابیان لێ پێك بهێنێـت، بۆیـە ڕاسـتتر ئەوەیـە لـەکۆتا ڕۆژەکـانی ئـیبن تۆلۆنـدا مـەملووکێکی زۆر لـە سـوپای تۆلۆنیـدا مـاو چـالاکی ئـازادکردن لـە ڕۆژانـی بنەماڵەکەی ئەو دا بەردەوام وەك یاسا و بنەمایەك پەیڕەودەکرا.[3]

مەمالیکی ئەخشیدیەکان: دەوڵەتی ئەخشیدی لە هێنانی مەمالیکـە توورکەکانـدا لەسەر نەریتی تۆلۆنیەکان چوون تا ئەوەی دەڵێن مەمالیکـەکان موحمـەد ئەخـشید گەیشتوونەتە هەشت هەزار مەملووك.[4]

سـوپای ئەخـشیدی ژمارەیـەکی زۆری کۆیلـە ڕەشەکانیـشی لـەخۆگرتووە بـەو بەڵگەی یەکێکیان کە کافوور بوو شوێنی ئەخشیی فەرمانڕەوایی میسردا گرتەوە.

پاشـان بەدامەزرانـدنی دەوڵـەتی فـاتیمی: ئەگـەر لەسـەردەمی تۆلـۆنی و ئەخشیدیەکاندا جۆرەکانی مەمالیك زۆر بوون، ئەوا فاتیمیەکان لەمیسر ڕەگـەزێکی نوێیان زیاکرد و لە مەغریبەوە هێنایان کە سـەقلەبەکان بـوون، وا دیـارە خیلافـەتی فاتیمی هەر لـە هـاتنی مـوعیزی یەکـەم خەلیفـە یـان لـە میـسر مـەمالیکی تـورك و سەقلەبەکانی زیاد کرد بە بەڵگەی ئەوەی عەزیزی خەلیفـەی دووەم ڕۆژێك لەوانـەی بۆ پایە جێمتمانـەکان و سـەرکردایەتی ویلایـەت هەڵبـژارد، چـونکە گەشـتنیان بـەو

---

١ـ(المقريزي: الخطط ج١ ص١٥٢).

٢ـ(أبن إياس: بدائع الزهور ح١ ص٣٧ دەیلەمەیـەش شـاخاوی لی جیلانـی بـاکووری دەریـای قەزوینە).

٣ـ(Zaki Hasan: Les Tulunides P.١٦٥).

٤ـ(أبو المحاسن ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة في محاسن ملوك مصرو القاهرة ج٣ ص٢٥٦).

پایانە واتای ئەوەیە بە عەیزی هێزێکی نێو دەوڵەتی پێداوە کە پایە باڵاکانیان بوو بوون بەچەند ئامانجێکی شەرعی، ئەو سەرکردایەتی سوپای دایە دەست بنجوتکینی تورکی مەملووکی، هەروەك کردی بە والی شام، عەککایش دایە دەست دنیای سەقلەبی و تەربەریی دایە دەست بەشارەی ئەخشیدی و غەززەی دایە دەست رباحای سەیفی و میرایەتی کۆشکی دایە دەست برجوانی سەقلەبی، گەورەترین بەڵگەیش بۆ ئەوەی فاتیمیەکان مەمالیکی زۆریان بەکارهێناوە ئەوەیە شەقامێکی فاتیمیی لە قاهرەی بەناونانەوە ناوناوە کە ئەوەیش ئەو شەقامەیە لە نێوان ناوچەی زەویلەو خان ئەبوو تاقیەیە، ئەمەی کە فاتیمیەکان و تورك و سەقلەبەکانیان بەبەرز ڕادەگرتن بوو بەهۆی ئەوەی حەسوودی و خەباتی نێوان ئەوان نێوان مەغریبیەکان سەر هەڵبدات، ئەمەیش بەڕوونی لەسەردەمی خەلیفەی حاکم بینەمریللاهندا(٣٨٦ــ ٤١١ك / ٩٩٦ــ ١٠٣٠ن)دەرکەوێت کە کۆیلەی ڕەش(سودان)ی زۆری هێنا تا سنووری بۆ قەڵەمڕەوی هەردوولا دابنێن پاشان جارێکیتر لەسەردەمی خەلیفەی زاهیری کوڕی حاکمدا قەڵەمڕەوی توورکەکان بەهێزبوویەوە لەبەرئەوەی خواستی بەلای تورك و ڕۆژهەلاتیەکاندا دەچوو، بەمەیش سەرکردایەتی سوپا کەوتە دەست ئەبوو مەنسوور ئەنووشتکین کە مەملوکێکی بە بنەڕەت تورکی بوو وبە دوزبەری ناسراو بوو.[1] دواتر زاهیر لەساڵی (٤١٩ك ـ ١٠٢٨ن)دا دیمەشقی دایە دەست، پاشای خەلیفەی موستەنسیری فاتیمی هات و خواستی بەلای ڕەگەزی کۆیلەی یوشدا هەبوو زۆری لێ کڕین، چونکە دایکی کەنیزەکێکی رەش بوو، ئەو ڕەگەزە تا کۆتایی سەردەمی دەوڵەتی فاتیمی سەرچاوەی هێزی ناو دەوڵەتی بوو.

بەڵگەی تریش بۆ سەلماندنی زۆر بوونی مەمالیکە تورك و سەقلەب و ڕەشەکانی لە دەوڵەتی فاتیمیدا گرنگیدانی(ثقة الأمام علم الأسلام)ی بەنانگخواز بوو بەوان لە کۆڕێکیدا کە لە ئەنجومەنەکانی حیکمەتدا پێشکەشی کرد و بەتایبەتی بە

---

١ــ(دەدرێتەوە پاڵ سەرکردەیەکی دەیلەمی کە بە تزبری کوڕی ئەرینم ناو دەبرا کە ساڵی(٤٠٠ك)لە دیمەشق کرێ، (أبو المحاسن: النجوم الزاهرة ج٤ ص٢٥٢).

دەبرنێنێکی دوورو درێژ لەناو کۆڕکەیدا باسی کردن، دەقی دەبرینەکەیش ئەمەیە: (کۆتاییمان پێهێنا و باسی سونتەکانی ئاینیمان نەکرد و سەبارەت بە فرمانکردنی بە نەرمونیانی لەگەڵ ئەو مەمالیکانەدا کە خوای گەورە رایسپاردون تا خزمەتی ئێوە بکەن و بەهۆیانەوە ئێوە دەپارێزێت، چونکە ئەوانە کەسانێکی کە لەبەرد دانە تاشراوی و لە دار دروست نەکراون، جا مەملووك حەوت خەسڵەتی بەسەر خاوەنەکەیەوە هەیە بەوەی نان و ئاوو خۆراکی پۆشاکی بۆ دابێن بکات و لە توانی خۆی زیاتر بەسەرنەدات و زیاتر لە توانی خۆی کاری پێ نەکات و جگە لەبەر تەمێکردن لێی نەدات و دەستدرێژی لە ڕووی نەنوێنێت نارەوای لەسەر دانەنێت و ڕێی لێنەگرێت لەوەی لەکاتی خۆیدا نوێژ بکات، مەملوکیشی دەبێت دوانزە خەسڵتی بۆ خاوەنەکەی هەبێت کە بریتین لەوەی: بڕەوای بە ئامۆژگاری هەبێت و نەرمی سۆزی بۆ بنوێنێت و ماڵو سامانی بپارێزێت و شەرەف و سنورەکانی بپارێزێت و سپاردەی بۆ بەجێ بگەیەنێت و ناپاکی لەڕووی دانەنوێنی و خۆی لێ حەشارنەدات خەرجی لە ماڵو سامانیدا نەکات، خوادە دەفەرموێت(و ضرب الله مثلا.... يستوون).[1] فاتیمیەکان گرنگییان دەدا بە پەروەردەکردنی مەمالیك بچووکەکانیان، لەڕاستیدا ئەوان یەکەم کەس بوون کە نیزامێکی پەروەردەییان بۆ مەمالیك لە میسردا دانا، وا باوو ئەو دیلانە دەبران بۆ شوێنێك کە پێی دەوترا(مەناخ).[2] (بەرەی ئیسماعیلیە یە لە قاهیرەی ئەمڕۆ)بەمەیش پیاوەکانی دەبران بۆلای دیلەکانی پیشوو و ژن و منداڵەکانیش دەبران بۆ کۆشکی خەلیفەی دوای ئەوەی وەزیر دەستەیەکی لێ وەردەگرتن ئەوانی تریش دەبران بۆ خزمەتگوزاری ماڵ و خانەکان، پاشان دیلە منداڵەکان دەبران بۆلای مامۆستایان و

---

١ـ(المجالس الستنصرية، المجلس الثاني و العشرون ص١٠١ ـ ١٠٢، نشرو تحقيق الدكتور كامل حسين ـ سلسلة المخطوطات الفاطمية).

٢ـ(مەناخ ئەو شوێنەیە کە وشتر تیایدا چۆك دادە، فاتیمیەکان ئەو ناوەیان لە چەند نانەواو کۆگایەکی مەدەنی و سەربازی سەربە دەوڵەتی نا، زۆربەی پشەسازان لەو شوێناندا لە دیلەوە فرەنجەکان بوون و لەوێ سەر قاڵی چاندن بوون. (المقريزي الخطط ج١ ص٤٤٤)).

ئەوانیش فێری نووسین تیر هاوێژیان دەکردن پێیـان دەوتـن (الترابـی)هەنـدی جـار ئەو منداڵانە بۆ پلە وپایەی میرو سەرکردەکان بەرز دەبوونەوە.

ئەو تاقمانەی لەرۆژانی دەوڵەتی ئەییووبی و دەوڵەتی مەمالیکدا هەبوون، تێبینـی ئـەوە دەکرێـت بنـەڕەتی ئەوانـە زیـاتر لەشـێوەی بنـەڕەتی کۆمـەڵێك لـە ئیسکیشاریەکانی.[1] ناو دەوڵەتی عوسمانی دەچێت، بەڵام تورابی لـە ڕووداوەکـانی دەوڵەتی فاتیمی و ئەییووبی و مەمالیکەکان لە میسردا ئەو ڕۆڵە دیارەی نەبینی کـە ئینکیشاریە لەدەوڵەتی عوسمانی بینی، چونکە وەکو ئینکشاری تایبەتمەندی ژیانی جەنگی مەیدانەکانی جەنگ نەبوو، بـەڵکوو دەسـتەیەك بـوو لـە دەوری کۆشـکدا کـە خزمەتکاری کۆشکیان تێدابوو.

لێـرەدا نیزامێکـی تـری پـەروەردەیی هەیـە کـە فاتیمیـەکاان بـۆ پـەروەردەی کۆیلەکان دایان نـابوو، ئـەو کۆیلانـە بـە منـداڵانی بـەردین ناسـرابوون و دەسـتەیەك بوون لەو گەنجانەی ئەو ناوەیان لێنرا لەبەرئەوەی لە چەند شوێنێکدا دەژیان کە بە بـەرد ناسـرابوون لـە پـاش کۆشـکی خەلیفـە دابـوون لـە قـاهیرەدا، لـە دائـیرەی تولمەعاریفی ئیـسلامیدا وا باسـی ئـەو دەسـتە و کۆمەڵـەکراوە کـە دەسـتەیەکن لـە مەمالیکەکان و ئەفزەل و شاهەنشاهی.[2] وەزیری خەلیفەی موستە علی ٤٨٧کۆچی

---

١ـ(ئیسکیشاری وشەیەکە ئەورووپیەکان بەکاریان دەهێنا لەێنی تشری لە زمانی تورکیدا واتە دەسـتەی نـوێ. سـەربازانی ئـەو دەسـتانەی منـداڵانێکیان لـە ڕەگـەزی مەسـیحیەکانی ژێـر دەسەڵاتی عوسمانی(بـاجی خـوێن)وەردەگرت و دواتـر پەروەردەیەکی سـەربازی ئیـسلامییان دەکردن. ئەمەیش لە چەند خوێندنگەیەکی تایبەتدابوو. بەمـەیش لەگـەڵ ئـەوەی وەك کویلـەی سوڵتان دەمانەوەی دەبوون بە هاوەڵاتی موسڵمان. ئەم دەستەیە لە پیادەکان ئەژمارد دەکران و لە نوێگەرانییەکانی جەنگی ئەو سەردەمە بوون لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا. فەزلی دامەزراندیشی بۆ سوڵتان ئورخانی یەکەم دەگەڕێتەوە لە ساڵی(٧٢٦ك ـ ١٣٣٦ن)دا.

٢ـ(وەزیری ئەفزەلی کوڕی ئەمیرو لجیـوش بەدرولجەمالیەوەکـە لـە بنەڕەتـدا ئەمـەرنی بـوو، بایوکیان مەملووکی ئەمەرنی جەمالودەوی کوڕی عەممار بـوو و بـە جـەمالی ناسـرابوو، پاشـان بەرەبەرە پلەی بەرزدەبوویەوە تا بوو بە فەرمانڕەوای شام. خەلیفەی فـاتیمی موستەنسیر بـۆ لە ناوبردنی ئاژاوەی دەستەکانی سەربتزان لە میسر پەنای برد. بەمەیش ڕەگەزێکی تـری نـوێ

وەك دەستەیەکی سەربازی لەژێر سەرکردایەتی ئەمیرێکدا پێکهێنا کە نازناوی(موفق)ی وەردەگرت تا ببێتە پاسەوانی، ژمارەی ئەم دەستەیە گەیشتە سێ هەزار مەملووك.[١] بەلآم ئەو سەرچاوەی کە دائیرەی تولمەعاریفی ئیسلامی ئەو وەسفەی لێ وەرگرتووە دەڵێت(بەردینەکان لە منداڵانی سەربازان هەڵدەبژێردران).[٢] ئەگەر مشتومڕەکەمان گەیاندە ئەوەی ئەو سەربازانەی مەمالیکە تورك و سەقلەبەکان یان جگە لەوان کە سوپای دەوڵەتی فاتیمییان پڕکرد بوویەوە، ئەوا ناکرێت ئەو نازناوە بەسەر منداڵەکانیان بچەسپێنن، ئەوانە ڕۆژێك لە ڕۆژان مەمالیك نەبوون، چونکە مەملووك لە چەمکی ڕەسمییدا هەر دەبێت کۆیلایەتی لەخۆگرتبێت واتە دەستی کۆیلە فرۆشتن بینبێت، پێدەچێت دائیرەی تولمە عاریفی ئیسلامی لەوەسفکردنی بەردینەی فاتیمیەکاندا بە پێکهێنانی دەستەی کۆیلەی بەردینەکان کاریگەری بووبێت کە خەلیفەی موعتەزیدی عەبباسی لە بەغداد بەکارهێنان(٢٧٩ـ ٢٨٩ك/ ٩٨٢ـ ٩٠١ن)ئەوا خودی ئەوانە لە مەملیکانە بوون کە خەلیفە لە نێوئەمەمالیکانەدا تردا هەڵیبژاردن و کە بە سوارچاکی تێرهاوێژیدا لێهاتووبوون و لەژێر چاودێری خزمەتکاری و مامۆستاکاندا لەناوچەی بەردیندا نیشتەجێبوون.[٣]

هەرچۆنێك بێت لەوەی پێشەوە ڕوون دەبێتەوە دەوڵەتی فاتیمیو مەمالیکەکان لەشێوەو و ڕەنگەجیاوازەکانیان بەکار دەهێنا و ژمارەیەکیان توانییان بگەنە پایەکانی والیەتی و سەرکردایەتی.

---

بۆ ناوسوپا و دەوڵەتی زیاد کردنی کە ئەویش ڕەگەزی ئەرمینی بوو. ئەفزەل لە پایەی وەزارەتدا شوێنی بەدرو لجەمالی باوکی خۆی گرتەوە.

١ـ(Ency of Islam art. Huggrah).

٢ـ(المقریزی: الخطط ج١ ص٣٨١) (المقریزی: الخطط ج١ ص٤٤٣).

٣ـ(متز: الحضارة الأسلامية في القرن الرابع الهجری، ترجمة د. أبو ريده ص٢٤٢)).

## *مەمالیکەکانی سەلجووقی و دامەزراندنی دەوڵەتی ئەییوبی:

پاشان بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئەییوبی لەسەردەستی ناسر سەلاحەدینی ئەییووبی لە ساڵی(٥٦٧ك - ١١٧١ن)دا دەوڵەتی فاتیمی کۆتایی پێهات، وەك دەزانین دەوڵەتی ئەییوبی بە بنەڕەت کوردیە، بەڵام لە ڕێگەی دەوڵەی سەلجووقی تورکی مەملووکەکانیەوە هات و زۆرێك لە نەریت و ڕەیکخستنەوەی تورکیە ڕۆژهەڵاتیەکانی لێوەوەرگرت و لەمیسر و شامدا بۆ یەکەمجار جێبەجێی کرد، بۆیە ناکرێت بەچاکی لە مێژووی دەوڵەتی ئەییووبی بگەین ئەگەر لەسەر ڕووناکی لێکۆڵینەوەی لە مێژوو سەلجووقیەکان و ڕیکخستنە سەربازیەکانیان نەبێت.

دەوڵەتی سەلجووقی هەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە پشتی بە مەمالیکە توورکەکان بەست و ئەوانیش سیاسەت و نیازەکانیانی ئەویان بە میرات گرت، یاسای گشتی ناسراوی سەلجووقیەکان لە ڕووناکی مێژوویانە وە ئەوەیە کە بڕوایان وابوو فارس و عەرەبی ناتوانن لە خزمەتی تورکە گەورەکانیاندا دڵسۆزبن و چاکتروایە پشت بە وەفای ئەو مەمالیکە تورکانە ببەسترێت کە لە کۆشك و لە نزیك سوڵتان و سەرکردەی سەلجووقیەکاندا پەروەردە دەبوون و پێگەیشتن، ئەو مەمالیکانە لە تەمەنی بچووکیانەوە لە وڵاتی قفجاقەوە.[1] دەهێنران و دواتر لەسەر نیزانی پەروەردەیی مەملووکی سامانی پەروەردە دەکران، ئەو نیزامەی کە وەزیر نیزامو لمولکی تووشی وەزیری سەلجووقیەکان لە کتیبەکەیدا (سیاسەت نامە) وەکو ڕێنموونی بۆ فەرمانڕەوا سەلجووقی یەکان وەسفی دەکات.[2]

نیزاملمولك لەم بارەیەوە ئەمەیش دەڵێت: پێویستە ئەرکی سەرشانی ئەو مەمالیکانە سەخت نەکرێت کە خزمەت دەکەن مەگەر لەکاتی پێویستدا نەبێت،

---

١ـ(وەڵاتی قەفجاق یان قبجاق یان قبشان هەرێێکە لە حەوزی ڕووباری فولجا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ڕوسیا و باکووری دەریا ڕەش و قەوقازی و خەڵکەکەی تورك بوون. ئەوانەی خەڵکی کۆچ ڕەووبوون لەسەر نەریتی خیڵەکی و لەژینکی سەختدا بوون و وڵایەتەکەیان دەرفەتێکی گەورەی بازرگانی کوێلەی تورك بوون.(القلقشندي: صبح الأعشي ج٤ ص٤٥٨)).

٢ـ(بڕوانە ئەوەی کە لە بەشی یەکەم لەم بارەیەوە ووتمان).

ناشبێت جیێ ئەوە بن لە هەموو لایەکەوە، بکرێنە ئامانج پێویست فێربن چۆن بەخێرایی کۆببنەوە وەك چۆن بەخێرایی بڵاودەبنەوە ئەگەر یەکێکیان فرمانی بەسەردا بدرێت، هەروەها پێویستە جارێکی تر پێیان بوترێت چۆن پێویستە شتێك هەبێت تا ڕێگەی بۆ بگرنەبەر، پێویست بەوە ناکات زۆری بکرێت تا هەموو ڕۆژێك ڕاستەوخۆ فرمانی خزمەتکاری بە خزمەتکاران بکرێت وەك کەسانی ئاو گێڕو چەکدار و هاوشێوەی ئەوانە، یان کامەیان لە خزمەتی گەورەی پەردە داران و گەورەی سەرکردەکاندا بێت.

بەڵکوو پێویستە فرمانیان پێ بکرێت هەموو ڕۆژێك لەهەموو بینایەکدا ژمارەیەکی دیاریکراوو لە تایبەتمەندابیش ژمارەیەکی دیارکراوە خزمەت بکەن تا سەختی و نارەحەتی تێدانەبێت.[1] عیمادینی ئەسفەهانی.[2] کە لەسەردەمی مەلیك عادل نوردەین زەنگی لە دیمەشقدا دەژیا وێنەی مەمالیکە سەلجووقیەکان لە دەبرێنێکی پوختدا تەواو دەکات و دەڵێت: (سوڵتان چەندا مەمالیکێکی بچووکی وەك مانگی هەبوو لە تایبەتمەندەکانیان چەند چاودێرێکیان هەبوو و چەند نەقیبێکیش لەسەر دەستە هاوڕەگەزەکانی خۆیان هەبوون).[3] نیزامولمولك لە هەمووان زیاتر پەیوەستی ئەوە بوو کە لە کتێبەدەیدا هاتووە، ئەگەر سوپایەکی زۆری مەمالیکەکانی دەورو خولی بدایە بەهۆی ناوی ئەوەوە بە مەمالیکی نیزامی ناو دەبران، ئەویش بەهۆی ئەوانەوە تا ئاستێکی زۆر قەڵەمڕەوی خۆی زیاد دەکرد.[4] تا ئەوەی جارێکیان سوڵتان مەلیکشان نامەیەکی بۆ نووسی وتیایدا دەیوت: (تۆ دەستت گرت بەسەر ماڵولکمدا و ناوچەکانت بەسەر کورو خزم و زاواو

---

١ـ(Schefer: Siaset Nameh Parnizamel Mulk P.١٢٨).

٢ـ(لە ئەسفەهان لە ساڵی ٥١٩ك لە دایك بووە هاتووە بۆ بەغدادو بووە بە والی واسط و بەسرە و دواتر گواستویتەوە بۆ دیمەشق تا ڕۆژانی مەلیك نورەدینی زەنگی سوڵتانی ئەوێ. ئەمیر نەجمەدین ئەییوب و سەلاحەدینی کوڕی ناسیوە. لە ساڵی ٥٩٧ك لە دیمەشق کۆچی دوای کردووە).

٣ـ (الأسفهاني: دولة آل سلجوق ص١١٣).

٤ـ(أبو شامه: كتاب الروضتين في أخبار الدولتين ج١ ص٢٦).

مەمالیکەکانتدا دابەشکرد وەك ئەوەی شەڕێکی دەڵاسەت بێت، ئایا دەوێت فرمان بکەم دەبێت و پێنووسی وەزارەت لەبەر دەستتدا لابرێت؟)نیزامو لمولکی وەزیریش وەڵامی دایەوە: (وا دیارە ئەمڕۆ زانیوتە من هاوبەشم و دەوڵەتدا هاوپشکتم، بزانە مەرەکە من لەپاڵ تاجەکەی تۆدایە کەی ئەم بەرزەکەی بکەێنەوە ئەویش بەرزدەبێتەوە و کەی دایببڕێت ئەویش دادەڕنرێت)وەك ئەوەی قسەیەکی کردبێت کە قەدەر پێشتر وتبێتی، جا یەك مانگی لەنێوان کوژرانی وەزیری نیزامولمولك(٤٨٥ك)وە مەرگی سولتان دا هەبوو.[1] قەڵەمڕەوی مەمالیکی نیزامی دوای مردنی سولتان مەلیکشاه هێندە زیادی کرد تا گەیشتە پلەیەکی توانییان مەحموودی کوڕی لاببەت برکیار و کوڕەکەی تری دابنێن.[2]

دەڵێن: نیزامولمولك یەکەم کەس بوو پارچە پارچە زەوی بۆ مەمالیکەکانی بڕیەوە، جا دوای ئەوەی ڕاستەوخۆ بە دراو مووچەی سەربازی دەدرا ئەو پارچە زەویە پێدەدا.[3] چونکە زەوی بەکەسەکانیان دەدات زامنی کردنەوەی بوو کەسەکانی گرنگییان پێدەدات، ئەمەیش هێزو سامانی بۆ دەوڵەتی سەلجوقیەکان دەپاراست، بۆیە سولتانە سەلجووقیەکان لەسەر ئەو نیزامە چوون و قەڵا و شار و ویلایەتیان وەك ئیقتاع بەسەرکردە مەمالیکەکانیان دەدا کە بە ئەتابەگەکان ناودەبران، ئەمەیش لەبەرامبەر ئەو خزمەت سەربازیانەی لەکاتی جەنگدا بەجێی دەگەیاندن، ئەتابەگ زاراوەیەکی تورکیە و بەواتای (باوکی سەرکردە)دێت.[4] واتاکەی پەروەردەکەری کوڕی سولتانە، پاشان بوو بە نازناوێکی ڕێزلێنان کە بەگەورە سەرکردەکان دەدرا و بە واتای سەرکردەی سوپایان باوکی سوپاو جێگری دەسەڵات دەهات.[5] وەزیری نیزامی لمولك یەکەم بوو نازناوی ئەتابەگی وەرگرت و سولتان مەلیکشاه پێی بەخشیی.[6]

---

١ـ(صدردين المس: أخبار الدولة السلجوقية، نشر محمد إقبال بجامعة البنجاب. ص٦٩).

٢ـ(الأصفهاني: دولة آل سلجوق: ص٧٦).

٣ـ(صدرالدين أبو الحس: ص٦٨، الأصفهاني: ص٥٥).

٤ـ(القلقشندى: صبح الأعشى ج٤ ص١٨، كرد علي: خطط الشام ج١ص١١٧).

٥ـ(Ency Of Islam Art Ataleg).

٦ـ (القلقشندي: صبح الأعشى ج٤ص١٨).

لەسەر ئەم بنەمایە زۆربەی زەویەکانی فارس و جەزیرە و شام بۆ چەند ئیتقتاعێکی سەربازی دابەشبوون کە مەمالیکە سەلجووقیەکان پێسپاردنی سوڵتان فەرمانڕەواییان دەکرد، ئەوانە لە بەشە جیاوازەکاندا ویلایەتەکاندا چەند سوپایەکیان بۆخۆیان دروستدەکرد، تا لەکاتی پێویستی ئامادەبوونیان بۆ خزمەتی ناو جەنگ دەهات والی سەلجووقی بە مەمالیك و چەك و پێویستیەکانیەوە بۆ دەهات تا لە جەنگەکەدا بەشداری بکات، ئەو ڕێگە بۆ بانگکردنی ئەو دەستە سەربازیانە دەگیرایەبەر ئەوەی بوو چەند نیشانەیەك لەسەربازگەیەکەوە بۆ سەربازگەیەکی تر یان لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر دەوەشێنران وەك ئاماژەیەك بۆ کۆبوونەوە ئامادە بوون بۆ جەنگ تا ئەوەی کە جەنگ کۆتایی پێهات والیەکان و مەمالیکەکان دەگەڕانەوە بۆ ئیقتاعەکانی خۆیان، ئەمە لە وەرزی زستاندا باو بوو تا ئەگەر لەبەهاردا پێویست بوون بگەڕێنەوە.[1] بەمجۆرە لەمەی پێشووە دەزانین سەلجوقیەکان لەکۆتایی ڕۆژەکانی دەسەڵاتیاندا چەند کەسێکی گەورەی مەمالیکەکانیان وەرگرتن و کردنیان بە ئەتابەگ تا ببن بە پەروەردەکەری منداڵانیان لە کۆشکدا و ئیقتاعی گەورەیان پێدەدان لەبەرامبەر ئەوەی کاروباری ئەو منداڵانە ئەنجام بدەن و خزمەتی جەنگی لەکاتی جەنگدا بەجێبگەیەنن، بەڵام خێرا ئەو ئەتابەگانە بوون بەخاوەن قەڵەمڕەوی کرداری لەو ئیتقاعانەدا و لاوازی و لێکهەڵوەشانی دەوڵەتی سەلجووقییان قۆستەوە و بەرەبەرە لە ویلایەتەکانیاندا سەربەخۆیان وەرگرت تا خاکی سەلجووقییان لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد بەتەنها لقی ڕۆمی نەبێت لە ئاسیایی بچووکدا کە هەر لە حەوزەی خودی سەلجووقیەکاندا مایەوە تا عوسمانیەکان لەکۆتاییەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی سیانزەی زاینییدا هاتن بۆ ئەو وڵاتە.

دەوڵەت ئەتابەگیەکان ژمارەیان زۆر و ماڵ و بنەماڵەیان زۆرن و لەیەك ڕەگەزدا کۆتاییان پێ نایەت، بەڵام سیفەتی مەملووکی پەیوەندیکردن بە بنەماڵەی سەلجووقی و نیزامی ئیقتاعی ئیسلامی یەکیان دەخات، لەو مەمالیکە

---

١ـ (Lane Paole: Saladin P١٥-٢١).

سەلجووقیانەی فەرمانڕەواییان کردبوون بە پاشان، بەنورتوق بوون کە ئورتوقی تورکمانی باپیرە گەورەیان کە یەکێك بوو لە مەمالیکەکانی مەلیکشاە ئەم ناوەی پێدان، ئورتوق لەو مەمالیکانە بوو کە فەرمانڕەوایی قەڵای کیفا(٤٩٥ك ـ ٦٩٢ك/ ١١٠١ـ ١٢٣١ز)و ماردین (٥٠٢ـ ٨١١ك/ ١١٠٨ـ ١٤٠٨ز)یان دەکرد، پاشان ئەتابەگی دیمەشق هەن(٤٩٧ـ ٥٤٩ك/ ١١٠٣ـ ١١٥٤ز)یەکەم پاشایان توغتکینەکە بە بنەڕەت مەملووکی پاشا توتوشی کوڕی ئەلبەئەرسەلانی یەکەم سەلجووقیەکانی شام بوو، بوو بە مەملووکی دقاقی کوڕی دواتر توغتکین دیمەشقی گرتەدەست و(٥٢)ساڵ لە پشتی ئەوەوە بەردەوامبوو، پاشان شایەکانی خوارزم هاتن(٤٧٠ـ ٦٢٨ك/ ١٠٧٧ـ ١٢٣١ز)ئەمانە دەرێنە پاڵ ئەنوشتکین کە مەملوکێکی تورکی یەکێك لەسەرکردە سەلجوقیەکانە سوڵتان مەلیکشاە کردی بە فەرمانڕەوای خوارزم(خیوە)، ئەم خێزانە جێپێی خۆیان چەسپاند و دەسەڵاتیان فراوان بوو، لەسەردەستی ئوتسنروتکش و عەلائەدین دەوڵەتی سەلجووقیەکان لە خوراسان و ناوچەی وڵاتی ڕەی و شاخ و ئەدیو ڕووباردا هەڵوەشایەوە، ئەبوو شامە دەگێڕێتەوە دەهەزار مەملووکی وەك پاشای هەبوو. ئەم ئیمبراتۆریەتی خوارزمیە لەسەردەستی جەلالەدین خوارزمشاە و لەسەردەستی مەغۆل لە ساڵی(٦٢٨ك ـ ١٢٣١ز)دا کۆتایی پێهات، لە دوای ئەوەوە چەند ڕیسەیەکی هەبوون کە دەوڵەتی مەمالێکی یەکەمی لە میسر لێوەی سەرهەڵدا.

لە کەسە دیارەکانی ئەتابەگەکان لە سەدەکانی سەدەی دوانزەی زایینیدا سەرکردە عیمادەدین زەنگی دامەزرێنەری ئەتابەگی موسڵ و شار و دیار ڕەبیعە و موزربوو، ئەو کوڕە قەسیمودەوڵە ئاق سقری حاجت بوو کە وەك مەملووکی سوڵتان مەلیکشان، و ژیانی دەستپێکردنی، دەرکەوتنی سەلاحەدینی ئەیووبی کە بەڕێکخستنەوەی سەلجووقیەکان کاریگەربوون لە ڕێگەی زەنگی و نورەدین کوڕەیەوە دەرکەوت، فەزڵی گواستنەوەی ئەو ڕێکخستنانەیش بۆ میسر بۆ سەلاحەدین دەگەڕێتەوە، بۆ ئەو ڕێکخستنانە و چەند سەدەیەك لەسەردەمی ئەیووبی و مەمالیکەکاندا مانەوە.

لە نموونەی ئەو جێدەستانە باسی بەکارهێنانی جالیش لەو پێشڕەوی سوپادا دەکەین،جالیش دەربڕی خەسڵەتێکی شیعرەکە لەسەر ڕووی ئالاّ و لەبەردەم سوپاوە بەرز دەکرایەوە، پاشان ئەو ناوە لە پێشڕەوی بەشی پێشەوەی سوپادەنرا.[1] سەلجووقیەکان ئەم نەریتەیان لە ڕۆژهەلاّتەوە هێنا و دواتر لەسەردەستی ئەییوبیەکان گوزرایەوە بۆ میسر چووە بۆ ولاّتی مەغریب و ئەندەلوسیش، ئەویش لەگەڵ ئەو دەستەی و کۆمەڵەی فوزەکاندا چوو کە مەملووك قراقوش تەقوا.[2] لە ڕۆژانی سەلاحەدیندا سەرکردایەتی دەکرد، ئیبن خەتب کاتێك وەسفی ئەو هێرشە دەکات بە سوپای مەغریبی لەسەردەمی دەوڵەتی مورینیدا پیێ هەستا دەڵێت: ئالاّکانیان لە شێوە و شکۆی غوزە ڕۆژهەلاّتیەکان کەڕەناوت پڵ و هەلگرتنی دێرە شیعر لەسەر ڕووی ئالاّوە کشان.[3]

هەروەها سەلجووقیەکان لەگەڵ نەریتە فارسی و تورکیەکان تردا چەند نیزامێکی ناو کۆشك و کاروانە ڕەسمیەکانیان هێنا کە پێش ڕۆژانی ئومەوی و عەبباسی و فاتیمیەکان بەکارنەهاتبوون. نموونەی ئەمەیش دانانی(غاشیە)یە لەبەردەستی سوڵتان لە بۆنە جیاجیاکاندا وەك دروشمێکی دەسەلاّت، غاشیە ڕەختێکی پێستەیە کە بەزێر نەخشێنراوەبوو، ئەوەی سەیری دەکرد دوای دەزانی هەمووی لە زێر دروست کراوە، هەلگرانی خانە دەیانهێنایە بەردەستی سولّتان و بەچەپ و ڕاست دەیانێچایەوە، ئەم نەریتە لەسەردەستی سەلاحەدین و جێگرەکانی گوازرایەوە بۆ میسرو شام و دوای ئەوەیش لە ڕۆژانی سولّتان مەملووکیەکاندا بەردەوامبوو، ئەبوو عومەری نابلووسی لە کتێبەکەیدا(تأريخ الفيوم).[4] نمونەیەکی نایاب دەگێڕێتەوە کە بەلگەی بەهای غاشیە وەك هێمایەکی پاشایەتی یە، ئەو دەڵێت شتێکی میسری

---

١ـ(ئەبوو شامە لەو بارەیەوە(الروضتين ج٢ ص٧٧)و لە جەنگی حتینی سالّی(٥٨٣ك)دەڵێت جالیشە پێشکەوتن و بە ئاگری نووکەڕم. بێباوە ڕەنێاوەڕانیان دەسووتازرن).

٢ـ(دەدرێتەوە پالّ ئەمیری ئەیووبی تەقیەدین عومەری کوڕی برای سەلاحەدین).

٣ـ(ابن الخطيب: نفاضية الجراب في علالة الأغتراب ص٣٢٩، نشر مختار العبادي).

٤ ـ(عثمان إبراهيم النابلسی ت (٦٥٦)كتاب لمنع القوانين المعينة في دواوين الديار المصرية نشر في مجلة: (Bulletin Des Etudes Drientales Xvl(١٩٥٨)Dammass)ئەم کتێبەی لەسەر ڕێوڕەسمی خەزێنەی سولّتان صالح نەجمەدین ئەییووبی دانان).

ناوی شەهابەدینی تووشی بوو فرمانی بە هەڵگرانی خانەکەی کرد تا لەسەر پەنجاکانیان غاشیە بەرزبکەنەوە وەك چۆن لەبەردەم پاشاکاندا دەکرێت، کاتێك هەندێك لەوبارەوە پرسیاریان لێکرد، وتی(من پاشای زانایانم وەك چۆن پاشاکان پاشای هاولاتیانن).[١]

هەروەها سەلجووقیەکان نیزامی خوێندنگەیان داهێنا، ئەم خوێندنگانە چەند دامەزراوەیەکی زانستی سوننی بوون بۆ دژایەتی مەزهەبی ئیسماعیلی شیعی و ئامادەسازی عەقڵەکان بۆ بیری جیهاد دژبە خاچپەرستان، نوردەین محمود زەنگیش لە شام لەسەر ئەو سیاسەت نەچوو، پاشان سەلاحەدینی ئەیووبیش لەمیسر بۆ لەناوبردنی بانگەوازی فاتیمی بەو شێوە چوو، لەو ڕوانگەیەوە تێبنی ئەوە دەکرێت شاری ئەسکەندەریە لە کۆتاییەکانی ڕۆژانی فاتیمیەکان و پێش هاتنی سەلاحەدین بە نیزامی حوێندنگەی سوننیەکان ناسرابوو، جا یەکەم خوێندنگە کە تیایدا دامەزرا خوێندنگەی(حافظیە)بوو کە ڕیزوانی کوڕی ولخشی وەزیری خەلیفەی حافیزی فاتیمی لە ساڵی(٥٣٢ك)دا دایمەزراندو وانەی تێدا وتراوە دایە دەست فیقهناسی مالیکی ئەبوو تاهیری کوڕی عەوف کە پیشتر لای ئەبوو بەکری تەرتوشی مێردی پووری مەزهەبی مالیکی خوێندبوو.[٢]

پاش دەساڵ واتە ساڵی(٥٤٤)عادلی کوڕی سەلاری وەزیری خەلیفە زافیری فاتیمی لە ئەسکەندەریە خوێندنگەیەکی تری سوننی دامەزراندو وانەی تێدا وتنەوەی دایە دەست ئەبوو تاهیر ئەحمەدی سەلەفی فیقهناسی شافیعی.[٣] بەڵام بلابوونەوەی مەزهەبی سونی لەوکاتەدا لە سنورێکی بەرتەسکدا بوو و تەنها شاری ئەسکەندەریەی دەگرتەوە و شارە میسریەکانی تری دەگرتەوە، ئەمەیش لەبەر باری جوگرافی میسر و پەوەیوندەی بەتینی بە مەغریبی سوونیەوە، بۆیە

---

١ـ(عثمان النابلسی: هەمان سەرچاوە).

٢ـ(السبکی: طبقات الشافعیةج٤ص٤٣"ابن خلکان: وفیات الأعیان ج١ص٨٧(طبعة محي الدين عبدالحميد)جمال الدین الشیال)أعلام الأسکندریةص١٢٩).

٣ـ(ابن خلکان: هەمان سەرچاوە ج١ص٨٧، السبکی: هەمان سەرچاوەج٤ص٤٢).

دەتوانێن بڵێن ئەییووبیەکان لەڕاستیدا گرنگییان بە بنیادنانی خوێندنگەکان داوە لە بەشەکانی میسر و شامدا.

ئەییووبیەکان لەسەر ڕێرەوی سەلجووقیەکان و ئەتابەگەکانیان مەمالیکی تورکییان زیاد دەکردن و لە سوپادا بەکاریان دەهێنان، بەڵام تێبنی ئەوە دەکرێت ئەییوبیەکان کوردی ئازاد بون و کۆیلایەتییان بەخۆیانەوە نەدیوە، نووسەری(مرآة الزمان)بەرپەرچی ئەوە دەداتەوەکە شادی باپیری سەلاحەدین سەرەتا مەملووکی بەهرۆزی خادم بوویێت کە سوڵتان مەسعود غیائەدین موحەممەدی کوڕی مەلیکشاهی سەلجووقی کردبووی بە شەحنەی عیراق.[1] نووسەری المرآة الزمان دەڵێت: شادی هیچکات مەملووك نەبوو هیچ کەسی وە لە ئەییووبیەکان کۆیلایەتییان بەخۆیانەوە نەدەیوە، بەڵکوو شادی خزمەتکاری بەهرۆز بووە و ئەویش لەجیاتی خۆی لە قەڵای تکریت دایناوە.[2]

هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن سەلاحەدین لە بنەماڵەیەکی بەڕەچەڵەك عەرەب بوون کە لای کوردەکان نیشتەجێ بوون و سەلاحەدین لە نەوەی شادی کوڕی مەروانی کوڕی موحەممەدی کۆتا خەلیفەی ئومەوی بووە کە دایکی کوردبووە، ئیبن خەلەکان ئەم ڕایە دێنێت و دەڵێت ئەوانەی ئەم ڕایەیان هەیە دەیانەوێت لە ئەییووبیەکان نزیك ببنەوە دوای ئەوەی دەسەڵاتیان کەوتە دەست، ئەوەیش دەڵێت نەیتوانیوە لە دوای شاری بچێتەوە سەر باپیرەی ئەو بنەماڵەیە، لێرەدا جۆرە یەکدەنگیەك هەیە کە ئەییوبیەکان کوردی ئازربینجانن لە گوندێکی باکووری ئازەربایجان کە بە(دوین)ناسراوە لەبەرەجەرمینیا، شادی باپیری سەلاحەدین لەسەردەمی سوڵتان مەسعودی کوڕی مەلیکشاهدا پەیوەندیکرد بەهرۆزی خادمی فەرمانڕەوای سەلجووقی لە عێراق و ئەوەیش شادی کرد بەجێگری خۆی لەقەڵای تکریت کە ناوچەیەکی کوردییە و دانیشتوانەکانیشی کوردی.

---

١ـ(شەحنە: پۆستێکی سەلجووقیەکە ئاسایشی و پۆلیسی بەغدادی لە دەستدابوو. وەرگێرا).

٢ ـ(أبو المحاسن: النجوم الزاهرة ج٦ص٣ـ٤)بەرپەرچی ئەوە دەداتەوەو لە(مرآةالزمان)ی ئیبن جەوزی وەرگرتووە).

نەجمەدین ئەییووبی کوڕی شادی لەجیاتی باوکی فەرمانڕاوەی گرتە دەست، بارووۆخی بۆ لواتا بچێتە خزمەت عیمادەدین زەنگی، بەرپرسی موسڵ و حەڵەب، ئەویش لەلایەن خۆیەوە کردی بە فەرمانڕاوەی بەعلەبەگ دوای ئەوە دەستی بەسەر داگرت، دەڵێن لە هەمان شەودا کە تیایدا نەجمەدین ئەییوب قەڵای تکریتی بەجێهیشتووە یوسف سەلاحەدین ئەییووبی کوڕی لە ساڵی(٥٣٢ك - ١١٣٨ز)دا لەدایکبوو، لەوکاتەوە ئەییوبیەکان پەیوەندیەکی بەتنیان بەبنەماڵەی عیمادەدین زەنگیەوە هەبوو تا ئەو ئاستەی دوای مردنی عیمادەدین زەنگی لە ساڵی(١١٤٦ز)دا نەجمەدین ئەییووب و ئەسەدەدین شێرکۆی برای.[1] لە گەورە مەلیك عادل نوردەدین زەنگی کوڕی عیمادەدینی بەرپرسی حەلەب و دیمەشق بوون.

کاتێك نورەدین بڕیاریدا هەڵمەتێك بنێرێت بۆ میسر تا گەمارۆی شانیشنی خاچپەرستی بەتیولمەقدیس لە باشووری بدات - دوای ئەوەی فاتیمیەکان نەیانتوانی بەرگری لەقودس بکەن - بۆ سەرکردایەتی ئەو هەڵمەتە ئەسەدەدین شێرکۆی سەرکردەی ئەییووبی هەڵبژارد کە سەلاحەدینی برازایشی لەگەڵدا نارد.

خاچپەرستان هەستیان بە مەترسی ئەو بزوتنەوەیە کرد بەپەلە کەوتنە دەستوەردانە کاروباری میسر و لەکار خستنی ئەو پلانە، لێرەدا پێشڕەویەك بەرەو میسریەکان لەنێوان خاچپەرستان بە سەرکردایەتی عمور(Amalric)پاشای بەتیولمە قدرس و نێوان سوپاکانی نورەدیندا بەسەرکردایەتی شێرکۆ ڕوویدا، دواتر چەند جەنگێك لەنێوان هەردوولادا ڕوویداو کۆتاییەکەی بەوە هات کە هەردوولا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی لە میسردا بکشێنەوە، بەڵام ئەو هەڵمەتانە دەستیانپێکردەوە و هەردوولا سێ جاری تر جەنگیان ئەنجام دایەوەو پیشبڕکێکە بە سەرکەوتنی شێرکۆ و مانەوە لە میسر وەك وەزیر خەلیفە عازیدی فاتیمی کۆتایی پێهات و عموریش بەشکستخواردوویی گەڕایەوە بۆ بەتیولمەقدیس لێرەدا شیاوی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین ئەو سوپایەی ئەسەدەدین شێرکۆ بردی بۆ

١ـ(وشەی شیرکۆە بە واتای شێری جەنگەڵ دێت(المقرین: السلوك ج١ق١ص٤١)الحاشیة).

میسر زۆربەی لە مەمالیەکان و سەرکردەنووریەکان بوون.[(١)] لەگەڵ ئەوەیشدا دەستەیەك لە مەمالیکە ئەسەدیەکان هەبوون.[(٢)] ژمارەیان لە کاتی مرنیدا پێنجسەد مەملووك بوو، لێرەدا پێویست ناکات چیرۆکی بوون بەوەزیری سەلاحەدین وەك وەزیری فاتیمی لەدوای شێرکۆی مامی باس بکەین مەمالیکە ئەسەدیەکان لە ساڵی(٥٦٥ك ـ ١١٦٩ز)دا چ فەزل و گەورەییەکیان لەوەدا هەبوو.

خەلیفە عازید لەدەی موحەرەمی ساڵی(٥٦٧ك ـ ١١٧١ز) واتە لە ڕۆژی عاشوراء دامرد. بەمردنی ئەوەیش دەوڵەتی فاتیمی شیعی نەماو ئاوابوو، وەك ئەوە وابوو کە ڕۆژەدا نەما کە تیایدا حوسەین(ر. ق)شەهیدا کرا.[(٣)]

---

١ـ(أبو شامة: كتاب الروضتين في أخبار الدولتين ج١ص١٥٥، ١٧٣).

٢ـ (أبو شامة: كتاب الروضتين في أخبار الدولتين ج١ص١٥٥، ١٧٣).

٣ـ(نووسەر لێرەدا وانیشان دەدات کە فاتیمیەکان هەڵگری پەیامی ئیمامی حوسەین بن. کە چی لە ڕاستیدا فاتیمیەکا دەوڵەتێکی عەبیدی ڕافیزییان دامەزراند کە لەگەڵ قورئان و فەرموودە و هاوەڵاندا نەیدەکرا. دانانی قورئانی نوێ فاتیمی و بە گومڕادانانی زۆرینەی هاوەڵان و نەفرین کردن لە سێ خەلیفەی ڕاشیدین(أبوبكرو عمرو عوسمان)(ﷺ)و بەدەستەوە دانی قودس و دژایەتی کردنی توندی دەوڵەتی عەبباسی و دەست تێکەڵکردن لەگەڵ خاچپەرستاندا دژبە دەوڵەتی عەبباسی لێدانی زانایانی سوننە و چەندین شەرمەزاری تری دژ بە ئیسلام و موسڵمانان دەیسەلمێنن کە پەیامی پاکی ئیمامی حوسەین(ﷺ)و پەیامی لا دەرانەی دەوڵەتی عەبیدی فاتیمی زۆر لە یەکتر دوورن. وەرگێڕ).

# بەشی سێیەم

## (دەوڵەتی ئەییووبی و مەمالیکەکانی سەردەمی سەلاحەدینی ئەییووبی) (٥٦٤ـ ٥٨٩ك / ١١٦٩ـ ١١٩٣ز)

### ئەو ئامادە سازیانەی سەلاحەدین پێی هەستا، تا دژ بە مەترسی خاچپەرستی بجەنگێت:

سەلاحەدین کەوتە کار بۆ سڕینەوەی شوێنەوارەکانی دەوڵەتی فاتیمی لە پێناوە جیاوازە جەنگی و مەدەنی و ڕۆشبیریەکانەوە، بۆیە سەربازە فاتیمەیە کۆیلە ڕەش و ئەرمەنەیەکان و ئەوانی تریشی لابرد و کەوتە پێکهێنانی سوپایەك کە زۆرینەی لە مەمالیکە کۆنەکانەکانی ئەسەدی بوون، وێڕای ئەو مەمالیکە تورکانەی بۆخۆی کڕی بوونی و ناوی نەبوون سەلاحی وەك چوندانی بەناوی خۆیەوە یان ناسری وەك دانەوە پاڵ نازناوی ناسر کە خەلیفەی فاتیمی ئەوکات کردی بەوەزیری ئەو نازناوەی پێدا هەموو ئەوانی تر لەو کوردە ئازادانە بوون کە چوونە خزمەتی.

شتێکی ڕوون و جێی عەقڵە کە ئەو سەلامی و ئەسەدیانە بوون بە پاسەوانی تایبەتی سەلاحەدین هەروەك ئەو عادلیانەی عادلی برای پێکهێنابوون دواتر بوون بە چواردەوری تایبەتی ئەو سەرکردەیە گەورەیە.

لەبەختی سەلاحەدین ئەوە بوو، کە نورەدین مەحمودی گەورەی دوای ئەوە بەکەمێك مرد(٥٦٩ك ـ ١١٧٤ز)و لە دوای خۆی منداڵێکی تەمەن یانزەساڵی بەجێهێشت کە مەلێك صالح ئیسماعیل بوو هەروەها لەهەمان ساڵدا عەموری پاشای بەیتولمەقدیس مرد و لەدوای خۆی کوڕێکی بێتوانای لە دەسەڵاتدا بەجێهێشت کە بولدوین ئەبرەسی چوارەم بوو، بەدوای ئەمەدا دابەشکاریە ناخۆییەکان لە دەسەڵاتی نورەدین و دەسەڵاتی خاچپەرستانیشدا کەڵەکەبوو.

بەڵام سەلاحەدین بەهۆی توانای زۆریەوە لە میسر دەیتوانی ڕاستەخۆ خاچپەرستان لەفەلەستین دابڕنێت، بەڵام ئەوەی پێ باشتر بوو پێشتر سوپا و کەشتیگەلەکانی پێش بخات و ناوچەی نوردەینی گەورە یەکبخات کە لەنێوانیان سەرکردە چاوچنۆکەکاندا دابەشبووبوو، بۆیە سەلاحەدین زەنجیری کار و ئامادەسازیەکی جەنگی ناوخۆیی ئەنجامدا کەلەم هەنگاوانەدا پوختیان دەکەینەوە:

یەکەم: کارکردن بۆ زیندووکردنەوەی دەریاوانی ئیسلامی وەك چەکێکی دژ بە دوژمنکاری یە خاچپەرستیەتی کە مەترسی و شاڵاوەکانی گەیشتبوونە شارەکانی کەناراوە میسرەیەکان، بۆیە دیوانێکی تایبەتی بۆ دەریاوانی دانا تا خەرجی بکێشێت و بەناوی دیوانی کەشتیگەلەوە ناسرا بوو و لە ساڵی(٥٧٢ك/ ١١٧٦ن)دا هاوڕێیەکی خۆی کرد بەوالی لەسەری سەرچاوەکان هیچیان لەوبارەوە نەوتووە هێندەنەبێت دەڵێن سەلاحەدین نامەی بۆ هەموو والیەکانی ناوچە میسری و شامیەکان نووسی و فرمانی پێکرد تا هەرکات ئەو کەسە گەیشتە لایان خواستەکانی بەجێبگەیەنن لەڕووی کۆکردنەوەی سەربازەوە تا خزمەتی کەشتیگەلەکە بکەن: (قسە قسە بەرپرسی کەشتیگەلەکە، لەسەربازگرتن و ئەوەی پێویستی بێبیە نابێت ڕێی لێبگیرێت)لە ساڵی(٥ف٨٧ك ـ ١١٩١ن)دا سەلاحەدین عادلی برای خۆی وەك سەرۆکی گشتی دیوانی کەشتیگەلە دەستنیشانکرد، پاشان عادلیش لەلایەن خۆیەوە سەفیەدینی کوڕی شاکری جێگیری خۆی لەو دیوانەدا دەستنیشانکرد، دیوانی کەشتیگەل خەرجی ڕۆڵێ پیشەسازیە، (تەرسانە)جیاوازەکانی گەیشتە ئەستۆو بە هەموو پێویستەکانی دارو تەختەو ئامێر یارمەتی دا، سەلاحەدین مووچەی و سامانێکی زۆری بۆ دیوانی تایبەتمەند کە بریتیبوو لە بەرهەمەکانی هەرێمی فەیوم و دولێ نەترون و(جريح السنط)و بەرهەمەکانی دیوانی زەکات و دەستکەوتی چەند گوندێکی بهنسای لە پاریزگای مینای ئێستابوو.

دووەم: سەلاحەدین قەدەغەکردنی(جەنگەڵەکانی)درەختەکانی سەنتی(Acaia)قۆرخکردبوو، ئەمە لەناوچەی قەدەغەی سوڵتان ناسرابوو،

بەمەرێی بە خەڵك نەدا هەڵسوکەوتی تێدابکەن و وەك کانێکی داناکە کەس خاوەنی نیەو تایبمەندنیە پێی، بەڵکو بۆ بەیتولما لەو وەك چەند دراوێکی نەمری نێو دیوان بەکار دەهات و پاسەوانی لەسەردانانی لێ توندکردەوە، لەگەڵ ئەوەدا ناتوانی رووبەرەکەی دیاری بکەین، بەڵام دیارە لەچەند شوێنێکی سەختی باشووری دەلتاو صەعیدی میسر وەك جەزیرەی و ئەسمونین و ئەسیوت و ئە حضیم و قوص دا هەبوو.

سەلاحەدین بە داوی ناوچەی ناو میسرەوە نەوەستا، بەڵکوو لە دروستکردنی کەشتگەلدا پەنای بۆ ئەو دارو تەختەی سنۆبەرانە بەست کە لە شاخەکانی لوبناندا دەنێژران وێرای ئەو کانزا ئاسنینەی لە شاخەکانی نزیك بەیرووت دەردەهێنرا، هەروەها چەند پەیماننامەیەکی بازرگانی بۆ ئەوە مەبەستە لەگەڵ کۆماری ئیتالیەکاندا بەست بەوپێیەی توانی پێویستیەکانی ئاسن و دارو تەختەو شەمێ دەستکەوێت.

لە ئەسکەندەریەدا دێوانێك هەبوو بەناوی بازرگانی سوڵتان بۆ کرینی جۆرە شمەکە هاوردە جیاوازەکانی دەرەوە و پێویستیەکانی سوپا و کەشتیگەل وەك دارو تەختەو ئاسن و قوماش پەڕمی، جا بازرگانی سوڵتان ئەوماددانەی لە بازرگانە بیانیەکان بە سامانی یەك لە پێنج سەد پێنرا و بەسەریاندا دەکڕی.

سێیەم: سەلاحەدین رێگری لە خەڵك و بازرگانان کرد لەوەی لە بواری ماددە جەنگیەکاندا لەگەڵ وڵاتانی مەسیحیدا هەڵسوکەوت بکەن و بڵاوکارێکی لەوبارەیەوە بڵاوکردەوە و تیایدا دەڵێت: (ئەم بڵاوکارە شەریفەمان ئەوە لەخۆدەگرێت کە بۆ کەس نیە چەك و شمەکی جەنگ بگوازێتەوە بۆ بەرەی وڵاتانی ڕۆمی، بڵاوکراوەکەمان بۆئەوە بەرێزی دانی پێدادەنێت و دەیچەسپێنێت ئەوەیە فرمانی باڵای پێش بخات و نابێت چەك و شمەکە جەنگ گوازێتەوە بۆ ئەو وڵاتە باسکراوانەی و بەتەواوەتی خۆپارێزی لەوە هەبێت و شارەزای نەمەبێت).

چوارەم: سەحەلادین گرنگیدا بە بەهێزکردنی دامودەزگاکانی بەرگریکاری و پاسەوانی کەناراوی وەك سەنگەرگیری و پاسەوانی و دوورگەو بەرزاییەکانی

بەدرێژایی کەناراوەکانی میسر و شام و سەربازانی بەتاڵە [١] و ئەیزاك [٢] و ئەبدال [٣] (جیگۆرکێی)و ئەوانەی تیایدا سەنگەر دەگرن و پاسەوانن لەوێ کۆکردەوە، لەوبارەیشەوە بڵاوکراوەیەکی دەرکرد و تیایدا دەڵێت: (بڵاوکراوەی شەریمان ئەوە دەگەیەنێت هەوڵ بدرێت بۆ پاراستنی کەناراو بەندەرەکان و گرنگی، یان پێبدرێت و پاسەوان و جێگۆرکێکیان بەشێوەی ئاسایی لەکاتی خۆیاندا ئامادەبن و گەورەکانیان پابەند بە ئاگاداری و ڕێکخستنیان بن، هەروەها دیدە بانەکان لە بەرزایی و دوور بینی و ناوچە ناسراوەکاند بارودۆخیان بپارێزێت).

ئیشی ڕووناک کەرەوان ئەوە بوو کە ئەگەر دوژمنکنیان لە دەریادا ئاشکرا بکردایەکە لەدوورەوە دێت لەسەر لووتکەی ئاگردانەکان ئاگریان دەکردەوە ئەگەر شەوبوایە، ڕۆژبوایە دووکەڵیان تێدا دەنایەوە، ئەمە لەپاڵ بەکارهێنای تەپڵ و هاواردا بۆ بێدارکردنەوەی خەڵکی شاردە دراوسێکان بوو لە شاڵاوی دوژمن، زۆرجار ڕووناك کەرەوان چەند ئاماژەیەکی ئاگرین یان دووکەڵییان بە چەند ڕیگەیەك یان جمووجووڵێکی دیاریکراو بەکاردەهێنا بۆ هەواڵدان لەبارەی حاڵ یان ژمارەیان ڕەگەز یان هەرشتێکی تری دوژمن، ئەگەر چی بەداخەوە سەرچاوەکانی شرۆڤەکاری ڕێگەی ناردنی ئەو ئامارزانەیان بۆ نەکردوین، بەوشێوەی کە لە جەڕەسی بێدارکردنەوەی ئەمڕۆمان دەچوون قاهیری لە ڕوودانی شاڵاوێکی دەریای لەوپەڕی باکووری شامەوە بە یەك ڕۆژ ئاگاداردەکرایەوە.

پێنجەم: سەلاحەدین گرنگیدانی خۆی دا بە پاراستنی دەریای سوورو بازرگانی و حاجیەکانی و شوێنە پیرۆزەکانی بەدرێژایی دەریای سوور لە مەترسی داگیرکاری خاچپەرستی کە کەناراوەکانی شام و فەلەستینی داگیرکردبوو، سەلاحەدین لە پەیڕەوکردنی ئەو سیاسیەتە لەسەر کەشتێگەلی دەریایی خۆی بەردەوامبوو و

---

١ـ(بەتاڵەکان ئەو سەرکردەو سەربازانەی کەلەبەر چەند هۆکارو پاڵنەرێکی جیاواز لە پێشو کاروبارو ئیفتاعەکانی دەوڵەتدا وەستێبراون).

٢ـ(ئەیزاك: واتە پاسەوان).

٣ـ(ئەبدال: بەواتای گۆڕین و جێگۆڕکێ دێت واتە ئەوەی شوێنی پاسەوانی دەگرێتەوە).

کاریکرد بۆ بەهێزکردنیشی و لە بنیانیشدا داروتەختەی(سنط)ی قۆستەوەکە لە دۆڵێ نیل و بیابانی سیناعدا بەشێکی زۆری پێدەگەیشت وەکو پێشتر باسمانکرد، لە ساڵی(٥٦٦ك - ١١٧٠ز)یشدا سەلاحەدین دەستیگرت بەسەر قەڵای ئیلەدا کە دەکەوێتە دەروازەی دەریای سوور وە ئەو قەڵایە بەدەست خاچپەرستانەوەبوو، سەلاحەدین بە کەشتیگەلەکەیەوە هێرشی بردە سەرو دەستی بەسەرداگرت بە موجاهیدان قایموقۆڵێ کرد چونکە دەکەوتە ڕێرەوی حاجیانی میسرەوە، پاشان چەند ساڵێکی کەم لە فەتحکردنی ئیلە، سەلاحەدین بەسەرکردایەتی تورانشاهی برای هەڵمەتێکی نارد کە لە ساڵی(٥٦٦ك - ١٩٧٠ز)دا یەمەنی گرت، پاشان قەڵەمڕەوی خۆی بەسەر حیجاز دا بڵاوکردەوە و لەمینبەرەکانی مەککە نزای بۆ دەکرا.

بێگومان ئەم دەستتیۆەردانەی میسر بۆ ناو وڵاتانی دەریای سوور لە باکوور و باشووری ئەو ئامانجەی لە پیشت خۆیدا مۆوڵ دابوو کە دەستبگرێت بەسەر دەروازەکانی ئەو دەریایەدا و بازرگانی و حاجیەکان لە مەترسی خاچپەرستان بپارێزێت، چونکە خاچپەرستان لە سیناء باشووری فەرلەستیندا سەنگەریان گرت بوو.

شەشەم: سەلاحەدین کەوتە قایموقۆڵکردنی سەرسنووره میسریەکاندا بەدرێژایی سەر دەریای سپی ناوەڕاست وەك ئەسکەندەریەو دمیات ڕەشد و فرمانی کرد شوراز بورجەکانی بنیاد بنێت و لەدەوریاندا خەندەق لێبدەن، سەلاحەدین سوور بوو لەسەر ئەوەی خۆی چاودێری بەڕێوەچوونی کارەکانی بکات، بۆیە خۆی چەند جارێك سەردانی ئەو سەر سنوورانەی کرد تا کارتێداکردنی تەواو بوو.

حەوتەم: سەلاحەدین سووربوو لەسەر ئەوەی مووچەی پیاوانی کەشتیگەل بەرزبکاتەوە تا باری ژیانیان باش بێت، بۆیە بڕیاریدا دیناری کەشتیگەل(٣/٤)دیناری گشتی بێت دوای ئەوەی(٥/٨)ی ئەو دینارە بوو، واتە نزیکەی(٪٢٠)زیادکرد، هەروەها دەریاوانە مەغریبەکان لە کەشتیگەلەکاندا بەکارهێنا چونکە ئەوان تایبەتمەندی لێهاتووییان لەو جیهادە دەریاییەدا هەبوو،

مێژوونووسە سەردەمەکان باسی دلێری ئەوانیان لەو مەیداننە و لەسەردەمی ئەییووبی و مەمالیکەکاندا کردووە.

هەشتەم: سەلاحەدین هوڵیدا گیانی جەنگ و جیهاد لە دەروونی موسڵمانان بڵاوبکاتەوەو عەقڵی موسڵمانان بۆ ئەو ئەرکە پیرۆزە ئامادەبکات، ئەمەیش لە ڕێگەی چەندین خوێندنگەوە کە لە میسر و شامدا دایمەزراندن.

سەلاحەدین سووربوو لەسەر ئەوەی خۆی ببێت بە پێشەنگێکی چاك بۆ ئەو کارە، بۆیە کوڕەکانی لە پیاوە گەورەکان و ئەو کەسە هەڵکەوتان چۆڵ نەبوو لە خزمەتیدا لە وتەی بەسوودیان بەتایبەتی لەبواری فەزڵەکان جیهاد و فەڕزی کەفوکول ئامادەسازی بۆ جیهاد، هەرکەس پێویست بوایە بەخۆی لە سەلاحەدین نزیك بکاتەوە لەسەر جیهاد و هاندانیان شتێك لەبارەی جیهادەوە قسەی بۆ دەکرد، لەو بوارەیشەوە چەندین کتێبی بۆ دانرا.

وەزیر و نووسەرەکانیش لەپێشەوەی ئەوانە بوون کە چوون بەدەم داواکەیەوە، عیمادەدینی ئەسفەهانی نووسەری سەلاحەدین دەڵێت: (من لە دیمەشق لەوماوەی لەوێ بووم کتێبکم لەبارەی جیهادەوە بۆ نووسی و هەموو ڕەوشت و ئاکار و حوکمەکانی جیهادم بۆ کۆکردەوە خستمە بەردەستی، ئەویش پێ سەرسام بوو و بەردەوام دەخوێندەوە). هەروەها قازی فازیلی وەزیر دەڵێت: (من یەکێکم لەوانەی لەبواری جیهاد دا کتێبیان بۆ دەنووسی و لەکتێبەکەمدا باسی ڕەوشت و ئەدەب و هەر ئایەتێکم کردەوە کە سەربارەت بە جیهاد هاتووە هەر فەرموودەیەکیش لە بارەی جیهادەوە گێڕدرابێتەوە و شەرحی عەرەبیەکانم کردەوە، سەلاحەدین ڕەحمەتی خوای لێبێت زۆری ئەخوێندەوە تا ئەوەی ئەفزلی کوڕی لێ سەند). هەروەها بەهائەدینی کوڕی شەدادی مێژوونووسی باس لەوەدەکات لەو ماوەی لە دیمەشق بوو کتێبێکی لەسەر جیهادو حوکم و ئەدەبەکانی نووسیوە کە سەلاحەدین پێی سەرسامبووە و لای خۆی پاراستوویەتی، ئەو کتێبە هۆکارێك بوو تا وەك نووسەر لای خۆی دایمەزرێنێت و تا کاتی مردنی لەگەڵیدا بێت.

دوای ئەو ئامادەسازیە جەنگیە بەرفراوانانەی سەلاحەدین پێیان هەستاو چەند ساڵیکی دوور درێژی دەسەلاتەکەی گرتەوە، کەوتە هێرشبردنە سەر مەڵبەندەکانی دوژمن تا بزووتنەوەی پەڵهاوێژی و گەیاندی دەریاییەکانی دوژمن یەك بخات، جا لە دەریای سپی ناوەڕستدا کەشتێگەلی لەماوەی نێوان ساڵانی(٥٧٥_٥٧٩ك/ ١١٧٩_١١٨٣ز)دا چەند چالاکیەکی سەرکەوتووی بردە سەرپێگەکانی دوژمن لە بەیروت و عەککا و دوورگەی ئەرواد، هەروەها دوورگەی کریت و دوورگەی قوبرس و کەناراوەکانی باشووری ئاسیای بچووك، لە دەریای سووریشدا مێژوونووسان دەگێڕنەوە لە ساڵی (٥٧٨ك ـ ١١٨٢ز)دا ئەرنات(Renaud de Chatillon)ی سەرکردەی خاچپەرستی بەرپرسی قەلای(کەرك).[1] لە باشووری فەلەستین ویستی هێرش بکاتە سەر مەککە و مەدینە، بۆیە چەند کۆمەڵە کەشتیەکی جەنگی دروستکرد و لەسەر پشتی وشتری دەشتەکیەدراوسێکانی بەکرا کە لەگەڵیاندا لەسەر ئەوەڕێککەوتبوو گواستنەوە، کاتێك گەیشتە کەناراوەکانی دەریا تەواوی کردەوە بردنیە ناو دوریا، پاشان دوو کەشتی لە قەلای ئیلە دانا تا گەمارۆی قەلاکە بدات کەشتیکەکانی تریشی بەرەو باشووری عیذاب برد، لەوێ کەوتنە کوشت و بڕ و دیلگرتن و نزیکەی شانزە کەسیان لە دەریادا سووتاند و کەشتیەکی هەلگری حاجییان لە جدەوە لە عیذاب داگرت و هەموو حاجیاکانیان کوشت و دەستیان بەسەر دووکەشتێکە داگرت کە شمەکیان تێدا بوو و لەیەمەن وە هاتبوون، دەستیشیان گرت بەسەر خۆراکێکی زۆری کەناراودا کە ئامادە کرابوو تا بنێردرێت بۆ مەککە و مەدینە و کۆمەڵەی کارێکیان کرد کە لە ئیسلامدا شتی وانەبیسترابوو، پاشان بەرەو حیجاز کەوتنەڕێ و ویستیان بچنە شاری پێغەمبەر(ﷺ) لە گۆری پیرۆزیدا دەربکەن، ئەمەیشیان بلاوکردەوە و بوێرانە

---

١ـ(وشەی کەرك(crac)ی سریانی بەواتای قەلادێت، هێشتا شاری کەرك تا ئەمڕۆ لە باشووری دەریای مردوو لە ڕۆژهەلاتی ئوردون هەیە و نزیکەی(٢٥)کیلومەتر لە عەممال دوورە، گێرانەوەیەکی تریش هەیە پێی وایەی کەرك یان قەرق بەواتای درەختی(فلین)دێت بە لاتینی(Quercus)).

لەسەر زمانیان باسیان دەکرد، کاتێك هەواڵ گەیشتە میسر ئەوکاتە مەلێك عادل لەجیاتی سەلاحەدین برای لەوێ بوو، فرمانی بە حاجب و حسامەدین لوئلوءکرد و کەشتیگەلی سازدا و بەوشکانییدا بردنی بۆ ئیلە و لەوێ لە دەریا دا خستنیە کار و پڕی کردن لەسەربازی بە ئەزموونی ئاییندار و بە کەفوکوڵ و فریاگوزاری مەغریبی دەریایی و چوو بۆ ئیلەی و سەرکەوت بەسەر ئەو دوو کەشتیەی دوژمن منداڵەکەی لەوێ بوون هەردووکیانی سوتاند و سەربازەکانی بەدیلگرت، پاشان درێژی بەڕێی خۆی دا بەرەو عیذاب، خەڵکی ئەوێ کەشتیەکانی دوژمنیان پێ نیشاندا، ئەویش کەوتە شوێنیان و پاش چەند رۆژێك لیێ دان، دوای هاتە سەر وشکانی کەوتە شوێن ڕاکردووە فرەنجەکانی و هەموویانی بەدیلگرت، ئەمەیش لە مانگی حەجدا ڕوویدا، بەدیلی دونیانی برد بۆ مینا و لەوێ چوون بەرخ سەردەبرێت هەردووکیانی سەربڕی و دوایی بەدیلەکانەوە لە ذیلحەجەی ساڵی (٥٧٨ك ـ ١١٨٢ز)دا چوو بۆ قاهیرە، سوڵتان نامەی بۆ نووسی تا لە ملی هەموو دیلەکان بدات و هیچیان نەهێڵێتەوە، یەکێکشیان نەهێڵێتەوە کە هەواڵ ڕێی ئەو دەریایە بزانێت).[1]

شاعیری ئەبوو حەسەنی کوڕی ذور لەبارەی پەردەدار لە ئلوئەوە بەهۆی ئەم ڕووداوە چەند شیعرێکی هەیە، لەوانە:

مرّيوم من الزمان عجيب　　كاد يبدي فيه السرور الجماد
إذأتى الحاجب الأجل بأسرى　　قرنتهم في طيّها الأصفاد
قلت بعد التكبير لما تبدي　　هكذا هكذا يكون الجهاد
حبذا لؤلؤ يصيد الأعادي　　وسواه من الآلى يصاد

ئەو تا دوای ئەوشکستە ناچار بوو لەگەڵ سەلاحەدیندا ئاگربەستێك ببەستێت و بەو بڕیارانەی ڕازی بێت بەسەر کاروانە بازرگاکانیەکانی میرنشینەکەیدا

---

١ـ (أبو شامة: كتاب الروضتين ج٢ص٣٥ـ ٣٧)ئەم ژمارەی دیلەکان بە نزیکەی سەدو حەفتا دیل مەزەندە دەکات).

دەیسەپێنێت و تیایدا قازانجێکی زۆر لە دەست دەدات ئەمە لەپاڵ ئەو پارە و سامانە زۆرەی سەلاحەدین بەنهێنی لێی دەسەند بەبێ ئەوەی کەسی پێ بزانێت تا بەوپێیەی توند و زیانی ئەوی لێ بەدووربێت، بێگومان ئەم سەرکەوتنانەی پێش جەنگی حطین بزووتنەوەی دوژمنیان یەکخست، ئەمە یاریدەدەر بوو تا پلانەکانی سەلاحەدین لە شامدا سەربگرن.

سەلاحەدین لەوماوەیە هەوڵیدەدا موسڵمانان یەکدەنگ بکات و ناوچەی ئیسلامیە پەرشوبڵاوەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی یەکبخات و لە کۆتاییدا توانی بەرەیەکی یەکبوون ئیسلامی پێکبهێنێت کە لە بەرقە لە رۆژئاواوە درێژ دەبوویەوە بۆ فورات لە رۆژهەڵاتەوە و لە موسڵ و حەلەبە لە باکوورە وە بۆ نۆبەوە یەمەن لە رۆژئاواوە درێژدەبوویەوە.

سەلاحەدین لە وتارێکیدا کە بۆ خەلیفەی موستەزیئی عەبباسی نارد سیاسەتی خۆی باسکرد و تیایدا دەڵێت: ئەگەر کاروباری جەنگ بەشداری بوێت پێویستە لێرەدا بەشداربونێکی زۆری هەبن.

## جەنگی حطین( ٥٨٣ك ـ ١١٨٧ز ):

هەنگاوی دواتری ناوچەیی ئەو یەکبوونە بوو سەلاحەدین هێرشێکی ئیسلامی بکاتە سەر دەسەڵاتی خاچپەرستان لە بەیتولمەقدیس و هەندێ کاری خراپە و سووکاتیکاری برێك لە خاچپەرستان بکاتە هۆکاری ڕاستەخۆی ئەو هێرشە، چونکە برنس ئەرناتی بەرپرسی قەڵای کەرك کە بەهۆی ئەوەی دەکەوێتە دەریای مردوو لە ئوردون دەیڕوانی بەسەر ڕێگەی بازرگانی و حەجی نێوان میسر و شام حیجاز، بەهۆی هەواڵگرەکانیەوە زانی، کە کاروانێکی گەورەی میسری بەرەو دیمەشق بەڕێیە و هەرچی شمەکی گرانبەها و نرخ هەیە لەخۆدەگرێت، ئەمەیش بەرچاوی ڕەش کرد و دەستی بەسەرداگرت و هەرچیەکی تێدابوو بەدیلگرتن، ئەم ڕووداوە لە ساڵی(١١٨٦ز)دا بوو هیچ گوێی بەو ئاگربەستە نەدا لەگەڵ سەلاحەدین بەستبووی، سەلاحەدین هەوڵیدا لە ڕێگەی دانووستانەوە ئەو ماڵو سامان و دیلانە بگرێنێتەوە،

بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، ئەوکاتە سوێندی خوارد کە تۆڵەی لێ بکاتەوە و دەستی خۆی بیکوژێت، پاشان ئامادەسازی گشتی بۆ هێرش بردنە سەر خاچپەرستان ڕاگەیاند، لێرەدا گێرانەوەیەکی تر لەو بارەوەیەوە هەیە کە میر عبالعزیزی تەمیمی کوڕی موعیزی کوڕی بادیسی سەنهاجی هاودەمی سەلاحەدین لە جیهادیدا و نەوەی مەلیك موعیزی کوڕی بادیسی بەرپرسی ئەفریقیا دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك سەلاحەدین بەسەختی لە ساڵی(٥٨٢ك) نەخۆش کەوت، نەزری کرد کە ئەگەر شفای وەرگرت هەرگیزی یەك موسڵمان نەکوژێت و هەموو جیهادی خۆی دژبە خاچپەرستان بخاتە گەڕ، جا ئەگەر بەسەریان سەرکەوت و دەستی گەیشتە بەئیبرنس ئەرنات بەهۆی کوشتنیەوە خۆی لەخوا نزیك دەکاتەوە، خوای گەورەیش بە بەرەکەتی ئەو بیانووە شیفای دا و ئەو نەزرەیش بوو بەهۆی کوشتنی ئیبرنس ئەرنات.[1]

مێژوونووسان ئەم هۆکار و پاڵنەرانەیان بۆ ئەو هێرشە گێڕاوەتەوە، هەرچەند چەند شتێکی دیارە ڕووداوەکەی ئەرنات بەدوورنیە تەنها هۆکاری ڕاستەوخۆ بوو بێت و سەلاحەدین بەرەو ئەو هێرشە نەچوو بێت تا دوای ئەوەی ئامادەسازی خۆی تەواو کرد و توانای پەیداکرد بۆ ئەوەی کات و شوێنی جەنگە کە دیاری بکات.

سەلاحەدین وای پێ باشبوو دووربگرێت لە هێرشبردنە سەر کۆبوونەوەی خاچپەرستان لە کەناراوی صفوریە لە نزیك عەککا، و هەڵیدا ناچاریان بکات لەناوخۆوە و لەو شوێنەوە کە ئەو دیاری کرد بوو جەنگ بچن بۆی، بۆیە هێرشی بردە سەر شاری تەبەریە کە ژنی میری تەرابلوس ریە سوندی سێیەمی تێدابوو کە ناوی ئەشیفا بوو، ئەو ڕووداوە تووڕەیی خاچپەرستانی وروژاند، بۆیە ئەنجومەنێکی جەنگیان لە عککا بەست و بڕیاریان دا صفوریەوە بەرەو تەبەریە بکشێن، ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرا ریمونـدی سێیەمی بەرپرسی تەرابلوس لە پێشەوەی هەموو گەموگورەکاندا بێت بۆ ئەو پلانە تا ژنەکەی خۆی ڕزگار بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوە دانەبوون بکشێن، چونکە ڕێگەکەی سەخت و کەم ئاو بوو و

١ـ(أبوشامة: كتاب الروضتين ج٢ص٨٠).

کەش و هەوایش گەرم بوو، وای پێ باشتر بوو بمێننەوەو لەسەر کەناراو چاوەڕێی موسڵمانان بکەن، بەڵام سەرکردەی خاچپەرستیەکان وەك ئەرنات و جای لوزجنانی پاشای بەیتولمە قدیس و سەرکردەکانی داویە ریموندیان بەوە تۆمەتبارکرد کە ترسنۆك و لاوازە و بڕیاریان دا بەرەو تەبریە بکشێن، لە ڕستیدا دیدی ڕیمۆند لەڕووی ستراتێریەوە ڕاستتر بوو.

سەلاحەدین بە سەرکەوتنی پلانەکەی دلخۆش بوو بەدوای ئەو بڕیارەی خاچپەرستاندا وتی: (ئەوەی دەمان ویست هاتە دەستمان)ئەو لەگەڵ سەربازەکانیدا سێبەر و ئاویان لای دەریاچەی تەبەریە لە ئوردون هەبوو، لە کاتێکدا خاچپەرستان دەبوو بە قەلغانە ئاسنینەکانەوە ڕێگەیەکی وشکی بەرزایی بەدرێژایی شانزە کیلۆمەتری بێ ئاو و پڕ گەرمای منگی سەختی یۆلیۆ ببڕن، سەلاحەدین سوور بوو لەسەرئەوەی تەپۆلێکی بەردینی ڕەق و تەقی بێ ئاویان بۆ بەجێ بهێلێت کە تەبی حطین بوو، خاچپەرستان بەماندوویی و پەککەوتەییەوە گەیشتنە ئەوێ، پاشان موسڵمانان لە دارو درەختەکانی دەوربەرەوە ئاگریان بەرِوودا کردنەوە، بەمە گەرمای کات و گەرمای ئاگرو دووکەڵ و گەرمای تینوێتی و جەنگ بەسەریاندا کۆبوویەوە، سەلاحەدین دەرفەتی هانی شەوی قۆستەوە و چواردەوری سوپای خاچپەرستانی دا، پاشان جەنگ لەنێوان هەردوولادا بەڕێوە چوو و خاچپەرستان تەنها یەك تەپیان لەبەردەمدا مایەوە کە حطین بوو، بۆیە بەسەرتەپەکەدا بەرەو لویکەی سەرکەوتن و موسڵمانان کەوتنە شوێنیان لێیان دەکوشتن، پاشان هەر چیان لێ مایەوە بە دیلیان گرتن لەسەرووی هەمو دیلەکانەوە جای لوزجنانی پاشای بەیتولمەقدیس و ئەرناتی پەرپرسی کەرك ودی مونتفورتی پێشڕەوی داویە بوون، ریمۆندی سێیەمیش توانی ڕابکات بۆ میرنشینەکەی خۆی تەرابلوس پاش موسڵمانان لە ریزەکانی خۆیاندا دەروازەیەکیان بۆ کردەوە سەلاحەدین بەشێوەیەکی باش پێشوازی لە دیلەکان کرد و ئاوی فێنکی پێ دان، جای لوزجنان لە ئاوەکەی خواردەوە و ئەوی تری دا بە ئەرنات و ئەویش لێی خواردەوە، سەلاحەدین تووڕە بوو لە پاشان بەیتولمەقدیس و پێی وت دەبوو بۆ

ئاو پێدانی موڵەت لە من وەربگرتایە، پاشان کەوتە ژماردنی تاوانەکانی ئەرنات، پاشان ئەوی لە شمشێرەکەی و وەك بەجێگەیاندنی سوێندکەی کوشتنی، هەروەها فرمانی کرد تا دیلەکانی داویە ئیسبتاریە بکوژرێن چونکە پێشتر خراپە و توندییان لەڕووی موسڵمانان زۆربوو، ئینجا دیلەکانی تری برد بۆ دیمەشق و لەوێ وەکو کۆیلە فرۆشران.

جەنگی حطین کارەساتێکی سەخت و گەورەی جەنگی بوو بۆ سەر خاچپەرستان، چونکە تیایدا گوڵی گەنجێتی و سوارچاکییان ژاکا، ئیبنو لئەثیری مێژوونووسی هاوسەردەم قسەی لەسەر ئەو ڕووداوە دەکات و دەڵێت: (هەرکەس کوژراوەکانی بدیبایەوە وای دەزانی هیچ بەدیل نەگێراون، هەرکەسیش دیلەکانی بدیبایە وای دەزانی هیچ کوژراوێك نیە).[1]

بیرمان نەچێت لەوبارەیەوە گێڕانەوەیەکی بەتامیش باس بکەین کە ئیبنولئەثیر لەسەر زمانی میر ئەفزەلی کوڕی سەلاحەدین لە وەسفی جەنگی حطین دەیگێڕێتەوە کە خۆی لەوێ بینیویەتی دەڵێت: لەو ڕیزەدا من لە پاڵ باوکمدا بوون، ئەمە یەکەم دیمەن بوو کە لە ژیانمدا دیومە، کاتێك پاشای فرەنج بەرەو لوتکەی تەپەکە(قرون حطین)پاشە کشەی کرد لە بەرزایی لوتکەکەوە چادرە سوورەکەی خۆی هەڵدا، سوارەکانی هەڵمەتێکی سەختیان بردە سەر موسڵمانان و تا گەیاندنیانەوە باوکم، منیش سەریرم کرد بێهوایی ڕووی تێدەکرد و ڕەنگی گۆڕا و ڕیشی خۆی گرت و چوویە پێشەوە و هاواری دەکرد، شەتیان درۆی کرد!!

دەڵێت: پاشان موسڵمانان گەڕانەوە و بەسەر دوژمندا سەرکەوتن و دوژمن بەرەو تەپەکەی ڕوویان وەرچەرخاند، ئەو کات دەمدی فرەنجەکان ڕایاندەکرد، منیش بەخۆشحالیەوە هاوارم کرد شکاندنمان، بەڵام ئەوان جارێکی تر گەڕانەوە و سەربازانی ئێمەیان تا لای باوکم ڕاوە دوونا، ئینجا باوکم گەڕایەوە و وەك جاری یەکەم هاواری کرد: (فشار لەسەر شەتیانی درۆزن دروست بکەن و لێی دەن)ئینجا

---

١ـ(أبن الأثير: الكامل في التأنخ ج١١ ص٢٢٤).

موسڵمانان هێرشیان بردە سەر فرەنجەکان و پاڵیان پێوەنا تا بەرزایی لوتکەکە، منیش جارێکی تر هاوارم کرد شکاندنمان، باوکم لای کردەوە بەلامدا و وتی: (بێدەنگ بە نەمانشکاندون تا ئەو چادرە نەخەین)کاتێك ئەمەی پێ دەوتم دیتم چادرەکە سەرو ژێربوو، ئینجا باوکم لە ئەسپەکەی دابەزی و سوجدەیەکی سوپای بۆ خوای گەورە برد و لە خۆشیدا دەستیکرد بە گریان.[1]

دوای ئەو سەرکەوتنە یەکلاکەرەوەیە سەلاحەدین بۆ فەتحکردنی شارە خاچپەرستیەکان سەختیەکی وای بەدی نەکرد، هەڵسوکەوتی جوانیشی لەگەڵ خەڵکی ئەو شارانە دا یارمەتی دا، نموونەی ئەوەیش ئەوە بوو دوای فەتحکردنی تەبەریە لەگەڵ ژنە سەرکردە ئەرشیفای خێزانی ریموسی سێیەم هەڵسوکەوتێکی بەڕێزانەی نواند و دەرفەتی پێدا تا بە ماڵو سامانی و دەوروبەرکەیەوە بچێت بۆ تەرابلوس.

خاچپەرستان وایان پێشبینی دەکرد سەلاحەدین یەکەم جار بچێت بۆ قودس، بەڵام ئەو بەوردبینی خۆی پێ وابوو بەو شارە کەناراویانە دەست پێبکات کە خاچپەرستان بەنشینگەی سەرەکی خۆیان لە ڕۆژئاوای ئەوروپاوە دەبەستنەوە تا لەناوخۆی شامدا گەمارۆیان بدات وەیپڕایی ئەوەی شارە کەناراویەکان پەیوەندی دەریای نێوان میسر و شامی بۆ ئاسان دەکات، لەسەردەمی ئەم بنەرەتە سەلاحەدین دەستیگرت بەسەر عەککاو یافاو حسیدا و بەیروت و جوبەیل و حەیفا و عەسقەلان و غەززەداو تەنها شاری(صور)ی لێ یاخیبوو، ئەویش لەبەر پێگەی جوگرافیەکەی لە زۆربەی لاکانیەوە بە ئاو گەمارۆ دراوە.[2] کەشتیگەلی میسریش نەیتوانی لە ڕووی دەریاییەوە لێیَ بدات.

دوای ئەوە سەلاحەدین پێیَ باشبوو بەرەو ناوەوە ڕووەو شاری بەیتولمەقدیس بڕوات و گەمارۆیەکی سەختی لەسەردانا تا ئەوەی خەڵکەکەی ناچاربوون داوای

---

١ـ(أبن الأثير: الكامل في التأريخ ج١ص٥٦٣).

٢ـ(ئەبوو شام بەم جۆرە وەسفی شاری صور دەکات: صور شارێکی قایموو قوڵ و زۆربەی لە دەریادایە(الروضتين: ج٢ص١١٩) هەروەك ئەوەی کەشتیەك بێت).

خۆبەدەستەوەدان بکەن، ئەویش لە شەوی ئیسراء و لە(٢٧) ڕەجەبی ساڵی(٥٨٣ك ـ ١١٨٧ز)دا چوویە ناو بەیتولمەقدیس، ئەو مەرجانەی سەلاحەدین سەپاندی بەسەر شارەکەدا لەوپەڕی لێبوردەیی و ڕێزو سنگ فراوانیدا بوون تا ئاستێك هەندێك لە مێژوو نووسە سەردەمیە خاچپەرستان لەو بارەیەوە دەڵێن: (گەورەی سەلاحەدین هیچ کات وەك ئەوکات دەرنەکەوت کە لە شاری هەمیشە نەمر خۆی دا بەدەستەوە).

لەڕستیدا ئەم دەبڕینە چەند ڕاستی و واتا لەخۆ دەگرێت، چونکە سەلاحەدین سەرکەوتنی خۆی نەقۆستەوە تا بکەوێتە شرۆشیتاڵکردنی دوژمن وەك ئە٦٤٨٠٠ەی لە کاتی داگیرکردنی قودس لە ساڵی(١٠٩٩ز)دا موسڵمانانیان کرد، بەڵکوو سەلاحەدین ڕێ پێدان بە شمەك و ماڵو سامانیانەوە پاش دانی فیدیەیەکی مامناوەند شارەکە بەجێبهێڵن، هەروەك باری هەژارەکانیانی لەبەرچاو گرت و زۆرێکیان بەپێ دانی فیدیە داواکراوەیش کۆچیان کرد، مەسیحیە ڕۆژهەڵاتیەکانیش کە خەڵکی شارەکە بوو، سەلاحەدین دەرفەتی پێدان تا لەگەڵ موسڵماناندا لە شارەکە دا بمێننەوە، بەڵام وەك ئەهلی ذیممە سەرانە بدەن.

سەلاحەدین هەواڵی نەدا کێشایان برووخێنێت بەڵکوو هێشتنیەوە، لەسەروو هەموویشیانەوە کڵێسای(القیامـة)بوو، تەنها ئەو مزگەوتانەی بنیادنایەوە کە کرابوون بە کڵێسا بەتایبەتی مزگەوتی(الأقصى)کە فرەنجەکان کردبوویان بە کڵێسا و سوارەکانی داویان لە بەشێکێدا دابەزاندبوو و ناوی پەرستگای سولەیمانیان لێ نابوو، ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە سەلاحەدین دژبە ئاینی مەسیحی نەجەنگاوە، بەڵکوو لەگەڵ سیاسەتی داگیرکاری ئەو ڕێیدا دەجەنگا.

سەلاحەدین پاش فەتحکردنی قودس درێژەی چالاکی گێڕانەوەی شارەکانی شام لەدەست خاچپەرستان بەجۆرێك تەنها ئەنتاکیە و تەرابلوس و صورو چەند قەڵاو شارێکی بچووکیان لەدەستدا مابوویەوە، سەلاحەدین لە نامەکیدا بۆ تورانشاهی برای لە یەمەن بەمجۆرە ئەو سەرکەوتنە دەردەبڕێت: وڵاتی شام: ﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا

لَغۡوٗا وَلَا تَأۡثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلٗا سَلَٰمٗا سَلَٰمٗا ﴾الواقعه: ٢٥ـ ٢٦.

کەوتنی بەیتولمەقدیس لەدەست خاچپەرستان و نەمانی زۆربەی ناوچەی دەسەڵاتیەکانی خاچپەرستان لە ئەورووپادا بەرپەرچە کردارێکی گەورەی هەبوو و پایەوی مزگێنی هەڵمەتێکی نوێی خاچپەرستی دا و پاشا و فەرمانڕەواکانی هەندا تا ناکۆکیە ناخۆییەکانیان وەلابنێن و لەو هەڵمەتەدا بەشداری بکەن، پاپاگر یگوری هەشتەم سەرکردایەتی ئەو هەڵمەتی دەکرد.

سێ لە گەورە پاشاکانی ئەورووپا چوون بەدەم داواکەیەوە بریتیبوون لە: فردرێکی بربروسای ئیمپراتۆری ئەڵمانیا و[1] ریتشارد دڵ شێری پاشای ئینگلتەرا و فیلیپی دووەم ئۆگستی پاشای فەڕەنسا، ئەو هەڵمەتە بە هەڵمەتی سێیەمی خاچپەرستان دادەنرێت و تا سێ درێژەی کێشا(١١٨٩ـ ١١٩٢ز)کەلە گەورەترین هەڵمەتی خاچپەرستیەکان بوو لەڕووی ژمارەی سوپا و کەشتێگەلەکانیەوە.

بێگومان هەواڵی ئامادەسازی بۆ ئەو هەڵمەتە گەیشتە سەلاحەدین، جا لەو وتارەیدا تورانشاهی برای کە لە یەمەن بوو نارد ئاماژەیەکی ڕاشکاوانە دەبینێن لەبارەی ئەوەی قورستەنتینیە و خاوەن سنوورە مەغریبەکان و ئەوانەی لە ئەسکەندەریە بوون نامەیان بۆ نووسی و ئاگاداریان دەکردەوە کە دوژمن خۆی کۆکردوەتەوەو ئاگری جەنگی هەڵگرساندووە. هەروەها مێژوونووسان ئەوە دەگێڕنەوە، کە هەندێك لەپیاوانی سەلاحەدین ئامۆژگارییان کرد تا عەککا بڕوخێنێت و شورەکانی وێران بکات لەجیاتیدا چەند سەنگەری نشیێکی تێدا دابنێت چونکە پێگەکە مەترسی لەسەر موسڵمانان دەبێت ئەگەر بێتو خاچپەرستان بیگرنە دەست، بەڵام سەحەدین حەزی نەدەکرد ئەو شارە بنیادنراوانە وێران بکات.[2] بۆیە

---

١ـ(ئەو ئیمپراتۆرە لە ڕووبارێك لە نزیك ئەنتاکیە لە کاتی مەلەوانی تیایدا خنکا و شوێنکەی و تەکانی دوای کارەساتە ناچار بوون بگەڕێنەوە بۆ وەلاتەکەیان).

٢ـ (ئەوەی پاڵپشتی دەکات ئەوەیە کە سەحەدین کاتێك دواتر ناچار بوو شاری عەسقەلانی کلیلی ڕێرەوە ڕۆژهەلاتیەکان بەرەو میسر لە ترسی کەوتنە دەستی خاچپەرستان بڕووخێنێت،

ئەو بانگەوازەی وەرنەگرت و وای پێ باشتر بوو توند و تۆڵی عەککا و پیاوەکانی بەرگری لێکردی زیاد بکات و بۆ ئەو کارەیش میر بەهائەدینی قراقوشی ئەسەدی.[1] هەڵبژاردکە پێشری کارگێری شوورەکانی دەوری میسری قاهیرەی دەرکرد و قەلای(جبل المقطم)ی بنیادنا، ئەویش خۆی مامۆستاکانی کارکردن و شمەك و ئاژەڵ و گا و ڕەشەوڵاخەکانی بانگێشت کرد بۆ میسر و بنییادنانی عەککا پێ سپارد و کردی بەبەرپرسی ئەوێ، هەروەها سەربازگەیەکی سەربازانی میسری بانگهێشت کرد تا لەبەرگریکردن لەو سەرسنووره گرنگەدا بەشداری بکەن.

پاشان خاچپەرستان بە کەشتیگەلەکانیاوە یەکلەدوای یەك سالی(٥٨٥ك - ١١٨٩ن)دا دابەزێنە سەر عەککا، ژمارەی کەشتیەکانیان بەڕێژەی زیاتر لە ٥٥٢کەشتی وەلاتە جیا جیاکانی ئەورووپا مەزندە دەکرێت، ئەو ژمارە گەورەیە زۆر زیاتر بوو لەو کەشتیە جەنگیانەی لای سەلاحەدین هەبوو، سەلاحەدین دان بەو زیادیە دەریاییەی دوژمندا لەچەند نامەیەکیدا ناوه وەك دەڵێت: (هەواڵی بێباوەڕان ئەوەیە کە ئەوان ئێستا لە عەککان و بەکەشتیگەلێکی زیاتر لەشەپۆلەکانی چوونەتە ناو کەشتی و ژمارەیەکی بێشومار هاتوون بۆ موسڵمانان... جا ئەگەر موسڵمانان لە وشکانیدا یەکێکیان بکوژن لە دەریادا لەجیاتی ئەویە کەدا هەزارن هەن).[2]

---

منداڵانی خۆی و پیاوانی دەوڵەتەکەی کۆکردنەوەو پیش دەرکردنی بڕیارەکەی متشومڕی لەگەڵ کردن، لەو بارەوە ئەوەی لێ دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی: (سوێند بە خوا ئەگەر هەموو منداڵەکانم بەیەکجار لە دەستبدەم لام خۆشترە لەوەی بەرد بڕوخێنم، بەڵام ئەگەر قەزای خوا وابێت تا بەرژەوەندی موسڵمانان بپارێزم ئیتر چیم لە دەست دێت)(أبو شامة: کتاب الروضتین ج٢ص١٩٢)).

١ـ (شرقراشی ناوێکی تورکیە بەواتای دالێ باڵندە، ئەو مەملوکی ئەسەدەدین شێرکۆبوو، پاشان چوویە خزمەتی سەلاحەدین و بوو بەجێگیری ئەو لە قاهیری لەو کاتەی کە سەلاحەدین لەوێ نەدەبوو. چەند حوکمێکی سەرسوڕهێنەری دەرێتەوە پاڵ لەو کاتەی والی بوو، بەڵام وادیارە ناڕاست و هەڵبەستراون چونکە دەقەکان دادپەروەری و لێهاتوویی ئەو دەسەلمێنن، لە ساڵی(٥٩٧ك)دا کۆچی دوایی کرد).

٢ـ(القلقشندي: صبح الأعشى ج٧ص١٢٧).

سەلاحەدین نەوەستا تا دوژمن بەتەواوەتی بەدەوری عەککا دا خۆی کۆبکاتەوە، بەڵکوو بە پەلە هێرشی بردە سەریان و توانی ڕێگەی بەرەوشارەکەی بکاتەوە تا بە شمەك و چەك و سەربازی فریاگوزاری بۆ بنێرێت، هەروەك پاسەوانێتی بۆ ڕێگری دوژمن لە دەرچوون لە چادرەکانیان ڕێکخست تاتیایدا بەرتەسك بنەوە بە جۆرێك هەرکەس بهاتایەتە دەرەوەیان دەکوژرایان بریندارادەبوو، پارێزەری شارەکەیش لە ژێر چاودێری قراقوشدا پاڵەوانێتی و دلێریەکی وریا خوازانەیان نێشان دا.

بارەکە بەجۆرە بەردە وامبوو و جەنگیش لەسەر عەککا بەڕێوە دەچوو تا ئەوەی تەرمی کوژراوان زیاد بوو و ئاژەڵی هەردوولا لە ناو چوون و سەلاحەدین ناچار بوو لەتاو بۆنی ئەو بارە بگوازێتەوە بۆ ناوچەیەکی ناوخۆیی دوورلە عەککا کە بە خروبە ناسراوە، خاچپەرستان سوودیان لەو پاشەکشەیە وەرگرت و توانییان گەمارۆ بخەنە شارەکە و ڕێی لێ ببڕن.

لێرەدا دەبینین دەریاوانی ئیسلامی ئەرکی پەیوەندیکردنە بە شارەکەی لەلای دەریاییەوە و پێ گەیاندنی فریاگوزاری و خەزێنەو پەیام و نامە و شتی تری گرتە ئەستۆ، ئەبوو شامە دەگێڕێتەوە کە سوڵتان سەلاحەدین لە کۆتاییەکانی ساڵی (٥٨٥ك)داکەشتیگەلی میسری بانگکرد، پەنجا بەشیش بەسەرکردایەتی ـ حسامەدین لوئلوئی سەرکردەی دەریایی چوون، لە ڕێدا لە ئاوەکانی عەککا دا بەرەوڕووی کەشتیکەکانی دوژمن بوویەوە و بەسەریدا سەرکەوت وتێکی شکاند و دووکەشتی پڕ بە مال و سامان و پیاو و سەربازی لێ گرت، هەروەك خۆراك و چەکی پێویستی بەسەربازگە و پارێزەری شارەکە گەیاند.

هێندەی نەبرد پاشا کەمێك ئەو شمەك و فریاگوزاریە تەواو بوو و میر بەهائەدین قرقوەشی والی شارەکە ناچار بوو سەرنوێ پەنابباتەوە بەر سەلاحەدین، کەشتیگەلی میسریش بەردەوام بەرە سەرکەوتوویی بەرەو عەککا ڕێی دەبڕی و فریاگوزاری جۆربەجۆری هەڵگرتبوو، بەندەری خەلیفاشی لە باشوورییەوە کرد بوو بە پەناگەیەك کە لەوکاتەی مەترسی فرەنج لە دەریادا زیادی بکردایە خۆی تێدا دەشاردەوە، زۆرجار هەندێك لە کەشتیەکانی بەهۆی شەپەلی دەریایی وەرزی

زستانەوە بەربەردەکانی کە ناراوەکان دەکەوتن، مەلیك عادل ناچار بوو بە سوپاکانیەوە لە ئاوەکانی حەیفا دا سەنگەر بگرێت تا سەرپەرشتی ئەو کەشتیارانە بکات کە لە میسرەوە بەرەو عەککا دەهاتن.

لە باکووری عەککایشدا شاری بەیروت هەبوو کە بنکەی کەشتیگەلی شامی بوو، لە کەناراوەکانیدا لە شوێنێکدا کە پێی دەوترێت زیب یان(زئب)دەشتەیەکی موسڵمانان هەبوون کە کەشتییان پڕ چەك دەکرد کە دەچوونە ناو عەککاوە و ڕێیان لە فرەنجەکان دەبڕن.[1] سەرکردەی بەیرووت کەناوی عیزەدین سامە بوو لەوکاتەدا چەندین جەنگی لە دەریادا دژ بەو کەشتیانە دوژمن هەبوو کە بەیروتدا بەرەو عەککا تێدەپەڕێن و خۆی و سەربازەکانی دەستکەوتێکی زۆریان گرت کە لە باس نایەت، لەو سەرکردەیە دەگێڕنەوە(سامە یان ئوسامە)کە دەستی بەسەر پێنج کەشتی کەشتیگەلی پاشای ئینگلتەرا(ریتشارد دلێ شێر)دا گرتووە کە پڕبوو لە ئەسپ و پیاو ژن و ماڵو سامان.

هەروەها عیمادی ئەسفاهانی دەگێڕێتەوە وە سوڵتان سەلاحەدین: (فرمانی بە نوێنەرانی ئەسکندرەیە کردووە تا چەند کەشتیەکی گەورە ئامادە بکەن وپڕی بکەن لە شمەکی بە بەهاو خۆراك و بێنێرن بۆ عەککا، بەڵام لەکاتی خوازراوی خۆیان دواکەوتن، ئەمە دانیشتوانی شاری عەککا زیانمەندکرد، سەلاحەدین بیری کردەوە چۆن چارەیەکی خێرای بکات، بۆیە نامەی بۆ عیزەدین سامەی بەرپرسی بەیرووت نووسی، ئەویش کەشتیەکی پڕ شمەکی ئامادەکردو کۆمەڵێکی بە بەرگی فەرەنسیەوە سوارکرد کە ڕیشیان لابرد بوو خۆیان ڕازاندبووەوە و خاچیان پێ بوو و وا لێ کردن وەك ڕوهبان سەیر بکرێن، ئەو(بە طسیە)یش لە فرەنجەکانەوە بەدەستکەوتبوو لە کەناراوی بەیروتدا کەتبوو، سوڵتان فرمانیکرد چاك بکرێتەوە ڕێکو پێك بکرێت، ئینجا پڕ کرا لە گۆشت و چەوری و چوار سە(غرارة غلة)و تیرو نەوتی لێ بارکرد و سەربازگەلێکی موسڵمانی تێدا دانا لەگەڵ چەند مەسیحیەکی

---

١ ـ(أبو شامة: هەمان سەرچاوە: ج٢ص١٨٤پێدەچێت مەبەست بە زیب لە دەقەکەدا ئەو شوێنە بێت کە ئیستا بە(جول الدین)ناسراوەو لەسەر کەناراوی باکووری بەیرووتە).

بەیروت کە دەیانویست خۆیان بخەنە شێوەی دوژمن لە دەریادا و لەگەڵ خۆیاندا چەند بەرازێکیان بردو چەند کەشتیەکی فرەنجەوە بە دەریادا بردنیان و خۆیان تێکەڵ بەوان کردبوو و خۆیشیان بۆ پێگکەیشتن و بایش پاڵی پێوە دەنا و فرەنجەکانیش لە کەشتیەکانیانەوە دەیانوت: (ئەوە ڕێی نیە و وەك تیری دەرچوو دەردەچێت و چوویە سنووره کەوە و بە نیو مانگ گەیێشتە جێ).[1] عیمادی ئەسفەهانی ئەوەیش زیاد دەکات و دەڵێت: (کەمێك پاش ئەوە سێ کەسێتی میسری گەیشتنە ناو دەریا وەك ئەوە سێ بانت بن).[2]

ئەمەیش شەداد گێڕانەوەیەکی تر دەگێڕانەوەکەی عیمادی ئەسفەهانیدا دەگونجێت و لەبارەی گرنگی ئەو ڕۆڵەوە هاتووە کە بەیرووت لە فریاگوزاری عەککا بە شمەك و خۆراك ڕۆڵێ بینیوە و دەڵێت:

سوڵتان سەلاحەدین بە طسەیەکی بەیروت ئامادەکرد بوو و نۆژەنی کردەوە و تیایدا پەنیرو پیاز و مەڕو شتی تری دانا و فرەنجەکانیش بە کەشتیەکانیان لە دەوری عەککادا پاسەوانی عەککا یان دەرکرد تا کەشتی موسڵمانان نەچێتە ئەوێ، خەڵکی ئەوەیش تەواو پێویستیان بە خۆراك و شمەك بوو، بۆیە کۆمەڵێك لە موسڵمانانی بە بەرگی فرەنسیەوە سواری کەشتیەکە کرد و ڕیشیان تاشی و بەرازیان خستە ناو کەشتیەکەو نیشانیان دا تا لە دوورەوە ببینرێن و خاچپیان هەڵواسی و لە دوورەوە بەرەوە شارەکە هاتن تێکەڵ بە کەشتیەکانی دوژمن بوون و لەوێوە بەرەو شارەکە چوون و ئەوانیش ڕێیان پێ گرتن و وتیان دەبینن بەرەو ئەو شارە دەچن(وایان دەزانی ئەوانیش لەوانن)ئەوانیش وتیان: مەگەر شارەکەتان نەگرتووە؟ وتیان: هێشتا شارەکە نەگێڕاوە، ئێمە قەڵاکان بۆ سەربازگەکە دەگێڕینەوەو لە پشتیمانەوە کەشیتەکی فەرەنسیی هەیە لە گەڵیاندا ڕێککەوتووە لە دەریادا و بەرەو سەربازگەکە دێت، ئەوانیش سەیریان کرد و کەشتیەکەیان بینی، ویستیان هۆشیاری بکەنەوە کە چی کەشتیە ئیسلامیە کە بەخێرایی چوو و بایش

---

١ـ (أبو شامة: هەمان سەرچاوە ج٢ص١٦١).

٢ـ (أبو شامة: هەمان سەرچاوە ج٢ص١٦١).

پاڵی پێوەنا تا سوپاس بۆ خوا بە ساغ و سەلامەتی چوویە بەندەری شارەکەو خۆشیەکی گەورە ڕوویدا چونکە خەڵکی پێویستیەکانیان گەیشتە دەست.[1]

لەو جەنگانەدا چەند پاڵەوانێتی دەرکەوتن کە لەوانە باسی پاڵەوانێتی زەفدەعی پێشوو عیسا عەوام دەکەین کە نامە و زێری لەسکی خۆی دەبەست و ماوەیەکی کەم لەشێوەی دوژمندا لە دەریادا مەلەی دەرکرد و لەلایەکی تری بەلەمەکانی دوژمنەوە دەچوویە بەرەو دەرەوە و دەچوویە عەککا و نامەیەکی دەگەیاند بە پیاوانی پارێزەری عەککاو زیرەکەیش وەك خەرجی بۆ موجاهیدان خەرج دەکرا.

ڕۆژێکیان عیسا عەوام چەند کیسێك زێرو نامەی پێ بوو و یەك ساڵ لە دەریادا بوو، ئیتر تووشی شتێك بوو کە لە ناوی برد و کەس هەواڵی لێ نەزانی، ئیتر هەندێك دڵنیا بوون کە لە ناوو چووە هەندێکی تریش وایان زانی بە ماڵو سامانەکەوە ڕایکردووە، پاش چەند ڕۆژێك خەڵك لە کەنار دەریادا بوو و دەریایش مردوویەکی خنکاوی فڕێ دایە بەردەمیان، ئەوانیش پشکنیان دیتیان عیسا عەوامە و زێڕ و نامەکانی لەسکی بەستووە، بەمە خوا لە قسەی ئەو کەسانە پاکی ڕاگرت و سپاردەکەی پێ بەجێگەیاند هەرچەندە مرد بوویش وەك ئەوکاتەی لە ژیاندا بوو ویستی خوا سپاردەکەی گەیاند.[2]

پاڵەوانێتیەکی تر سەرکردە موجاهید جەمالدین موحەممەدی کوڕی ئەرککوز بوو کە کەشتیەکەی لەوانیتر دواکەوت و کەشتیەکانی دوژمن چواردەوریان داو دەریاوانەکانی ناچار بوو خۆیان بخەنە ناو ئاوەکە و دەیانویست خۆیان ڕزگار بکەن، بەڵام سەرکردەکەیان بەردەوام دەجەنگاو بەرگری دەرکرد، خاچپەستان بەڵێنی پەنایان بۆ خستەڕوو ئەگەر بێتو خۆی بدات بە دەستەوە، ئەویش وتی تەنها دەست دەخەمە دەستی پێشڕەوە گەورەکەتانەوە چونکە مەترسی بە مەترسیە، پێشڕەوە گەورەکەیان هات و وای زانی سەرکردەکەی دەستکەوتووە، کەچی جەمالەدین گرتی دەستی کردە ملی و خۆی لێ توندکردەوە و بەرینەداو

١ـ (أبو شامة: هەمان سەرچاوە ج٢ص١٦٠).
٢ـ (أبو شامة: هەمان سەرچاوە ج٢ص١٦٠).

هەردووکیان کەوتنە دەریاکەوە و خنکان و بوونە هاودەم و لەڕێگەی بەهەشت و دۆزەخدا لێك جیابوونەوە.

هەروەها پاڵەوانێتیەکی تر یەعقوبی حەلەبی بوو کە کەشتیەکی گەورەو پڕ بە شمەك و سەرباز بۆ فریاکەوتنی پارێزەری عەککا لە بەیرووتەوە دەرچوو، تا ریتشاردی پاشای ئینگلەرای تووشبوو و بەکەشتیەکانی گەمارۆیدا کە کەشتیەکانی دەگەیشتنە چل کەشتی، موسڵمانان لەگەڵشیدا جەنگان و کەشتیەکی گەورەیان سووتاند وچی تێدابوو سووتان، کاتێك دوژمنان باریان لە کەشتی موسڵمانان توند کردەوە و خەریکبوون دەستی بەسەردابگرن پێشڕەو یە یەعقووب وتی: (سوێند بە خوای گەورە بکوژرین لە عیز زەتمەندیەوەیە، و هیچ لەم کەشتیەیان نادەین بە دەستەوە)پاشان بە پاچ و قوڵنگ لاکانی کەشتیەکەیان تێکشکاند تا کونیانکرد، ئینجا پڕبوو لە ئاوو چی کەس و شمەکی تێدابوو چوونە ژێر دەریاکە و دوژمن دەستی بەسەر دانەگرت.[1]

ئەم دەقانەو شێوەی ئەمانەیش وێنەیەکی ڕوونی ئەو دلێری و قوربانیدانەی دژبە دوژمنیان پێ دەبەخشێت کە دەریاوانی ئیسلامی خستیەگەر لەکاتێکدا دوژمن لەو مەیدانەدا هێزێکی زۆری هەبوو، بۆیە لە لەبەرگریکاریەکەیدا پشتی بە ڕەگەزی کتوپڕی و فیڵکاری بەست لەگەڵ ئەو پەڕی ڕاستی عەزیمەتدا، سەلاحەدین خۆی لە نامەیەکیدا لەو بارەیەوە دەڵێت: (ژمارەی کەشتیەکانیان زۆربوون، بەڵام ئێمە بەعەزیمەتێکی ڕاستترا لەوان بەرەو ڕوویان بووینەوە، دەی ژمارەیەکی کەم بە عەزیمەتی ڕاستەوە زۆریە).[2]

ئەمە سەلاحەدین لە قۆستنەوەی هەردەر فەتێکدا دوو دڵ نەدەنواندکە یارمەتی بدایە بۆ شکاندی دوژمنەکەی لەومەیدانە دەریاییەدا، بۆ نموونە دەگێڕێتەوە لەگەڵ کومەڵێك لە دزە دەریاییە فرەنجەکاندا ڕێککەوتووە تا هەڵمەت ببەنە سەر کەشتیە بازرگانیەکانی دوژمن و چەند کەشتیەکی بچووکی ناسراو بە(براکس).[3]

١ـ (أبن واصل: مفرج الكروب ج٢ص٣٥١).

٢ـ (أبو شامة: هەمان سەرچاوە ج٢ص١٨١ـ ١٨٢).

٣ـ(براكس: کۆکراوەی(بركوس)ە کە کەشتیەکی بچووکە).

دەستگرۆیی کردون.

ئەوانیش سواریان بوون و دەستیانگرت بەسەر چەند کەشتیەکی بازرگاناندا کە هەندێ لە شمەکانیان زیوی ڕەنگ پۆش و نارەنگ پۆشکراو بوون، بە دیلیان گرت و هێنانیان بەردەستی سولتان، سولتانیش هەموو ئەو شتەی پێ بەخشین کە گرتبوویان و خۆی ئامادەنەبوو هیچی لێ هەلبگرێت.

هەروەها سەرچاوەکان دەگێڕنەوە سەلاحەدین لەساڵی(٥٨٦ك ـ ١١٩٠ز)دا لەلایەن خۆیەوە باڵوێزێکی ناردووە کە میر عبدالرەحمانی کوڕی مونقیز بووە تا بچێتە لای یەعقووب مەنسووری موەحیدی خەلیفەی مەغریب و داوای لێبکات بە کەشتیگەل یارمەتی بدات تا نێوانی کەشتیگەلی دوژمن و نێوانی فریاگوزاری مەسیحی لە شام جیا بکاتەوە، لەگەڵ ئەوەی دەوترێت مەنسووری بەرپەرچی داواکەی داوەتەوە چونکە سەلاحەدین لە نامەکەیدا نازناوی ئەمیری باوەڕدارانی[1] لێ نەناوە واتە دانی بەخیلافەتی موەحدینەکاندانەوە ناوە، بەلام هەندێك لە مێژوونووسە مەغریبەکان پێیان وایە مەنسوور سەدو هەشتا کەشتی جەنگی ناردووە بۆ سەلاحەدین تارێ لە خاچپەستان بگرێتلە کەناراوەکانی شام تێنەپەڕن.[2] هەرچۆن بێت تێبنی ئەوە دەکرێت کەشتیگەلی موەحیدەکانی لەوکاتەدا لە ئاوەکانی زەریای ئەتڵەسی لە ڕۆژئاوای ئەندەلوسدا بەرەو ڕووی چەند مەترسیەکی سەختی خاچپەستی بوو بێتەوە چونکە کەشتیگەلی ئەڵمان و ئینگلیزو فلمنك(دانیشتوانی زەویە هۆڵەندیەکان)کە بەرەو شام دەچوون زیاتر لە بەندەرە پورتوگالیەکانەوە دەنیشتنەوە یارمەتی سانشوی یەکەمی پورتوگالیان دەدا تا هێرش بکاتە سەردراسوێ موسڵمانەکەی لە ڕۆژئاوای ئەندەلوسدا، بۆیە کەشتیگەلی موەحیدەکان دەبوو ئیش لەسەر پاراستنی ئەو بەری مەغریبیە ئیسلامیانە بکات لەو مەترسی خاچپەرستیە.[3]

---

١ـ(أبو شامة: هەمان سەرچاوەج٣).

٢ـ(أبو شامە: هەمان سەرچاوە ج٢ص١٧٥ و دواتری).

٣ ـ(أبن عذاری: البیان المغرب في أخبار الأندلس و المغرب ج٤ص١٧٥).

لەسەرەتاکانی ساڵی(١١٩١ن)دا فشاری خاچپەرستان بۆ سەر عککا زیادکردو سکاڵای پارێزەری شارەکە لە درێژی ئەو بارەی و چەرمە سەریەکان و شەونخوونی و بەردەوامی جەنگی شەوو ڕۆژی زیادکردو سەلاحەدین بڕیاریدا لە ڕیگەی کەشتیگەلەکەیەوە دەپارێزەری شاری نیّ بکاتەوە، بەڵام بە هۆی سەختی ئەو بارەی تیایدا بوو و چوار دەوردانی دوژمن لە هەموو لایەکەوە بۆ شارەکە ئەو چالاکیە سەر کەتوو نەبوو، هەریەك لە ئیبن و کەثیر و ئەبوو شامە بەمجۆرە قسەی لەسەر ئەوەدەکەن: (ئەوەی بە گەمارۆکەی ئەزموونی نەبوو ئاگاداری هەواڵێ چاك و زیانی نەبوو چوویە عەککا و ـ لە جیاتی شەست سەرکردەی بیست سەرکردە چووە ئویّ، ئەوانەی چوونە ناو عەککا کەمتربوون لەوانەی چوو بوونەدەر، ئیتر ئاسای بوو ئەگەر ترس و بیم ڕوو بدات و کۆتایی بەبارەکە بێت).[1]

ئەوەی زیاتر بارەکەی خراپتر کرد ئەوە بوو ڕیتساردی پاشای ئینگلتەرا لەهەمان سالدا(١١٩١ن)دوورگەی قوبرسی لە دەست بیزنتیەکان سەند، دواتر قوبرس بوو بە بنکەیەکی نوێی دەریایی بۆ خاچپەرستان و مەڵبەندێکی هەمیشەی بۆ یاریدەیی میرنشیەکانیان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، ئەو ڕووداوە شەپۆلێکی خوشی و گوڕوتینی لە دەروونی خاچپەرستاندا نایەوە و هێرشەکانی خۆیان بۆ سەر عەککا توند کرد و پارێزەری شارەکە ناچار بوو بەهۆی کۆتری نامە بەرەوە کۆتایی هاواری بانگەوازی خۆی ئاراستەی سەلاحەدین بکات و تیایدا هاتووە: (باری بێتوانایمان گەیشتۆتە کۆتا و دوای ئەوە تەنها خۆبەدەستەوەدان هەیە ئێمە لە بەیانیەوە هەشتی مانگی(جەمادی یلئولای ساڵی ٥٨٧ك ـ ١١٩١ن)دا ئەگەر شتێکمان لەگەڵ نەکەن داوای پەنادان و بەدەستەوەدانی شارەکەی دەکەین).

هەموو ئەو هەوڵە سەربازیانەی سەلاحەدین خستنیەگەر بۆ ڕزگار کردنی عەککا سەریان نەگرت، بۆیە قراقریشی سەرکردەی عەککا لە یولیوی ساڵی(١١٩١ن)دا و پاش بەرگریکاریەك نزیکەی دوو ساڵی خایاند ناچار بوو شارەکە بدات بە دەستەوە.

---

١ــ(أبو شامة: هەمان سەرچاوە ج٢ ص١٨٠ــ ١٨٢: سید عاشور: الحرکة الصلیبیةج٢ص٨٦٢).

دوای رووخانی عەککا ناکۆکی کەوتە نێوان فیلیپی دووەمی پاشای فەرەنسا و نێوان ریتشاردی پاشای ئینگلتەرا و فیلیپ ناچار بوو بە تووڕەییەوە زەویە پیرزەکان بە جێبهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ ولاتەکەی خۆی.

پاشا ریتشاردیش بەرەو باشووری درێژەی بە کشانەکەی خۆی داو بە کەنار دەریادا چوو و کە کەشتێگەلەکەیشی بە دەریادا دەچوو، توانی دەستبگرێت بە سەر کەناراوای فەلەستیندا هەر لە عەککا تا یافا، پاشان بەرەو باشوور بەرەو عەسقەلان، داکەوت، سەلاحەدین ترسا خاچپەرستان بەرەو میسریش بێن، بە تایبەتی،کە ریتشاردی پاشای ئینگلتەرا چەندین جار بەڕاشکاوانە دەیوت چەندین و شتری بەدەست خستبوو و ئەو ئەنجامەیشی نیشان دابوو، سەلاحەدین ناچار بوو شاری عەسقەلان وێران بکات، بەمە خاچپەرستانی لەو بنکەی دەریاییە بێبەشکردکە دەکرا بۆ هێرشبردنە سەر میسر بیقۆزنەوە وەك چۆن دوای ئەوەی پێشتر لە سالّی(١١٥٣ز)دا و لە سەردەمی فاتیمیەکاندا کەوتبوویە دەستیان، بەوجۆرە سەلاحەدین توانی بەو کارەی کلیلی رێی رۆژهەلأت بەرەو میسر بپارێزێت.

ریتشارد دلّ شێر هەولّێدا بەتیولمەقدیس بگێرێتەوە، بەلاّم بەتەواوەتی شکستی خواردو ناچاربوو لە نۆڤەمبەری سالّی(١١٩٢ز)دا ریککەوتنامەی(رەملە)لەگەلّ سەلاحەدیندا ببەستێت کە گرنگترین مەرجەکانی بریتیوون لەوەی خاچپەرستان پارێزگاری بە شارە کەناراویەکان صورتا یافا بکەن و بەتیولمەقدیس لەژێر دەسەلاّتی ئیسلامیدا بهێنێتەوە بەمەرجێك رێ بە حاجیە مەسیحیەکان بدرێت بۆ حەج بچن بۆ ئەوێ بەبێ ئەوەی بەرامبەر بەوە داوای هیچ باجێك بکرێت.

سەلاحەدین دوای ئەو ئاگربەستە کەوتە رزگارکردنی هاودەمە بەدیلگیراوەکانی، لەوانە باسی بەهائەدین قراقرشی والی پێشووی عەککا دەکەین کە سولّتان مژدەی بەلّێنی چاکەی پێدا.[1] هەروەها سەلاحەدین گرنگیدا بەگەڕان بەناو کۆمەلّێك لەسەر سنوورە شامیەکاندا و سەردانی صیداو دواتر بەیروتی کرد و عیزەدین سامەی والی

---

١- (أبو شامة: هەمان سەرچاوە ج٢ص٢٠٧).

ئەوێ لە شەواڵی ساڵی٥٨٨ کوچیدا پێشوازی لێکرد.[١]

سەلاحەدین دوای ئەوە ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ دیمەشق و لەوێ لە ساڵی دواتر دا(٥٨٩ك - ١١٩٣ز). مەرگ ها تەڕێی و لەوێ بەو شمشێرەیەوە کە لە جیهاد کردنیدا پێی بوو بە خاك سپێردرا تا ببێتە بەڵگەو بیانووی بۆ بەهەشت.[٢]

سەلاحەدین لەو سەرکردە کەمانە بوو چەکی تری دەریاییان لە جیهادی خاچپەرستادرا پاراست و ولاتەکەی سەلامەت و دڵنیاکرد. ئەو گفتگۆیەی لە نێوان قازی فازیلی وەزیریدا بەڕێوە چوو وێنەیەکی راستگۆیانەی کڵپەی دەروونی سەلاحەدینمان لە چەند هەستێکی باڵای بەرەو جیهادی دەریایی چووندا پێدە بەخشێت، قازی فازیل دەڵێت: (وا بۆ سوڵتان هاتە رێ کە لە ذیلقەعدە ساڵی(٥٨٤ك)دا بەناوی شارە کەناراوەیەکاندا بگەڕێت و باریان رێکبخات، پێکەوە بە کەناراودا لە عەسقەلانەوە تا عەککا چووین، کاتێش لەوپەڕی زستاندا بوو دەریایش)شەپۆلێ توندی دەدا وەك شاخەکان، وەك خوا دەفەرموێت من تازە دەریام دیبوو بۆیە دەریا لەبەر چاوم سەخت و گەورە بوو تاوام دەزانی کەسێکی بە توانایێم بلێت ئەگەر یەك میل بڕۆیتە ناو دەریاوە هەموو دنیات پێ دەدەم شتی وام نەکرد، ترسم لەو کەسە بوو بۆ بەدەستهێنانی دیناریان درهەمێك دەچێتە ناو دەریاوەو ئەو کەسەم پێ باشبوو کە چوونە ناو دەریای ناوێت، ئەمە هەمووی مەترسیەك بوو بۆ من لەبەر سەختی ئەو باوڕە باو جووڵە وشەپۆلێ دەریا کە دەمدی، لەم کاتەدا سەلاحەدین لای کردەوە بەلامداو لەبارەی خۆیەوە وتی: (هەر کاتی خوای گەورە فەتحکردنی بەشەکانی تری کەناراوەکانم بۆ ئاسان بکات وڵات دابەش دەکەم و وەسیەت دەکەم و ماڵئاوایی دەکەم و دەچمە ناو ئەودەریاو دوورگەکانیەوە و شوێنیان دەکەوم تالەسەر زەویدا شوێن و خاکێك نەهێڵمەوە کە بڕوای بە خوا نەبێت یان ئەوەی بمرم). وتنی ئەم قسەیەلای من زۆر گەورە بووە چونکە لەگەڵ ترس خەیاڵی مندانە دەگونجاو پێم ووت: (لە دنیادا دەروونێکی

---

١- (هەمان سەرچاوە: ج٢ص٢٠٧).

٢ - (هەمان سەرچاوە: ج٢ص٢١٥).

بـوێرتری لـە گـەورەم نیـە و کـەس نیـە بـۆ سەرخـستنی ئـاینی خـوا نیـازی لـەو بەهێزتربێت). ئینجا بـۆم گێرایـەوە کەچـی لـە دەروونمـدا هەیە پاشـان وتم: (ئەمـە نیازێکی زۆر جوانە، بەڵام گەورەم سەربازگە دەباتە نـاو دەریاوەکـە خـۆی شـورەی ئیسلامە، شیاونیە خۆی بخاتە مەترسیەوە: (ئەویش ووتی: من پرسیار لە تۆدەکـەم بـەڕێزترین و چـاکترین مردووەکـان کامانـەوە؟ منـیش وتم: مردنـی ڕێـی خـوا، دەی نیازم وایە بە بـەڕێزترین جـۆری مردووەکـان بمـرم، نیـاز و هەسـتی سـەلاحەدین بـۆ جیهادی دەریای بەو جۆرە بوو، دەی لە نێوفـەرمانڕەوایانی سـەردەمی ناوەڕاسـتدا هەستی لەو جۆرە بە کەمی دەبنینین.

لەمەی پێـشووەوە دەبیـنین شـاڵاوی سـێیەمی خاچپەرسـتی نـەیتوانی ئامـانجی سەرەکی خۆی بەجێبهێنێت کە ئەویش گەڕاندنەوەی شوێنە پێرۆزەکانی فەلەسـتین بوو لە دەست موسڵمانان، بەڵام لە هەمان کاتدا توانی دەستبگرێت بەسـەر زۆربـەی کەناراوەکانی شامدا بە بەندەرەکانیشیەوە وەك بەندەر صور و حەیفا و قیـساریە و ئەرسـوف و یافـاوێرای عـەککا دەروازەی سـەرەکی شانیـشنی خاچپەرسـتی بەتیولمەقدیس بوو بۆ سەر دەریای سپی ناوەڕاست، دواتری بوو بە پێگەیەکی ناوی ئەو میرنشینەی دوای ئەوە لە دەست موسڵمانان سەنرا.

لە کۆتایی سەردەمی سەلاحەدیندا پێویستە ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بکـەین کـە ئەویش بریتیە لەوەی دەستەو تاقمی مەمالیکە ئەسەدی و سەلاحی و عادلیەکان لـە هـەموو ئـەو چـالاکیە جەنگییانـەی سـەلاحەدین دژ بـە پاشـایەنی شـام و دژ بـە خاچپەرستان بەرپای دەکردن لـە پـاڵ کـوردو عەرەبەکانـدا بـە شـدارییان دەرکـرد، ئیبن واصل لە کتێبەکەیدا(مفرج الكروب)باسی بەڵام و تووشبوونی ئەو مەمالیکانـە لە کاتی گەمارۆدانی موسڵ لە ساڵی (٥٨٢ك ـ ١١٨٦ز). و هەوڵێکی خاچپەرستان لە شـاری صـور لـە سـاڵی (٥٨٥ك ـ ١١٨٩ز). چـەند ڕووداوێکـی تـردا لـە کـات کـە سـەلاحەدین تیایانـدا هـەواڵی دەدا گـەمارۆ خاچپەرسـتی لەسـەر عـەککا لـە سـاڵی (٥٨٦ك ـ ١١٩٠ز)لاببـات، پاشـان لـەو ناکۆکیانـەی لەگـەڵ خاچپەرسـتان لـە نزیـك قودس لە ساڵی(٥٨٨ك ـ ١١٩٢ز)دا ڕوویدا هەر وەك ئیبن واصل باسی شـەهیدەکانی

مەمالیك لە جەنگە دا دەکات.[1] بەهێزی سەلاحەدین و زۆری شانو شکۆی نەبوویە ڕێگری نەیاری مەمالیکەکانی و لادان لە ڕاوبڕیارەکانی لە چەندا کاتێکدا، نموونەی ئەمەیش ئەوە بوو لەگەڵ سوور بوونی سەلاحەدین نەبوو بۆ قایمو قۆڵکردنی بەیتەلمەقدیس وەك چاوەڕوانیکردنی بۆ هاتنی ریتشارد دڵی شێر بۆ گەمارۆدانی ئەو شارە لە ساڵی(٥٨٨ك ـ ١١٩٢ز)دا مەمالیکە توورکەکان نامەیەکیان بۆ سەلاحەدین نارد و تیایدا وتیان: هیچ بەرژەوەندیەك لەوەدا نیە، چونکە گەمارۆ دەدرێین و تووشی ئەو بارەدەبین کە خەڵکی عەککا تووشی بوون، ئەو کات وەڵاتی ئیسلامە بەیەك جار دەگیرێت، ڕای ئێمە ئەوەیە ماوەیەك لەگەڵ دوژمندا پێکدا بدەن، ئەگەر ویستی خوا وابوو بیانشکێنین ئەوا وەلاتی ئەوان دەگرێن، ئەگەریش سەرنەکەوتین سەربازگەکە پارێزراوە و قودس دەمێنێتەوە، بە بەردەوامی قودسیش وڵاتی ئیسلامی و سەربازانی پارێزراوە... تۆ ئەگەر دەتەوێت لە قودسدا دایکوتین تۆیش لەگەڵماندا بیتەیان هەندێك لە ناو دەچێت تا لای ئەو کۆدەبێتەوە، گەر ناکوردەکان هەواداری توورکەکان نابن و ئەوانیش هەواداری کوردەکان نابن). سەلاحەدین لەبەرگرنگی قودس لەلای بەگوێ ڕای مەمالیکەکانی کرد و ناچار بوو لە داروو دەستەی خۆی لەگەڵیاندا میر ئەمجەدی بەرپرسی بەعلەبەگیان دابنێت، بەمەیش توانی قودس لە دەستی موسڵماناندا بپارێزێت).[2]

جێی گرنگی لەم باسەی پێشووەدا ئەوەیە کە مەمالیکەکان وا دیارە گەیشتوونەتە بەهێزی و زۆریەوە، ئەمە وای لە سەلاحەدین کردووە قسەیان وەربگرێت و ێرای ئەوەی دەچوویە سەرخواستیان، ئەمەیش بەڵگەی لەسەر ئاستی پشت بەستنی دەوڵاتی ئەیبووبی لەیەکەم ڕۆژانێدا بە دەستەو کۆمەڵ مەمالیکە توورکەکان.

مەمالیکە ئەسەدی و سەلاحیەکان چەند خانەو ڕێ و حەمام و بازاڕو خوێندنگەیان هەبوو کە تاماوەیەك ناوی ئەوانە لە خۆ دەگرت وەك ڕێگەی جاولی

---

١ـ(أبن واصل: مفرج الکروب ج١ص٨٩ـ١٠٢،١٠١،٩١،ص١٢٦).

٢ ـ(أبن واصل: هەمان سەرچاوە: ج١ص١٣٠ـ ١٣١).

گەورە لە پاڵ مزگەوتی ئەزهەر دا وەك دانەوە پاڵێ بۆلای میرعیزەدین جاولی ئەسەدی و ڕێگەی وەشاقی لە حارەی زوەیلە وەك دانەوەی پاڵێ بۆ لای حسامەدین سنقر وەشاقی سەلاحی.[١] و حەمامی کەتبەغای ئەسەدی لە هێڵی نێوان دوو کۆشکدا.[٢] حەمامی تەتەر لە ناوچەی دارو لوەزارەی گەورە، تەتەر یەکێك بوو لە مەمالیکەکانی ئەسەدەدین شێرکۆ کە ناوی لەسەر ئەو بەرەیە مایەوە تا وێران بوون و ناوی نرا(وێرانە)(خرائب تتروان)خەڵکی دەستەواژەکەیان گۆڕی و دەیانوت(خرائب تتر)(وێرانەی تەتەر)، لێرەدا حەمامی کەرجیش هەبوو کەدەدرایەوە پاڵ عەلەمەدین کەرجی ئەسەدی کە دەووربەری وێرانەی تەتەربوو، هەروەها قیساریە جهارکس(بینایەکی گەورە بوو کە چەند دووکانێکی تێدابوو)میر فەخردین جەهارکس ناسری[٣] لە ساڵی(٥٩٢ك - ١١٩٦ز)لە قاهیرە بنیادی ناو لەسەرویشیەوە مزگەوتێکی گەورەی بنیاد نا کە گەورەتر و پتەوتریان نەدیوە، جەهارکس خوێندنگەیەکی بە ناوبانگیشی هەبوو بە ناوی خۆیەوە(خوێندنگەی جەهارکس)کە ژمارەیەك لە گەورە زانایان وانەیان تێداوتووەتەوە لە وانە قازی تەقیەدین موحەمەد کوڕی عەبدو للەتیف سەبکی[٤] شافیعی کۆچکردوو لە ساڵی(٧٤٤ك - ١٣٤٤ز)، هەروەها خوێندنگەی ئەزکەشی کەمیر ئەیازی کوجی ئەسەدی لە قاهیرە بنیادی نا، خوێندنگەی(مەسروریە)کە تایبەتمەندانی مەسرور

---

١ـ(المقريزي: الخطط).

٢ ـ(مەبەست بە دوو کۆشکی گەورەی ڕۆژهەلاتی و کۆشکی ڕۆژئاواییە لەسەردەمی خەلیفە فاتیمیەکاندا کە ئیستا بەرامبەر ئەوان خان خەلیلی و مزگەوتی حوسەین و بازاڕی مزگەرانە لە قاهیرە).

٣ـ(مقریزی دەگێڕێتەوە جەهارکس وشەیەکی فارییە بە واتای چوار کەس دێت، لە کاتێکدا ئەبو شامە دەڵێت وشەی جهارکس بە واتای ئەوە دێت بە چوار سەد دینار کڕراوە، بەلام عتومەر دەڵێت جهارکس و حرکس و شرکس دەستەیەك بوون لە باکووردگا وەك ڕووس لە شانیشنی توران).

٤ـ(باوکی تاجەدین عەبدولوەهابی کوڕی تەقیەدین سوبوکیە، نووسەری(طبقات الشافعية الكبرى)کۆچکردووی ٧٧١کۆچیە).

پێشڕەوی کۆڕو بازنەی سەلاحەدین بنیادیان نا، خان سەبیلیش هەیە کە بەهائەدین قراقرش ئەسەدی لە دەرەوەی بابولفەترەح لـە قـاهیرە بـۆ گەشـتیاران بنیـادی نـا، هەروەها(سوبقة البلشون)کە دراوەتەوە پاڵ مـیر سـنقر بلـشونی سـەلاحی، ئەمـەو لەگەڵ چەند دامەزراوەیەکی جۆراو جۆردا ئەگـەر هـەر واتایـەك بـدەی ئـەوا بەڵگـەی ڕێژەی ئەو قەڵـەمڕەوو زۆریـە یەکـە کـە مەمالیکەیەکەمـەکانی ئەیبوویـیەکانی پێـی گەیشتون.

## *سـولتان عـادل سـەیفەدینی ئـەییووبی( ٥٩٦ــــ ٦١٥ك / ١١٩٩ــ١٢١٨ك ):

کۆچی دوایی سەلاحەدین لە ساڵی (٥٨٩ك ـ ١١٩٣ن)دابوو بەهۆی ڕوودانـی چـەند ناکۆکیەکانی لـە نێـوان منـداڵانی خێزانـی ئەییوبیـدا ئەمـەیش بـە ڕەنگاربوونـەوەی ئیسلامی بەشێوەیەکی لاوازکرد، پاشـای قـوبرس عمـوری لوزجنـان ئـەو دەرفەتـەی قۆستەوەو بە کەشـتیگەل سـەربازەکانیەوە هێرشـی بـردە سـەر شـاری بـەیرووت و لەساڵی (٥٩٣ك ـ ١١٩٧ن)دا دەستی بەسەرداگرت.

ئەمە دوای ئـەوەی عیـزەدین سـامەی بـەر پرسـی شـارەکە بـەبێ هـیچ جـەنگ و بەرگریکاریـەك چـۆڵێ کـرد، ئـەو کـارە زۆر کەسـی تـووڕەو بێزارکـرد، وەك شـاعیری سەردەم دەڵێت:

سلم الحـصن ماعليـك ملامـة      مايلام الذى يروم السلامة

فعطاء الحصون من غير حرب      سنة سنها ببيروت سامة

لەگەڵ ئەوەی مەلیك عادل یافا قەرەبووی بەیرووتی کردەوە چـونکە لـە هـەمان سـاڵدا(١١٩٧ن)یافـای گـرت، بـەڵام لەڕاسـتیدا دەوڵـەت ئـەییووبی بـەهۆی ناکۆکیـە ناخۆییەکانەوە تووشی لێکهەڵوەشان بوو بوو.

ڕووداوەکانی نـاکۆکی و دووبـەرەکی نـاوخۆیی نێـوان کـوڕانی خێزانـی ئـەییووبی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕێبازی بەمیراتدانانی دەسـەڵات پـەیڕەو دەرکـرا، بەتایبـەتی بەپـشکی یەکـسانی و نایەکـسانی لـە نێـوان، کـوڕانی بنـەماڵێ دەسـەڵاتدارادا،

دابەشدەکرا، ئەمەیش نەریتی ناو دەوڵەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوو لە سەرەتاکانی سەدەکانی ناوەڕستدا هەروەك دەیشگە ڕێتەوە بۆ سوور بوونی سەلاحەدین لەسەر ئەوەی گرنگترین هەرێمەکانی ناوچەکەی بۆ کوڕەکانی خۆی بێت دوور لە کەسانی تری وەك براکەی لێهاتووترین کەس بوو تا دوای خۆی دەسەڵات بگرێتە دەست کە ئەویش عادل بوو، سەلاحەدین لەسەر چەند ناوچەیەکی دوورو کەناری وەك کەرك و شەو بەك دایناوبوو، یان کەسانی تری لێهاتووی وەك کوڕانی عادل.

هۆکارەکانی دابەشبوون لە نێوی خودی کوڕەکانی سەلاحەدیندا سەرقاڵی کردن، ئەمە دەروازەیەکی سادە و ئاسانی بە عادل دا نێوایاندا، حەوت ساڵ بەسەر مەرگی سەلاحەدیندا تێنەپەڕی تا عادل زۆربەی ئەو کوڕانەی پێچایەوە و لە دەوڵەتێکی یەکبووندا شوێنی هەموویانی گرتەوە، سیاسەتی میکیاڤیلی ئەو کەسە لە دەربرینەیدا بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە لە دەربڕێنەمەترسیدارەیدا کە بۆ سەرکردەکانی دەوڵەتەکەی لە میسر کە لە دەوربەرەبوون پێشکەشی کردو لابردنی مەلیك مەنسووری کوڕی عەزیزی کوڕی سەلاحەدینی بەمە پەردە پۆشکرد: بۆمن ناشیرینیە ئەتابەگی منداڵێك بم لە کاتێکدا من بەتەمەن و لە پێشترم و دەسەڵاتیش بەمیراتگری نیە بەڵکوو بۆ ئەوەیە کە زاڵ و سەرکەوتووبێت.

دەستەو تاقمەکانی مەمالیکە سەلاحی و ئەسەدیەکانی لەو ڕووداوانەدا ڕۆڵێکی گەورەیان بینی، سەلاحیەکان پاڵپشتی عەزیزی کوڕی سەلاحەدین و مەلیك مەنسووری کوڕی بوون و دژبە عادل و خواستەکانی دە جەنگا.

میر فەخردین جەهارکس ناسری پێشڕەوی سەلاحی و مەملووکی ناسر سەلاحەدین بوو، ئەسەدیەکانیش سەیفەدین یاز کوخی لە بنەڕەتدا مەملووکی شێرکۆ گەورەیان بوو، چونکە عادل ڕق و ڕکەبەری نێوان ئەوان و نێوان سەلاحیەکانی قۆستەوەو بە فێڵ و لێزانی و بەڵێنی خەیاڵێلاوی توانی بەلای خۆیاندا ڕاکێشیان بکات جگە لە میر بەهائەدین قراقرشی ئەسەدی کە وەك جێگیرێکی دڵسۆزی مەلیك عەزیز لە قاهیرە دامایەوە، ناکۆکی نێوان ئەو دوو تاقمەتامانەوەی ناکۆکی نێوان پاشا ئەییوبیەکانی مایەوە تا ئەوەی عادل سەرکەوت و ئەییوبیەکانی

سەکخست و ئەسەدیەکان سەرکەوتن و مەلیك عادل بەرگی کردەبەریان و زەوی بۆ بڕینەوە، دەستەی مەمالیکە سەلاحیەکانیش تووشی ئەو لاوازی یەبوون کە تووشی کوڕونەکانی سەلاحەدین بوو، بەمردنی چەند سەرکردەیەکیشیان وەك جهارکس[1] لە(٢٠)ڕەجەبی ساڵی(٦٠٨ك)(دیسەمبری ساڵی١١٢١ن)و عیزەدیین سامە ویڕایی چەوساندنەوەی عادل بۆ ئەو سەرکردانەی تر کە مابوونەوە بەشێوەی دەستگرتن بەسەر قەڵاو زەویەکانیاندا هێندەی تر لاوازیەکەیان زیاتری کرد.

بەمجۆرە عادل توانی سەرلەنوێ دەوڵەتی ئەییووبی لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا یەکبخاتەوە، سوڵتان عادل لە قایمو قۆڵکردنی سەرسنوورەکانی ناوچەکەیدا پێشەنگی بە سەلاحەدینی برایەوە کرد، بە تایبەتی سەرسنوورەکانی(دمیاط)کە لای خاچپەرستان جێی گرنگی و گەورەیی بوو، بۆیە لە ساڵی (١٢١٧ن). دا شاری عادلیەی لە باشووری میاط لەسەربەرەی ڕۆژهەڵاتی نیل دامەزراندو پیری لە کرد لە سەربازو ئامێرە جەنگیەکان تا لەوکاتەوە بوو بەناوچەیەکی جیهادی بۆ پاراستنی دمیاط و ڕێگرتن لە خاچپەرستان بۆ هاتنە ناوی، وێڕای ئەمەیش لە دەروازەی لقی دمیاطەوە بورجێکی بەرزو باڵای لە نێوەندی نیلدا بنیاد نابوو و پڕبوو لە جەنگاوەر بە بورجی(السلسلة)ناسرابوو چونکە دوو زنجیرەی لێوە درێژدەبوویەوە: یەکێکیان لە نیلەوە بەرەو دمیاط لەسەر بەرەی ڕۆژهەڵاتی و ئەوی تریش بەرەو ناوچەی دمیاط دەچوو کە بەرەی ڕۆژئاوای بەرامبەر بە دمیاط بپەڕنەوە، بۆیە ئەو بورجە کلیلی دمیاط، یان قافلێ شارە میسرکان بوو هەروەك مێژوو نووسە هاو چەرخەکان و لە بەجێماوەکانی ئیستایشی ئەو ناوەیەتی کە لە گونی باشووری

---

١ـ(جهارکس لە شاخی سالحیە لە شاخی قاسیون لە باکووری ی ڕۆژئاوای دیمەشق بە خاڵ سپێردراو لەسەر گۆڕە ناوەدارەکەی بە گومەزی شەر کەس ئەم دەستەواژەیە نەخشێنرا: ئەمە گۆڕی پیرۆزی سەرکردەی گەورەی جەنگاوەری موجاهید فەخردین پارێزەری سنوری موسڵمانان بکوژی بێباوەڕان ئیازجهارکس ناسریە کە دوای گەڕانەوەی لە غەززە لە بیستی ڕەجەبی ساڵی شەش سەدو هەشتدا کۆچی دوایی کرد(ڕەحمەتی خوا لەوو لە هەموو مردوانی موسڵمانان بێت)).

دمیاط لەبەرە ڕۆژهەڵاتیەوە نراوەکە(عزبة البرج)ەو لە بەرامبەریدا لە بەرەی ڕۆژئاواوە هاوینە هاواری(رأس البر)هەیە.

ئەو توندو تۆڵیەی دمیاط و سەرسنوورە میسریەکان تر پێی تایبەتمەندبوون سووربوونی خاچپەرستانی بۆ هێرشبردنی سەر میسر نەگۆڕی، بەتایبەتی دوای ئەوە بۆیان دەرکەوت زۆربەی ئەو بەرگریکاریەی سەلاحەدین و عادلی برای نیشانی دەدەن سەرچاوەکەی میسرە.

لەسەر ئەو بنەڕەتە خاچپەرستان کەوتنە پەیڕەوی نیازەیان بۆ هێرشبردنی سەر دمیاط لە ساڵی(٦١٥ك ـ ١٢١٨ز). دا ئەم شاڵاوە لە کتێبەکانی مێژوودا بە شاڵاوی پێنجەمی خاچپەرستی ناسراوە کە لە عەککا کۆبوونەوەو دواتر بە کەشتیگەلێکی گەورەوە بە سەرکردایەتی جان دی بریینی پاشای میرنشنی بەیتولمەقدس بەرەو دمیاط چوون، ئەم پاشایە تەنها سەرسنوورەکانی عەککای لە دەستدا دابوو، نوێنەرێکی پاپا بەناوی کاردینال بلاجیوس لە سەرکردایەتی دابەشداری کرد، لەوکاتەدا مەلیك کامیل موحەممەدی ئەییووبی لەجیاتی سوڵتان عادلی باوکی فەرمانڕەوایی دەکرد، باوکی لە شامدا دژ بە خاچپەرستان جەنگی دەکرد.

پاشان خاچپەرستان لە وشکانی ڕۆژئاوای شاری دمیاط(ناوچەی[1] دمیاط)دابەزین و کەوتنە هێرش بردنە سەر ڕێکبخات و فێڵ و داوی فرەنجەکان بشکێنێ و بورجی(سلسلة)یش بەردەوام بەماوەی چوار مانگ بەرگریکاری دژ بەهەڵمەتە خاچپەرستیەکان دەکرد، لە کۆتاییدا فرەنجەکان دوای ئەوەی لەسەر کەشتیەکی گەورە بورجێکی گەورەیان دروستکرد توانییان بیگرن و زاڵبوون بەسەر بەرگریکاری میسرییان بۆ ئاسان بوو.

---

١ـ(ووشەی جیزە لە زمانەوانیدا بە واتای ناوچەدێت، بۆیە لە جیاتی ئەو ووشە ناوچەمان بەکارهێناوە(وەرگێڕ)).

ئەو هەواڵە خەفەت و پەژارەی لە دەروونی موسڵمانانداناییەوە کاتێك مەلێك عادل کە لە(مرج صفر)لە نزیك دیمەشق بوو بەستنی هەواڵەکەتەواود لگران بوو و بەدەستی دای بەسەرسنگیدا وەك دەبڕینی خەفەت و پەژارە و هەرلەوکاتەوە نەخۆش کەوت و پاش چەند ڕۆژێك کۆچی دوایی کرد.

## سوڵتان کامیل موحەممەد( ٦١٥ ـ ٦٣٥ك / ١٢١٨ ـ ١٢٣٨ز):

مەلیك کامیل دوای مردنی باوکی دەسەڵاتی میسری گرتە دەست و کەوتە دروستکردنی تەنگوچەڵەمە لەبەردەم پێشڕەوی کەشتیگەلی خاچپەرستی لە نیلدا دوایی ئەوەی زنجیرەی بورجی تێکشکاند جا لە جیاتی زنجیرەکامدا پردێکی لە کەشتی بە پانایی میل دروستکرد، بەڵام فرەنجەکان کوشتارێکی توندیان لەسەر کرد توانییان بیبڕن و دژە بکەن ناوی، ئەوکات مەلیك کامیل فرمانیکرد چەند دانەیەك لە کەشتیەکانی لە نیلدا بخەنە ژێر ئاو، بەمەیش ڕێی لە پێشڕەوی باشووریی کەشتیە خاچپەرستیەکان گرت.

فرەنجەکان بەرامبەر بەو کارە لقێکی کۆنی لقەکانی نیلیان هەڵکەندکە بە(الخليج الأزرق)ناسرابوو و لە لقی دمیاطە وە لە شاری(پورە)[1] وە ئاوی بۆ دەهات و دەڕژایە دەریای سپی ناوەڕاست لە باکوورەوە، جا خاچپەرستان ئەو لمەیان لابرد کە داپۆشیبوو، مەبەمە کەشتیەکانیان لەوێوە لە دەریاوە دەچوون بۆ شاری پوورەکە لە بەرەی بەرامبەریەوە پێگەی عادلیە هەبوو کە سوڵتان مالیك لەوێ سەنگەری داکوتا، بەمجۆرە هەردوو سوپا ئەییووبی خاچپەرستی ڕوو بەڕوو وەستان و تەنها ئاوی نیل لە نێوانیاندا هەبوو، چەند جەنگێکی دەریایی لە نێوان هەردوو لادا بەڕێوەچووکە تیایدا میسریەکان توانیان(مرمە)لە کەشتیەکی گەورە بوو

---

١ـ(پورە شارێکی سەربەرەی ڕۆژئاوای باشووری دمیاط و ماسی پوری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، شوێنەکەی ئەمڕۆ گوندی(كفر البطيخ)دەکات، وا دیارە لەبەر زۆری کشتوکاڵ شووتی لە زەویەکەیدا ئەو ناوەی لێ نراوەو ناوی پوورەو نەماوە(محمد رمزي: القاموس الجغرافي البلاد المصرية ج١ ص١٧٦ـ ١٧٩)).

وەی فرەنجەکان بوون، بگرن کە لەسەر سورهێنەرەکانی دنیا بوو و ئاگرتیایداکاری نەدەکرد چونکە بە ئاسن رووپۆشکرابوو و یسماری وای بۆ بەکارهاتبوو کە کەشتی هەریەکەیان بیست و پێنج ڕەتڵ بوو.[1]

بارەکە بەو جۆرە چەند مانگێك بەردەوامبوو و لەو مایەوەدا دمیاط لەدەست دوژمن پارێزراو بوو چونکە نیل نێوان هەردوو لای جیادەکردەوەو بە ئاسنی لە عادلیەوە فریاگوزاری بە دمیاط دەگەیشت، بەڵام خێرا بارودۆخەکە گۆڕاو پیلانێك لەسەربازگەکەی سوڵتاندا ڕوویدا و ئامانجی لابردنی سوڵتان کامیل و دانانی فائیزی برای بوو، کامیل پیلانەکەی بە خێرایی ئاشکرا کردو لە خۆی ترساو شەو سەربازگەکەی بەجێهێشت و بەرەو باشووری بۆ(ئەشموم طناح)کە(أشموح الرمان)ی ئێستایە و مەڵبەندی(دکرنس)ە پاشەکشەی کرد، ئەو کات سەربازان بە پاشەکشەکەی سەرکردەکەیان زانی و ئەوانیش چوون بە دوایدا و چادرو شمەکەکانی خۆیان لە عادلیە بە جێهێشت، خاچپەرستانیش ئەو دەفەتەیان قۆستەوە و نیلەوە بۆ وشکانی ڕۆژهەڵات پەڕینەوەو دەستیانگرت بەسەر سەربازگەی عادلیەو چی خەزێنەی ئەوێدا هەیە، پاشان بەرەو باکوور بۆ شاری دمیاط سەرکەوتن و لە وشکانی و دەریاییەوە لە یەنایریساڵی(١٢١٩ن)دا دایان بەسەریدا.

لەو کاتەدا سوڵتان کامیل توانی بەسەر ئەو پیلانەدا سەرکەوێت کە دژبەو دانرابوو و توانی سەرکردە پیلانگێڕەکانی وەك فائیزی برای و سەرکردەی کوردی عیمادەدینی کوڕی مەشتووب لەوڵاتەکەی دەربکات، دوایی ڕاپەڕی تا لەگەڵ خاچپەرستاندا بجەنگێت و گەمارۆی سەر دمیاط لاببات.

سوڵتان هەوڵیدا پەیوەندی بکات بە خەڵکی دمیاطەوە تا گیانی مەعنەوییان بەرز بکاتەوە و سەربازێکی لە پاسەوانی خۆی ڕاسپارد کە ناوی شەمایل بوو تا ئەو ئەرکەمە ترسیدارە بەجێبگەیەنێت، ئەویش دوور لە چاوی خاچپەرستان کە کەشتیگەلەکانیان نیلیان داپۆشیبوو لەنیلدا مەلەی دەکرد تا بچێت بۆ شاری

[1] ـ(المقريزي: السلوك ج١ق١ص١٩٥).

دمیاط و دڵ و دەروونە خەڵکەکەی بەهێز بکات و بەڵێنی گەیشتنی فریاگوزارییان پێبدات و دواتر بگەڕێتەوە بۆلای سوڵتان و هەواڵی ئەوانی پێ بڵێت.[1]

دمیاط بەردەوام نزیکە ساڵێك بەرگری دەکرد تا ئەوەی برسێتی فشاری بۆ خەڵکەکەی هێناو نەخۆشی و دەردە لەناویاندا بڵاوبوویەوە، بەوە بەرگریکارییان دارماو خاچپەرستان دەستیانگرت بەسەر شارەکەدا ولە نۆڤەمبەری ساڵی(١٢١٩ز)شەعبانی ساڵی(٦١٦ك). دا خراپەو کاو لییان تێدا نایەوە.

لەوکاتەدا سوڵتان کامیل لەسەر ڕووی دەریای ئەشمون تەناح(دەریای بچووکی ئێستا)لەو شوێنەدا سەنگەر گیربوو کە دواتر بە ناوی مەنسوور ناو نرا وەك شانازیەك بەسەر کەوتنیەوە،[2] فریاگوزاریەکان بەردەوام بەسەرکردایەتی براو نزیکان و سەرکردە ئەییووبیەکانەوە لە شامەوە لە پاڵ میسری خەڵکی قاهیرە و میسر و هەموو ناوچەکان و تەنانەت ئەسوانیش پێیان موجاهید جێهانێکی بێشومار کۆبوونەوە.[3]

هەروەها لە ئەوروپاو میرنشینە خاچپەرستیەکان شامەوە فریاگوزاریەکی زۆر گەیشت بە خاچپەرستانی دمیاط، کاتێك ژمارەیان تەواو بوو لە دمیاطە وە بە سوپاکانەوە و کەشتیگەلەکانیاوە چوون و لە باشووردا بەرەو شاری تەلخا لەباکووری سەربازگەی ئیسلامی دابەزین، تەنها شتێك دوو سەربازگەکەی جیادەکردەوە تەنها تۆکەندیان دەریای ئەشموم تەناح بوو، پاشان هەردوو لا جەنگێکی توندی وشکانی و دەرییایان ئەنجامداو دەریاوانی نیلی ئەییووبی لەو جەنگانەدا ڕۆڵێکی گرنگی بینی، مقریزی دەگێڕێتەوە کەشتیگەلی میسری بە

١ـ (المقريزي: السلوك ج١ق١ص١٩٨، سوڵتان دواتر وەك دەستگرۆیی بۆ ئەو پاڵەوانە کرد بەواڵی قاهیرەو خەزێنەی شومایل دەدرێتەوە پاڵ ئەم کەسە).

٢ـ (شاری مەنسوورە دەکەوێتە سەر بەرەی ڕۆژهەلاتی لقی دمیاگ، لە ڕۆژانی سوڵتان کامیلی دامەزرێنەری و کورەکەیدا بەشورەی و ئامێری جەنگی و ساتیر چواردەور درا بوو، دواتر بەرەبەرە گەشەی کرد تا بوو بە یەکێك لە شارە گەورەو ناودارە میسرەکان).

٣ ـ (المقريزي: السلوك ج١ق١ص٢٠٢).

سەرکردایەتی میسر بەدرەدینی کوڕی بەسەد شینی و سورتێنەری گەورەوە لە دەریای(معلة)وە کە لقێکی کۆنەو لەو کاتدا لە نیلی و لە نزیك بەنها دەر دەچوو پێشکەوت، پاشان بۆ جاری دووەم پەیوەندی کرد بە باکووری تەلخاو مەنسوورە وە واتە نزیك مەیدانی جەنگەکەو توانی ڕێ لەو کەشتیانەی خاچپەرستان بگرێت کە لە دمیاتەوە بە خەزێنەوە بۆ مەیدانی جەنگەکە دەهاتن و توانییان دەستبگرن بەسەر ژمارەیەکی زۆری سەربازو چەك و شمەکەکاندا.[1]

مقریزی دەڵێت سوڵتان کامیل دەرفەتی زۆر بوونی نیلی لەو کاتەدا قۆستەوە و فرمانی بە کۆمەڵێك لە موسڵمانەکان کرد تا لە دەریای(معلة)بپەڕنەوە لەو زەویەی کە فرەنجەکان سەنگەریان تێداگرتبوو و لەوێ شوێنێکی گەورەی نیلی بکەنەوە بەمە فرەنجەکان کاتێك دەزانن زۆرێك لەو زەویەدا دادەپۆشێت کە ئەوانی لەسەرەو ڕێی گەڕانەوە بۆ دمیاتیان لێ دەگرێت و بەرەیەکیان نابێت بیگرنە بەر جگەیەك ڕێی تەسکی دەریای ئەشموم تەناح کە کامیل بە ژمارەیەك لەسەربازەکانی دایخستبوو، بەمە خاچپەرستان لە هەموو لاکانەوە گەمارۆدران و زانییان جەنگەکەیان دۆڕاندووە، بۆیە پەنایان برد بۆ داوای ڕیککەوتن و نوێنەریان نارد بۆلای سوڵتان کامیل و داوایان لێکرد پەنایان بدات و ئەوانیش بەبێ هیچ مەرج و بەندێك دمیاط دەدەن، بەدەستەوە، سوڵتانیش ئەو داوایەی قبووڵ کرد، ئەوە دەیتوانی لە ناویان ببات، سوپای ئەییووبی لە ساڵی(١٢٢١ز- ٦١٨ك)دا چوویە ناو دمیاط.[2]

لە سەردەمی سوڵتان کامیلدا شاڵاوی سەرسوڕهێنەری خاچپەرستی بۆ سەر بەیتولمەقدیس بوو کە ئیمپراتۆری ئەڵمانیا و شانشینی هەردوو صەقلیە(صەقلیە و ناپۆلێ)فردرێکی دووەم سەرکردایەتی دەکرد و بە شاڵاوی شەشەم ناسرابوو هەموویشی شەش سەد سەربازبوو ویەك دڵۆپ خوینیشی لێ نەڕژا، ئیمپراتۆر

---

١-(المقريزي: السلوك ج١ق١ص٢٠٣- ٢٠٧).

٢-(مقریزی دەگێڕێتەوە کە سەد کەشتی خاچپەرستی فریاگوزاریەکیان بۆ دمیاگ ناردووە دوای ئەوەی موسڵمانان گرتیانە دەست، ئەمەیش کارێکی خوایی و دواتر بەڵگەی ژیری و دووربینی سیاسی سوڵتان کامیل بووە).

فردرێك گەیشتنە بەستنی پەیمانێك لەگەڵ سولٹان کامیلدا کە لە ساڵی(٦٣٦ك - ١٢٢٩ن). دا بوو بەوپێیە بەبێ جەنگ دەستبگرت بەسەر بەتیولمەقدیسدا.

لە ماوەی ئەو گەشتەدا پەیوەندی نێوان ئیمپرتۆر فردرێك و نێوان سولٹان کامیل و ژمارەیەك لە سەرکردە و گەورە پیاوانی و زانایانی دەوڵەت وەك مەلیك ئەشرەف موسا برای سولٹان کامیل و میر فەخرەدینی کوڕی شەیخی شەیخانی و قازی شەمسەدینی دادەوری سەربازی کە لەوکاتەی ئیمپراتۆر لە شامدا بوو هاودەمی ئیمپراتۆری بوو بەهێزبوو.

پاش ئەوەی ئیمپراتۆری گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی و ڕچێکی سپی بەدیاری نارد بۆ مەلیك ئەشرەف موسا، سولٹان کامیلیش کۆمەڵێك ئاژەڵی نامۆی بۆ نارد لە نێوایاندا فیلێك کە خەڵێکی سەرسام کرد بوو، میسر فەخرەدینی کوڕی شەیخو شیوخیش وەك نوێنەرێکی مەلیك کامیل چوو بۆ لای ئیمپراتۆر و پەیوەندی دۆستایەی بە تینی نێوانیان پتەو بوو، مێژوونووسی حەمەوی مەحمەدی کوری نەزیف لە کتێبەکەیدا(التأريخ المنصوري)ئەوەی بۆ تۆمار کردوین.

(لە مۆسکۆ لە ساڵی١٩٦٠ن).دا کۆمەڵێك نامە بڵاوکرانەوەکە ئیمپراتۆری نارد بوونی بۆ میر فەخرەدین کە چەند زانیاریەکی گرنگیان لە مەڕ هەواڵ و باسی ئیمپراتۆر و دەوڵەتەکەی لە خۆگرتبوو.

فردرێکی دووەم تەواو سەرمەستی زانستە سروشتی و بیرکاری و فەلسەفیەکان بوو و زۆر جار چەند گرفتێکی زانستی دەخرایە بەر دەست و هیچ زانایەکی دەوربەری خۆی بەدی نەدەرکرد کە چارەسەرێکی پێویستی بدەنە دەست، بۆیە دەینارد بۆ سەرکردە موسڵمانە دراو سێکانی تا بیخەنە بەردەستی زاناکانی و لاتەکانیان و وەڵامیان بدەنەوە، لە نموونەی ئەوەیش ئەو پاسو خوا بیرکاری و فەلسەفیانەی ناردنی بۆ مەلیك کامیل و زانای بیرکاری ناسی میسری عەلەمودین قەیسەری ئەسفونی دراوەتەوە پاڵ ئەسفون کە گوندێکی صەعیدە وەڵامی دایەوە و مەلیك کامیل لەگەڵ کتێبێك لە زانستی گەردووندا وەك دیاری بۆ نادر، هەروەها فردرێکی دووەم کۆمەڵە پرسیارێکی فەلسەفی نارد بۆ فەیلەسوفی سوفیگەرای

ئەندەلوسی ئیبن سەبعین کە کۆمەڵە پرسیارێك بوو لە بارەی بوون و گیان و زانستی خوایی و ـ هتد، ئیبن و سەبعین وەڵامی دانەوەو ئەو پرسیارانەیش بە باسو خواسی سەقلی ناسراون چونکە ئیمپراتۆر لە سقلیە نیشتەجێبوو، گەورەی کامیل تەنها لە دەستکەوتە جەنگی و ئاشتیانەدا بەر تەسك نەدەبوویەوە کە لەگەڵ ڕۆژئاوای مەسیحیدا بەدیهێنا، بەڵکوو دەبینین بە پەلە دەهەزار سەربازی لە میسرەوە نارد بۆ بەغداد، ئەمەیش لە ساڵی ٦٣٥ك. دا بوو تا لە سەرداوای خەلیفەی موستەنسیری عەبباسی ڕێ لە تەتارەکان بگرن. ئەو بەو کارەی بۆمان دەردەخات چەند میسر گرنگی بەبەرگریکردنی لە بەغداد داوە، ئەمە بیست ویەك ساڵ پێش ئەوەی بکەوێتە دەست تەتارەکان.[1]

پاشان کامیل لە ساڵی(٦٣٥ك ـ ١٢٣٨ن). دا مرد و عادلی دووەمی کوڕە بچووکی لە جیاتی ئەو کورسی دەسەڵاتی میسری گرتە دەست و صالح ئەییووبی کوڕە گەورەی وەك والی لە وڵاتی فوراتیدا مایەوە، چونکە دایکی عادل ویستی کوڕەکەی ببێت بە سوڵتان، دەی ئەوەی ویستی بۆی هاتە دی، بەڵام مەمالیکە کامیلیەکان بەوەڕازی نەبوون، بۆیە ئەشرەفی و کامیلیەکان ڕێککەوتن و عیزەدین ئەیبەك ئەسمەر پێشڕەویان بوو، بەردەوام وابوون، تا دەرفەتی چوونە دەری عادلی بچووکیان بۆجەنگای لەگەڵ بەرپرسی کەرکی نزیکیدا قۆستەوەو لەبلبیس گرتیان و لە ساڵی(٦٣٥ك ـ١٢٤٠ن)دا. لایانبرد و تەنها ئەو کوردا نەچوون بۆ سەرخستنی عادل کە خێرا لە سەردەستی مەمالیکی کامیلی و ئەشرەفیە توورکەکاندا شکستیان خوارد.[2]

لەم ڕووداوەوە ئاستی سەرکەوتن و زاڵبوونی هێزی تورکی مەملوکی بەسەر هێزی کوردی ناو دەوڵەتی ئەییووبیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

صالح ئەییووب کە مافی دەسەڵات وەرگرتن هەبوو جێدەستی لەو ڕووداوانە بە دووری نەبوو، بەڵام کامیلی و ئەشرەفیەکان کە ڕێککەوتبوون عادلی بچووك لابەن

---

١ـ(المقريزي: السلوك ج١ص٢٥٧ـ ٢٥٨، فريال قطان: الحجاز في ظل الدولة الأيوبية ص٢٥١).
٢ـ(المقريزي: السلوك ج١ص٢٩٤ـ ٢٩٠).

لەسەر ئەو کەسە شوێنی بگرێتەوە ناکۆکییان هەبوو، جا ئەشرەفیەکان دەسەلاتی ئیسماعیلی کوڕی عادلی یەکەم و بەر پرسی دیمەشق و مامی صالح ئەییووبیان پێ باشبوو، لە کاتیکدا کاملیەکان کە شانۆ شاکۆیان بە هێزتربوو صالح ئەییوبیان پێ باشبوو، نا چاو ئەشرەفیەکان ڕازیبوون و صالح ئەییووب لە کۆتاییدا و بانگکرا بۆ میسر تا دەسەلات وەربگرێت، ئەویش لە سالی(٦٣٧ك - ١٢٤٠ز)دا. هاتە میسر.[١] هەرچۆن لێرە داگرنگ ئەوەیە مەمالیکەکان گەیشتنە ئەو هێزەی لە دەولەتی ئەییووبیدا سولتانیان لا دەبردو کەسی تریان دا دەنا.

## سولتان صالح ئەییوب( ٦٣٧- ٦٤٧ك - ١٢٤٠- ١٢٤٩ز):

صالح ئەییووب لە سەرەقای دەسەلات گرتنە دەستی میسرەوە گرنگیدا بە کڕینی زۆری مەمالیکە توورکەکان تا ئاستێك کە هیچ کەسی تر لە بنەماڵەکەی خۆی پێ نەگەیشتبوون و زۆربەی سوپاکەی لە توورکەکان بوو.[٢] دوای ئەوەی پێشتر ڕەگەزی کوردە ئازادەکات هەر لە سەرەتای دەولەتی ئەییووبیەوە بنەڕەتی دەولەت بوون، هۆکاری ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی صالح ئەییووب لەوە دەترسا پاشا ئەییووبیەکان بە سەرکردایەتی ئیسماعیل مامی لە دژی کۆببنەوە و دەترسا کامیلی و ئەشرەفیەکان لێی ڕاپەڕن ئەگەر ئەو دەسەلاتەی دوژمنانی بگاتە دەستیان.[٣] دیارە صالح ئەییووب تەنها لە زیاد کردنی مەمالیکەکاندا نەچووە، بەلکوو ئازاد یەکێ پێ دان کە بەدەستەو تاقمەکانی تری نەدابوو تا ئەوەی خەلکی لە خراپە و ئاژاوە و دەستدرێژییان بۆ سەر مال و گیانی خەلك لێیان بێزاربوون.[٤]

---

١ ـ(أبن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٣٣٧، المقريزي: السلوك ج١ ص٢٩٦).

٢ ـ(أبو الفداء: المختصر في أخبار البشر ج٣ ص١٨٨).

٣ـ(أبن الواصل: مفرج الكروب ص٣٣٩ـ ٣٤٠).

٤ـ(یەکێك لە شاعیرە سەردەمیەکان لەو بارەیەوە دەلێت: أبو المحاسن: النجوم الزاهرە ج٦ص٣١٩):

الصالح أيوب أكثر من ترك بدولته ياشر مجلوب

قدأ خذك الله أيوباً بخلعته فالناس أصبحوا فى ضر أيوب

ئەوکات صالح ئەییوب پیێ باشبوو لە پایتەخت دووریان بخاتەوە، بۆیە لە سالی(٦٣٨ك - ١٢٤١ز). دا قەلایەکی تایبەتی لە دوورگەی(الروضة) لە نزیك (المقیاس)بۆ دورستکردن و لەوێ سەقامیگری کردن و کردی بە مەلبەندی دەسەلاتی خۆی و چەك و ئامێرە جەنگیەکان و شمەك و پێویستی بۆ برد، ئەو مەمالیکە نوییانە بە ناوی مەمالیکی دەریایی صالحی[1] ناسران. مەمالیکی دەریایی وەك مەمالیکەکانی تری پێشوو و دواتریش زۆری شەرمیان لە رەگ و ریشەیان سەرەتا و پێگەیشتنی خۆیان دەکرد. بەلکوو زیاتر شانازییان بەوەوە دەکرد کە مەمالیکن، چونکە پەیوەندی مەملووك بە گەورەکەی لە رۆژهەلاتدا بە شێوەیەکی گشتی زیاتر لەوەی پەیوەندیەکی کۆیلایەتی و بەندایەتی بێت پەیوەندیەکی خێزا نیە، ئەم بنەرەتەیش رێگری ئەوە نەبوو کە پەروەردەیەکی چاك بکرێن و بەچاکترین شێوە بۆ پێشەکانی حکومەت و کارگێری و سوپا ئامادە بکرێن، بەلام سەرچاوە هاو چەرخەکان ئەو رێگەیانەی پەروەردەکردن باس ناکەن کە ئەییوبیەکان بۆ پێگەیاندنی مەمالیکەکان دەیانگرتەبەر، بەلکو لەو بارەیەوە تەنها کتێبەکەی مقریزیمان هەیە کە وەسفی ئەوەمان بۆ دەکات خودی دەولەتی مەملووکی لە دواتردا چۆن پەروەردەی مەملووکی دەکرد. لێرەدا پشتبەستن بە ریبازی پەیرەوی دواتر لەسەر پێشتر دلنیایی دەبەخشێت چونکە دیارە دەولەتی مەملووکی زادەی دەولەتی ئەییووبیەو ریکخستنەکانی لەوەوە وەرگرتووە هیچ ریبەکی دوو دلێ نیە تابلێین ئەو وێنەی مقریزی لە شرۆقەکاری پەروەردەی مەمالیکەکان لەسەردەمی دەولەتی مەملووکیدا هێناویەتی ناکرێت لەو شێوەو وێنەیە بچێتە دەرێ کە ئەییووبیەکان لە پەروەردەکردنی مەملووکەکانیاندا دەیانگرتە بەر، تەنها هێندی نەبێت لێرەدا چەند گۆڕانێکی وردەکاری هەبوون کە خودی سولتانە مەملووکیەکان دایانهێنا، جا ئەگەر بازرگانی مەملووکی بهێنایە

---

لێرەدا مەبەست بە(الضر)لەم ئایەتەی قورئانەوەیە: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾.

١-(المقريزي: الخطط ج٢ ص١١٦ - ٢١٧).

دەیخستە بەردەم سوڵتان و ئەوەیش دەیکڕی و لە ڕیزی هاوڕەگەزەکانیدا دایدە ناو دەیدایە دەست کەسی تایبەتمەندی بە پیشەیی نووسین ئەویش یەکەم شت کە دەبوو فێری بکات قورئانی پیرۆزە بوو، هەر دەستەیەك فیقهناسێکی هەبوو کە هەموو ڕۆژێك دەهات بۆ لایان و فێری قورئان و فێری بوونی نووسین و ڕاهێنانی نەریت و ڕەوشتە شەرعیە ئیسلامیەکان و پەیوەست بوون بە نوێژو زیکرەکانی دەکردن، دواتر نەریتەکەوای لێهات بازرگانان تەنها مەمالیکی بچووکیان دەهێنا، کە دەگەیشتە تەمەنی باڵغ بوون فێری هونەرەکانی جەنگی وەشاندنی تورو وشتی لەو جۆرە دەکرا، هەموو دەستەیەك مامۆستایەکی هەبوو تا دەگەیشتنە ئەوپەڕی فێربوونی ئەوەی پێویستیان پێ بوو، کاتێك تیروڕم هاوێژییان دەکرد نەدەبوو هیچ سەربازو سەرکردەیەك بیاندوێنێت یان لێیان نزك ببێتەوە، ئەو کات دەبرا بۆ خزمەت و پلە بە پلە مووچەی بەرز دەبوویەوە وەتا دەبوو بە یەکێك لەسەرکردەکان، تەنها کەسێك دەگەیشتە ئەو ئاستەکە بەتەواوەتی ڕەوشتی خۆی پاك کردبێتەوە و ڕەوشتی جوانی زۆربێت و تێکەڵ بە گەورەیی ئیسلام بوو بێت و بە دڵ وەریگرتبێت و لە تیرهاوێژی و بەکارهێنانی ڕم و سوار چاکی سەر ئەسپدا بەهێز بووبێت، ئەوانەی چەند خزمەتکارو گەورەیەکی نوێنەرانیان هەبوو کە شگاریەکی پێویست و چاکیان بۆ دەکرا و تاقییان دەکردەوە و لە سەر جووڵە و هەستانەکانی مشتومڕیان لەگەڵ دەکرد، جا ئەگەر یەکێك لەو پەروەردەکەرانی کە فێری قورئانی دەکات یان ئەو نوێنەرەی کە فەرمانی بەسەریەوە هەیە بزانێت تاوانێکی کردووەیان لە ڕێوڕەسمێکدا لایداوە یان ڕەوشتێکی ئایینی و دنیایی وازلێهێناوە، بەرامبەر بەوە بە پێی تاوانەکەی سزای دەدا، گەورەکان مەمالیکەکانیان ڕادەهێنان وە دەیانکردنە سەرکردە گەلێکی موجاهیدی ڕێی خوا وسیاسیەتمەدارانێکی کە لە نیشاندانی جوانیدا تەواو دەچوون و بەرامبەر دەستدرێژی دوورو نزیك دەوەستان و بەر پەرچیان دەدایەوە.[1]

---

١ـ (المقريزي: الخطط ج٢ ص٢١٣ـ ٢١٤).

قلقشندی هۆکاری بە هێزی ئەو نێزامی مەملووکیە دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی پوختەی ڕیکخستنەکانی پیشووی مەملووکی و بەرهەمی ئەزموونەکانیەتی و دەڵێت دەسەڵاتی مەمالیك لە میسر لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو لە هەموو ناوچەیەکی پێشتری خۆیەوە بێت و ڕیگەی ئەویَ بگرێتە بەر تا ئەوەی پاك و پوخت دەکرایەوەو جوانترین پەروەردە دەکرا و هەموو مەمالیکەکانی تری تێدەپەڕاند.[1]

مەمالیکی صالحی نەجمی لە قاهیرەدا چەند خانەو ڕێ و حەمام و خوێندنگەیەکیان لەسەر شێوەی دامەزراوە مەمالیکە ئەسەدی و صەلاحیەکان هەبوو، لەوانەی خوێندنگەی غەزنەوی کە حسامەدین قایمازی صالحی نەجمی بنیادی نا.[2] و خانەی قای بوندو قداری کە میر عەلائەدینی بوندو قداری صالحی نەجمی دایمەزراند.[3]

شەکر سازی میر فارس ئوقطای صالحی نەجمی.[4] و حەمامی ڕۆمی لە یال حارەی برجواندا کە دەدرێتەوە پاڵ میر سنقری ڕۆمی صالحی[5] و... هتد. هەموو ئەمانە بەڵگەی ئەوەی دەوڵەتی ئەییووبی بەر بەرفراوانی مەمالیکەتورکەکانی بەکارهێناوە بە بەڵگەی زۆری ئەو ببناو بنیادانەی ئەو مەمالیکانە دایانمەزراندون.

لە بابەتی مەمالیکی دەریاییدا بابەتێکی ترماوەتەوە کە پێویستی بە ڕاستکردنەوە هەیە ئەویش ئەوەیە کە زۆربەی مێژوو نووسە کۆن و نویکان لەسەر ئەوەیە یەکدەنگ سوڵتان صالح نەجمەدین ئەییووبی یەکەم کەس بووە مەمالیکی دەریایی ڕێکخستووە و یەکەم کەس بووە ئەو ناوەی لێناون لەبەر دەریای نیل کە چواردەوری نشینگەکانی ئەوانی لە دوورگەی(الروضة)دادا بوو، بەڵام ئەو ڕایە لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە بنەڕتێکی ڕاست و دروستی نیە:

---

١ـ (القلشقندي: صبح الأعشى ج٤ ص٦).

٢ـ (المقريزي: الخطط ج٢ص٣٩٠).

٣ـ (هەمان سەرچاوە: ج٢ص٤٢٠).

٤ـ (أبن دقماق: الأنتصار لواسطة عقد الأمصار ج٤ص٤٤).

٥ـ (المقريزي: الخطط ج٢ص٨٣).

یەکەم: مێژوو نووسانی هاوسەردەمی سالّح ئەییووب وەك ئیبن واصل و ئەبوو شامە ئاماژەیان بەوە نەداوە کە نیل بنەڕتێك بێت بۆ وشەی دەریاییەکان. ئەمە کۆمەڵە مێژوونووسێکی دواتری وەك مقریزی و ئەبولمەحاسین هێناویان.[1]

دووەم: دیارە پێشتر فاتیمیەکان دەستەیەك لەسەر بازانیان هەبوون کە بەغوزە دەریاییەکان ناسرابوون، هەروەها هات سولّتان عادلی یەکەمی باپیری صالّح دەستەیەك مەمالیکی هەبوو کە ناوی دەریاییەکانی عادلی لێنا، ئەمەیش بەلّگەی ئەوەیە مەلیك صالّح ئەییووب یەکەم کەس نەبووە ئەو وشەی داهێنا بێت.

سێیەم: فەرزەجی دەگێڕێتەوە نورەدینی عومەری کوڕی ڕەسولی سولّتانی یەمەن کە لە سالّی(٦٤٧)کۆچیدا مردووە)و هاوسەردەمی صالّح ئەییووبی بووە لە میسر، مەمالیکەی دەریایی زۆری هێناوە تا ئەوەی گەیشتنە هەزار سوار و لەسوارچاکی وتێرهاوێژیدا لە مەمالیکەکانی میسری باشتر بوون، ئەو مەمالیکی بچووکیشی هەبوو کە لە ژمارەدا لەوان نزیك بوون و لە بازنەی ئەو و سەربازگەی سەرکردەکانی بەدەربوون.[2]

ئەم دەقە بەلّگەی ئەوەیە وشەی دەریایی لە ولاّتی ئیسلامیدگا زۆربەی بە دوورتر لە دەریایی نیل بەکار هاتووە.

چوارەم: مێژوو نووسە هاوچەرخەکان ناوی فرەنجی ڕۆژئاوای دەریاییان لەو هەندێك لەو دەستەو کۆمەڵەی مەسیحیەکان سەربازیانە ناوەکە ئەورووپاوە و لە کاتی جەنگە خاچپەرستیەکاندا دەهاتن بۆ شام، ئەبوو شامە دەگرێتەوە لە سالّی(٥٩٣ك)دا مەلیك عادل یافای فەتحکردووە.

لەو سەرسوڕهێنەرانەی بیستوومە ئەوەیە لە قەلاّکەیدا چل سواری فرەنجی دەریایی هەبوون، کاتێك توانییان بچنە ناو قەلاّ کەو بیگرن چوونە ناو کلّیساکەی و دەرگاکەیان لەسەر داخستن و بەشمشێرەکانیان کەوتنە لێدانی یەکتری تا ئەوەی

---

١ ـ(محمد مصطفي زيادە: بعد ملاحظات جديدة في تأريخ دولة المماليك، مجلة كلية الآداب القاهرة ١٩٣٦).

٢ـ(الخزرجي: العقود اللؤلؤية في تأريخ الدولة الرسولية ج١ص٨٢).

هەموویان لە ناوچوون، موسڵمانانیش کە دەرگاکەیان شکاند دیتیان فرەنجەکان نین و سەیریان کرد هەموویان کوژراون، مەبەیش سەریان لە حاڵیان سوڕما.[1]

جا ئەگەر دەستەواژەی دەریایی بۆ میسر نوێ نەبێت کاتێك مەلیك صالح ئەییووب دەستە دەریاییەکەی خۆی دامەزراند، بەڵکوو دەستەواژەیەکی گشتی بووە کە موسڵمان و مەسیحیەکانیش نراوە وەك چۆن لە ناو میسرو دەرەوەی میسردا لە پێش سەردەمی صالح ئەییووبدا بەکار دەهات، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر ئەو وشەیە بدەنیەوە پاڵ نیل گومان لە ڕاستیەکەی هەبێت، کۆتا گرفت لەو بارەیەوە ئەوەیە بۆچی ئەو دەستەو کۆمەڵانە بە دەریایی ناو نراون؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەبێت یەکەمجار ئاماژە بە هەڵەی بیرۆ کە بڵاوەبدەن کە پێشتر باسمان کرد کە دەڵێن وشەی دەریایی دەگەڕێتەوە بۆ دەریایی نیل کە چواردەوری نشینگەی دەستەو تاقمی دەریایی صالحی لە دوورگەی(الروضة) دا دا بووە، مێژوو نووسە هاوسەردەمەکانی بە هیچ جۆرێك ئەمەیان باس نەکردووە، وێرای ئەوەی بوونی ئەو ناوە لە سەردەمی فاتیمیەوە لە میسردا بەر پەرچی ئەو بانگە شەیە دەداتەوە.

گومانی ڕاستتر ئەوەیە ئەوانە بۆیە بە دەریایی ناو دەبرێن چونکە لە پشت دەریاکانەوە هاتوون، لە جوانفیك دا هاتووە ئەوانە بە دەریایی یان پیاوانی ئەو دیو ڕووبار ناو دەبرێن.[2] جوانفیل ئەو کەسە بوو کە لە هەڵمەتەکەی لویس نۆیەمدا لەگەڵ مەمالیکی دەریایی صالحیدا جەنگاوە و لای ئەوان بەدیلگیراوە و چیرۆکی خۆی گێڕایەوە بۆیان کە بەهای خۆی هەیە بەو پێیەی کەسێکی هاو سەردەم و شایە تعاڵ بووە، ئەگەر زانیمان مەمالیکە دەریاییەکان لە کاتی ئەییووبی و

---

١ـ(أبو شامة: الذيل علي الروضتين عزت العطاء الحسيني لە ژێر ناو نیشانی(تراجم رجال القرنين السادس و السابع الهجری)بڵاوی کردوەتەوە ص١٠ـ ١١/ ٤٢ـ ١٥١ئەمە و تێبنی ئەوە دەکرێت وشەی(ڕۆئاوای دەریایی)بە(عزت البحرية)بش هاتووە کە بە واتای بێ هاوسەردێت وا بە هاوسەرگیرییان نەکردووە).

.(joinville: history Of.Saint Louis.trjoan evans P.٨٤)ـ٢

مەمالیکەکاندا دەربڕی دەستەیەك لەو کەسە نامۆیانە بوون کە بازاڕەکانی کۆیلەی فرۆشیەوە لەو قەوقازو ئاسیای بچووك و کەناراوەکانی دەریای ڕەش و دواتر دەریایی قرمەوە هێنراون بۆ کەنداوی قوستەنستینیە و لەو پێشەوە بۆ دەریایی ناوەڕاست و لەو وێوە دەبران بۆ بەندەری ئەسکەندەریەیان دمیاط کە بۆ پشتگیری ئەمە دەربڕینەکەی جوانفیل پاڵپشتمانە.[1]

چاکە و فەزاڵ جوانفیل تەنها لەوەو دانیە کە ڕاڤەی وشەی دەریایی کرد بێت کە لمکێنراوە بە دەوڵەتی یەکەمی مەمالیکەکانەوە، بەڵکوو لەوەیش تێپەڕیوە و گەیشتوەتە ئەوەی تۆماری ڕووداوەکانی شاڵاوی حەوتەمی خاچپەرستی دەکات کە بە سەرکردایەتی لویسی نۆیەمی پاشای فەڕەنسا بۆ داگێرکردنی میسر هات.

لەو شاڵاوە دا نرخی مەمالیکی دەریایی و ئەو ڕووداوانەیمان بۆ دەردەکەوێت ڕێخۆشکەر بوون بۆ خۆیان و دەوڵەتەکەیان لە میسرو شام، لەو کاتەی کاروبارو لە میسر و شامدا بۆ صالح ئەییووب جێگێربوو، هەواڵ پێگەیشت شاڵاوێکی خاچپەرستی لە ڕێدایە بەرەو میسرو فرەنسی(واتە پاشای فەڕەنسا کە بە قدیس لویس)ناسرابوو سەرکردەیەتی، ئیبن واصیل و مقریزی دەڵێن هەواڵ ئەو هەڵمەتە لە ڕێگەی ئیمپراتۆر فردریکی دووەمە وەکە هنشتاوفن ئیمپراتۆری ئەڵمانیا و صقلیە بوو دەگەیشتە سوڵتان صالح ئەییووب و نێودراوەکەی بە پۆشاکی بازرگانیەوە چوویە خزمەت سوڵتان صالح ئەییووب و بینی سوڵتان لە دیمەشقەو نەخۆشە.[2]

ئەگەر فتحکردنی بەیتولمەقدیس لە ڕۆژانی سەلاحەدین لە ساڵی(٥٨٣ك - ١١٨٧ن).دا وایکرد هەڵمەتی خاچپەرستی ناسراو بە هەڵمەتی خاچپەرستی سێیەم سەر هەڵبدات، ئەوا کەوتنی لە ساڵی(٦٤٢ك ـ ١٢٤٤ن).دا لە سەردەستی مەلیك صالح ئەییووب جێگیرەکا خوارزمیەکانی ئەو هۆکارە بوو کە بوویە هۆی هەڵمەتی

---

١ـ(القلقشندي: صبح الأعشي ج٤ص٤٩٦).

٢ـ(أبن واصل: مفرج الكروب ج١ص١٢١، المقريزى السلوك ج١ص٣٣١ حشيه٢).

خاچپەرستی ناسراو بە هەڵمەتی خاچپەرستی حەوتەم بەسەر کردایەتی لویس نۆیەم بۆ سەر میسر.[١]

چونکە هەواڵی ئەو شکستانەی تووشی خاچپەرستان بوو لە جەنگی بەیتولمەقدیسدا و بە دەستەوەیان دا و ئەو کارە توندو تیژیانەی خوارزمیەکان ئەنجامیاندا بەو پەڕی زیادەڕەوییەوە گەیشتە ئەوروپا، دەی هەر ئەو هەواڵانەی گیانی خاچپەرستانی لە دڵ و دەروونی لویس نۆیەمدا هەژاند.

بەڵام ئەم هەڵمەتە لە هەڵمەتی سێیەم و هەڵمەتەکانی تری خاچپەرستی بە گشتی جیاوازە لەو بوارەیدا کە هەموو ئەورپیەکانی لە خۆی نەدەگرت، بەڵکو فەڕەنسی بوو زۆرینەیان لە فەرەنسیەکان بوو چونکە ئەڵمانیا و ئیتالیا لەو کاتەدا سەر قاڵی ململانێی ئیمپراتۆری پایە بوون و لویسی نۆیەمیش نەیتوانی ناکۆکی نێوان پاپا ئەنوسنتی چوارەم ئیمپرتۆری فردێکی دووەم لاببات. جا لە ئەنجومەنی ئاایینی لیۆتدا کە ئەو ئەنجومەنە بوو لە ساڵی(١٢٤٨ك ـ ٦٤٦ن). دا بەسترا تا بڕواننە باری هەواڵی ڕۆژهەلات کە بە پاپیە وی گەیشتبوو و تیایدا هەڵمەت بەسەرکردایەتی لویسی نۆیەم ڕاگەنرا و پاپا بانگەوازی بۆ هەڵمەتێك کرد کە ناوی نا

---

١ـ(لە ڕاستی دا گێڕانەوەی بەیتولمەدیس یەکەمجار لە سەر دەستی مالیك ناصر داودی کوڕی مەلیك عەظیمی کوڕی عادلی بەرپرسی کەرك لە ساڵی(٢٤٠ن)دا داواتە دوای دوانزە ساڵ لەوەی کامیل دایە دەست فردرێکی دووەم ڕوویدا جەمالەدینی کوڕی مەترووحی شاعیری میسری بەمجۆرە وەسفی دەكات:

المسجد الأقصي له عادة    سارت فسارت مثلاً سائرا
إذا غدا به الكفر مستوطنا    أن يبعث الله له ناصرا

فناصر طهره أولاً    وناصر طهره أخرا)، بەڵام خاچپەرستان جارێکی تر لە ساڵی(١٢٤٢ن)دا بە یارمەتی خودی ناسرا داود داگرتیانەوە کاتێك لەگەڵ ناصرداود دژ بە مەلیك صالح ئەییووب هاوپەیمانییان بەست، ئەویش ناچار بوو پەنا ببات بۆلای بەرکەخانی خزمی و سەربازی خوارزمیەکانی و توانییان لە غەززە هێزەی هاوپەیمانەکان بشکێنن و لە ساڵی(١٢٤٤ن). دا بەیتولمەقدیس بگێڕنەوە وەك دەقەکەی دا هاتووە.

هەڵمەتی خاچپەرستی دژ بە فردریکی دووەم بەو پێیە لە کەنیسە دەرچوو بوو لە سۆز و ڕەحمەت کەنیسە بێبەشبوو.

ئەو بیرۆکە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی دوانزەی زاییندا لە ئەورووپای مەسیحیدا زاڵبوو ئەوە بوو تا میسر بەو هێزەو توانایەوە بمێنێتەوە پرۆژەی خاچپەرستیەکان شام شکستخواردوو سەرنەکەوتوون، هەر دەبێت بەرەی ئسلامی لەو بنکە گرنگە جەنگیە بێبەش بکرێت. بنەڕەتی ئەو بیرۆکە کە عەمروی یەکەمی بەرپرسی ئەو شڵاوە ناسراوا نەبووە کە لە میسردا ئاسانکاری بۆ دەوڵەتی ئەییووبی کردو ئەو هەڵمەتە سەرکەوتووەی کە ساڵی(٦١٥ك ـ ١٢١٨ز). دا و لە سەردەمی سوڵتان کامیلدا کەناراوە میسریەکانی نەبڕی، هەر وەك لویسی نۆیەم کردی بە پێناوێك بۆ بەدیهێنانی خواست نیازە خاچپەرستیەکانی، ئەم ڕاستیە لە ئیبن واصسیلی مێژوو نووس شاراوە نەبوو کاتێك دەڵێت:. پاشای فەرەنسا ریدافرانس وای دانابوو بەیتولمەقدیس بۆ فرەنجەکان بگێڕێتەوە... دەیشیزانی ئەم کارە تەنها بەگراتنی ناوەچەی میسریەکان دەبێت.

پاشان کەشتیگەلی فەرەنسی لە بەندەری مرسیلیا و لە پاییزی ساڵی١٢٤٨ز دا چوونە دەریا بەرەو دوورگەی قوبروس کە لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵی لوزجنانlusignanدابوو، ئەوان مەسیحی لاتینی بوون، لێرەدا لویسی نۆیەم لە ماوەی زستاندا مایەوەو تیایدا چەند پەیوندیەکی لەگەڵ مەغۆلدا ئەنجامدا لە پێناو ئەوەی بیانکات بە مەسیحی و سوود لە هەوڵەکانیان وەربگرێت بۆ گەمارۆدانی جیهانی ئیسلامی لە ڕۆژهەلاتی نزمدا[1] و لە کۆتاییدا هەڵمەتە کە لە قوبرس و لە مایۆی ساڵی١٢٤٩ز. دا بەرەو میسر کەوتەڕێ دوای ئەوەی ژمارەی سەربازەکانی گەیشتە نزیکەی پەنجا هەزار جەنگاوەر، پاشا دا شارل دی ئەنجوای برای ڕۆبرت دی ئەرتوایشی لەگەڵدا بوو.

---

١ـ (خانی مەغۆلی ئەو پلانەی جێبەجێ نەکرد، تا ئەوەی مەلیك لویسی نۆیەم دواتر لە چاك ڕەفتاری خۆی لەگەڵ نێردراوەکانیدا پەشیمانی خۆی دەبڕی).

مەلیك ساڵح ئەییووبی زانی دمیاط دواتر دەبێتە ناوچەی لە باری خاچپەرستان لە کاتی هێرش هێنانە سەر میسردا، بۆیە بە سوپاکانیەوە لە باکووری دمیاط و لە شاری ئەشموم تەناح کە ئەشموم ڕومانی ئێستایە سەنگەری گرت و فرمانیکرد دمیاط قایموقۆڵ بکەرەو پیری بکەو لە خەزێنە و چەك و پارێزەرێکی عەرەبی کەنانەی تێدا دانا،هەروەها بە سەرکردایەتی میر فەخرەدین یوسف سوپایەکی بۆ ناردو فرمانی کرد لە کەناراوی ڕۆژئاوای ئەوشێدا دابەزن تا نەهڵێن دوژمن بگاتە کەناراوەوە. لە بەرامبەر شارەکەدا دا دابەزی، بەمە نێوانی موسڵمانان و دۆژمن نیل بوو.

پاشان کەشتیگەلی میسر گەیشتە ئاوە میسریەکان، ئەمەیش لە ٤ی یۆنیۆی ساڵی١٢٤٩ز دابوو، بۆ ڕۆژی دواتر خاچپەرستان دابەزینە و شکانی ڕۆژئاوای نیل و لەوێ لەگەڵ موسڵماناندا چەند دەستەو یەخە بوونێك ڕوویداو دواتر میر فەخرەدین بە سوپاکانی و بەپارێزەری شارەکە کەیشەوە بەرەو سەر بازگەی سوڵتانی لە ئەشموم طناح پاشەکشەی کردو خەڵکی دمیاط لەو ئەنجامەدا ترس و بیم دایگرتن و دەرچوون و ئەو پردی کەشتیانەیان بەجێهێشت کە وشکانی ڕۆئاوای دمیاطی پێکدەگەیاند، خاچپەرستانیش لێی پەڕینەوە و بە ئاسانی شارەکەیان دگاگیرکرد. سوڵتان ئەییووب لەو تووڕە بیدا کلپەی دەسەند کاتێك ئەو هەواڵەی بیست، بۆیە فرمانی کرد تا ئەو کەنانیانە لە خاچ بدرێن کە لە دمیاط هەڵگەڕابوونەوە و بەبێ جەنگ دابوویان بەدەستەوە، هەروەك، هەروەك میسر فەخرەدین تووڕە بوو و هێندە. قسەی بەرەوڕوو کرد تا هەندێك لەسەرکردەکان ویستیان سوڵتان بکوژی، بەڵام میر فەخرەدین ئامۆژگاری کردن تا لەسەر خۆبن چونکە سوڵتان نەخۆشیەکە مەترسیداری هەیە و مەرگی نزیك بوەتەوە.

جوانفیلی مێژوو نووسی فەڕەنسی هاو سەردەم ئەو پاشەکیشەیە بەوە لێکدەداتەوە کە میر فەخرەدین سێ جار بەکۆتری باڵدار هەواڵ بۆ سوڵتان ناردووەو هەواڵ دابەزینی فرەنجەکانی بۆ سەروشکانی پێداوە، بەڵام سوڵتان وەڵامێکی بۆنەناردەوە، ئەویش وای زانی سوڵتان مردووە، بۆیە بە پەلە شوێنەکەی

بەجێهێشت لە قسەکەی ئیبن و واصل و مقریزیەوە تێدەگەین میر فەخرەدین خواستنی گرتنە دەستی دەلاسەتی میسری بۆ خۆی هەبوو(ئەوە دەیویست بگاتە پاشایەتی)جا پێدەچێت پاشەکشەکەی ڕێگەیەك بوو بێت بۆبەدیهێنانی نیازەکەی و باوەڕی وابوو سوڵتان مردووە.

هەرچۆن بێت سوڵتان لەبەردەم ئەو ڕووداواندا نا چار بوو بەسەربازگەکەیەوە بەرەو شاری مەنسوورە بڕوات و لەکۆشکی سوڵتان لەسەر کەناراوی نیل دابەزی و کەشتیە جەنگیەکانی ناو نیلی بەرەو ڕووی شارەکە سەنگەر گیرکرد، هەروەك کۆمەڵێ عەرەب و سەربازە خۆبەخشەکان بەرەو ئەو بنکە نوێنە دەچوون تا بەرەو ڕووی ئەو مەترسیە سەختی و نزیك ببنەوە.

چالاکیە جەنگیەکان لەو ماوەیەدا تەنها چەند شاڵاوێك بوون کە خۆبەخشە موسڵمانەکان دەیا نبردە سەر سەربازگەکەکانی خاچپەرستان و هەرکەسێکیان دەفڕاندن کە دەستیان پێی بگەیشتایە، جا ئەگەر فرەنجەکان پێیان بزانییایەن خۆیان دەخستە ناو ئاوەکەو مەلەیان دەکرد تا دەگەیشتنە وشکانی موسڵمانان موسڵمانان بۆ فڕاندنی فرەنجەکان هەر ڕێگەیەکیان دەگرتە بەر جێیێ سەرسوڕمان بوو، نموونە ئەمەیش یەکێك لە موجاهیدانی موسڵمانان شووتیەکی هەڵکوڵێ و کردیە سەری، ئینجا چوویە ناو ئاو کە تا فرەنجەکان نزیك بوویەوە، ئەوانیش دایان زانی شووتیەو کەوتووەتە ناو ئاوەکەوە، کاتێك یەکێکیان چوو هەڵبگرێت ئەو خۆبەخش فرەنجەکەی فڕاندو بە دیلی بردیەوە بۆ سەربازگەی موسڵمانان.

بارەکە شەش مانگ لە یۆنیۆ بۆ نۆڤەمبەری ساڵی١٢٤٩ز بەم جۆرە بەردەوام بوو لویسی نۆیەمیش لە دمیاط چاوەڕێی هاتنی کۆنت دی بواتییە برای سێیەمی خۆی دەکرد، کاتێك ئەو سەرکردەیە گەیشت، پاشا ئەنجومەنێکی بەست بۆ ڕاوێژکردن لەسەر چاکترین ڕیگایەك کە هەڵمەتەکەی پێ بگیرێتە بەر، هەندێکیان دەیانوت با بچێن بۆ ئەسکەندەریە[١] چونکە کەنارێکی باش و دەکرێت کەشتی پێ بگات و بە ئاسانی شتی تێدا دەستدەکەوێت، بەلام کۆنت دی ئەرتوا دژ بە و

---

١- (Omanihistory Of Art Of war in the middie agesvoi.I.P.٥٤.).

ڕایەبوو و باسی لە گرنگی چوون بۆ گرنگترین شاری بەرەی میسری دەکرد کە قاهیرە بوو(هەرکەس دەیەوێت مارەکە بکوژێت جا یەکەم جار لەسەری بدات)لویسی نۆیەمیش ڕای براکەی خۆی پێ پەسەند بوو.[١]

لەوکاتەی بڕیاری کشان بەرەو قاهیرە چەسپا، مەلیك صالح ئەییووب کۆچی دوایە کرد و شەجەرە دوری[٢] خێزانی کەوتە ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەت و هەواڵ کردنی مێردەکەی شاردەوە لە ترسی ئەوەی لە نێوەڕیزی موسڵماناندکا ئاژاوەیەك ڕوونەدات، لە هەمان کاتیشدا هەواڵ بۆ کوڕی مێردەکەی و جێگیری ئەو(تورانشاه) ناردو هانیدا تا لە قەڵای کیفا لە دەوروبەری عێراقەوە بەرەو میسر بێت تا لە دوای باوکی دەستەڵات بگرێت دەست.

پاشان فرەنجەکان بە مەرگی صالح ئەییووبیان زانی و دەرفەتیان قۆستەوە و دمیاطیان بەجێهێشت و بەرەو باشوورو بەسەر کەناراوی ڕۆژهەڵاتی نیلدا لە لقی دمیاط کشان و کەشتیەکانیان بە نیلدا تێپەڕین، پاش چەند وەستانێك لە فارسکور شار مساح و فارامون لە شانزەی دیسەمبەری ساڵی١٢٤٩ز. دا گەیشتنە دەریایان نۆکەندی ئەشموم تەناح[٣]. بەمەنیل لەلای ڕاستیانەوەو نۆکەندی ئەشمومیش لەبەردەمیاندا بوو، نۆکەندە کە لەو سەربازگەی موسڵمانان جیای دەکردنەوەی کە لە شاری مەنسوورە دا بوو، بۆ درێژەدان بە پێشڕەوی بەرەو باشووری فرەنسیەکان پێیان وابوو یان دەبێت بەرەو لقی دمیاط بچن یان بەرەو نۆکەندی ئەشموم بچن لویسی نۆیەم نۆکەندی هەڵبژارد.

---

١ـ (Hainville: History Of saint Louis Tr.By Evans P.٥٤).

٢ـ (سەرچاوە هاوەسەردەم و نێمچە هاوسەردەمەکان بەو جۆرە ناوی دێنن کە لە دەقە کە داهێناو مانە: شەجەرە دور، بەڵام سەر چاوەکانی دواتر بە شێوەی شەرجەرەتودور دەیهێن، دیارە ناو نانی هاو سەردەمیەکان ڕاسترە، مێژوو نووسە ئەوروپیەکانیش ڕاستی ناو هێنانی بەشە جەرودور دو پات دەکەنەوە وەك دائیرە تولمە عاریفی ئیسلامی ولین پۆڵ و جاستون فییت و کنج و چەندێکی تریان).

٣ـ(ئەمڕۆ بەناوی دەریایی بچووك ناسراوە کە لێقکی بە ناوبانگی (ڕەی)ە لە پارێزگای دقهلیە، دەریایی ئەشموم لەبەر شاری ئەشموم تەناح وای پێ دەوترا، ئەو شارە لەسەر ئەو دەریایە بوو، (أبو المحاسن: النجوم الزاهره ج١ ص٢١١ـ ٢٣٢ حاشيه رقم ٥)).

هەندێك لە ناپاکەکان بەرامبەر بە برێك پارە بوونە ڕێنیشاندەرر، بەمە سوارە خاچپەرستەکان بەبێ ئەوەی لە ڕێدا تووشی بەرگر یکاری ببن پەڕینەوە،[1] موسڵمانان هێندە یان بینی فرەنجەکان هاتوونەتە ناو سەربازگەکەیانەوە، بەمە ترس و بیم بە نێوە سەربازاندا بڵاوبوویەوە و میرفەخرەدین یوسف سەرکردەی سوپای میسری لە حەمام هادەدەرێ و بەبێ ئەوەی قەڵغانەکەی ببەستێت سواری ئەسپەکەی بوو هەولیدا خۆی و برێك لە مەمالیکەکانی سەربازانی ڕاکردوو بەرەو هێرشبرد نەسەر دوژمنی هاتوو کۆ بکاتەوە، بەڵام شمشێر لە هەموو لایەکەوە لێیان داو بە کوژراوی کەوتە زەوی دوای ئەوەی سوارەکانی لێی جیا بوونەوەو خاچپەرستان بە سەرکردایەتی روبرت ئەرتوا دەرگایەکی مەنسوورەیان تێکشکاند و لە چەند دەروازەیەکی بچووکەوە درێژیان بە هێرش خۆیان دا بۆ ناو شارەکەدا لە ڕاست و چەپدا میسریەکانیان دەکوشتن و دانیشتوانی بە دارو بەردو ڕم لێیان دەدات، لەو بارەدا دەستەیەك لە مەمالیکی دەریایی ساڵحی کۆبوونەوە کە لە دەرەوە شار بوون، پاشان بە سەرکردایەتی میر بیبرسی بوندو قدار دایان بەسەر فرەنجەکاندا، بەمە سەرکەوتنەکەی خاچپەرستان بوو بە شکست مەمالیك بە بەفراوانی کەوتنە کوشتنیان تا دوای لێهات هەموویان لە ناو بردن لە نێویشیاندا خودی کۆنت ئەرتوا بوو کە لە ئەنجامی کەوتنە خوارەوەی کوژرا.[2]

کەمێك دوای ئەوە پاشا فەڕەنسا گەیشتە مەیدانی جەنگەکە و توانی لەسەر دەریای ئەشموم پردێك دروست بکات تا پیا دەکات بەسەریدا بپەڕنەوە، بەڵام گیانی مەعنەوی نۆیی ناو ڕیزی موسڵمانان کە جەنگی مەنسوورە لە ۸ی فبرایەری ساڵی۱۲۵۰ز. دا نابوویەوە بەسەر ئەو سەرکەوتنەکاتیەدا سەرکەوت کە فەڕنسیەکان بەدەستیان هێنا بوو، بۆ ڕۆژی دوای سەرکردەی سوپا میر فارسەدین ئۆقطای صالحی ئەنجومەنێکی جەنگی بەست کەتیایدا (کزا غند)[3] ەکەی کۆنت ئەرتوانی

---

۱ـ (المقریزي: ج۱ص۳٤۹ ئەو قسە تایبەتانە بوو نەڕێنیشاندەری فرەنجەکان تابپەڕنەوە).

۲ـ (ژمارەی کوژراوانی فەرنسیەکان گەیشتە نزیکەی هەزارو پێنج سەد سوار: Oman: Op .(Ip۳٥٠

۳ـ (کزاغند: پاڵتۆیەکی بچووکە لەسەر قەڵغانی، تێبنی ئەوە دەکرێتە لێرەدا موسڵمانان کاتێك دورشمی پاشای فەڕەنسییان لەسەر پاڵتۆکە دی کە گوڵە مێلاخ بوو لێیان تێکچوو و وایان زانی پاڵتۆکەی خودی پاشایە و ئەوەی کوژراوە خودی لویسە نۆیەمەیە).

نیشانداو وتی ئەمە هی خودی پاشایە و گەلیش بەبێ پاشاوە وەك جەستەی بێ سەر وایە و ترس لە هیچ مەترسیەکی نیە، بۆیە ئەگەر پێتان باشە ڕۆژی هەینی هێرش دەبەنیە سەر فرەنسیەکان، لەبەرە بەیانی هەینیدا کە هاو کاتلەگەڵ١١فبرایەری١٢٥٠ز ئۆقطانی فرمانی بە چوار هەزار سواری خۆی کرد تا پێشترەوی بکەن و گەمارۆی سەربازگەی فرەنجەکان بدەن، ئەمەیش پێچەوانەی دەستەو تاقمە یەدەگەن، بۆ کۆبونەوە و دەستەیەکی ئامادە بۆ کاتی فریاگوزاری، ئۆقطان دوای ئەوەی لە ڕێکخستنی سوپاکەی بوویەوە خۆی بە تەنها و بەسواری چوو تا ڕیزی خاچپەرستان و مەڵبەندو پێگەی هێزو لاوازییان بزانێت تا لەسەر ئەو بنەڕەتە هێزەکانی بخاتە ڕێ، ئەو چالاکیانە کاتی ئۆقطایان تا نیوەی ڕۆژی برد، پاشان فەرمانیکرد تا (نەقارەکان)[1] لێبدەن، پاشان سوارەو پیادەکان لە هەموو لایەکەوە هێرشیان بردو بەقسەی جوانفیل[2] وەك چۆن یاری شەترەنج بکەن وا بوو، مەمالیکەکان لە هێرشەکەیاندا ئاگری ئیفریقیان بەکارهێناوە، بەڵام پاشا لویس توانی خۆ ڕاگر بێت و هێڵی جەنگەکە بۆ باری پێشووی خۆی بگێڕێتەوە دوای ئەوە تووشی چەند زیانێکی سەخت و گەورە بوو، بەمەیش جەنگی دووەمی مەنسوورە کۆتایی پێهات و دوای ئەم جەنگە خاچپەرستان لەوە دڵنیا بوون نا توانن لە مەڵبەندەکانی خۆیاندا بمێننەوە و پێویستە پێش لە دەستدانی دەرفەت بەرەو دمیاط پاشە کشە بکەن.[3]

چەند ڕۆژێك بەسەر ئەو جەنگەدا نەچوو تا تورانشاە لە ٢٧ فبرایە ساڵی ١٢٥٠ز. هاتە میسر و مردنی صالح ئەییووبی ڕاگەیەندراو شەجەرودور کاروباری دەسەلاتی دایەدەست تورنشاە، سوڵتانی نوێ خێرا سەرکردایەتی سوپای گرتە دەست خۆی و

---

١ـ (نەقارە ئەوە ئامێرە تایبەتەی کاروانی سوڵتان بوو هەر لە سەردەمی فاتیمیەکانەوە لە کاروانی سوڵتانکاندا دەبرا بۆ مەیدانی جەنگ و بۆ دەرکردنی فرمان و مۆڵەندان بە جەنگ بە کاردەهات ئەمانی لەسەر بێست وەڵاخ هەڵدەگیران، لەسەر هەرسێ دانەیان دوانیان دادەنا.(القلقشندي: صبح الأعشي ج٣ص٤٧٥)).

٢ـ(مەبەستی جوانیفل بە یاری شەترەنج ئەوەیە سوارەکان موسڵمانان لەسەر شێوەی پەیژە(درج)بوو).

٣ـ(بڕوانە: Joivll: Cit.P.٨٠).

کەوتە پلان دانان بۆ ملکەچکردن لویسی نۆیەم تا خۆی بدات بە دەستەوە، کورتەکەیشی ئەوە بوو ڕیی گەڕانەوەو پاشەکشە لە فەڕەنسیەکان ببڕێت، بۆیە تورانشاه فرمانیکرد تا چەند کەشتیەکی پارچە پارچە کراو لەسەر پشتی ووشتر باربکەن نیل لە پشت هێڵە فەڕەنسەکانەوە دایا نبەزێن[1] بەمجۆرەیش کەشتیگەلی میسریەکان توانی هێرش بکاتە سەر زۆرێك لەو کەشتیە فەڕەنسیانەی شمەك و خۆراکیان پێبوو دەستیان بەسەردا بگرن و کەسەکەکانیان بەدیلبگرن، لە ئەنجامی ئەمە دابرسێتی سەر بازگەی فەڕەنسی گرتەوە و نەخۆشی و دەرد لە نێوە سەربازاندا بلاو بوویەوە و ماڵیان خراپ بوو و پاشا ناچار بوو داوای ئاگر بەست و بەدەستەوە دانی دمیاط بکات بەرامبەر بەوەی خاچپەرستان بەیتولمەقدس و چەند شارێکی کەناراوی شامی بگرنە دەست.

بەلام میسریەکان بەو مەرجانە ڕارە نەبوون و بەباری خراپی فرەنجەکانیان دەزانی، بۆیە پاشا بڕیاریدا لە تارێکی شەو دا پاشە کشە بکەن و ئەو پردەی لەسەر نۆکەندی ئەسمۆ دایاننا بوو لایببەن، بەلام خاچپەرستا لە کارەکەیاندا خێرا یان کرد و بیریان چوو ڕێگەکە ببڕن و میسریەکانیش یەکسەر پەڕینەوە و سواری ملی خاچپەرستان بوون و شمشێرەکانی خۆیانیان لێ بەکاهێنان و کەوتنە کوشتنیان و ڕاوە دوو نایبنان، تا فارسکور بەردوامبوو و لە هەموو لایەکەوە کەوتنەلێدانی خاچپەرستان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و بە دیلگرت[2] و زۆربەی ئەسپ و شمەك و چەك و ماڵو سامانیان بەدەستکەوت گرتن و مەمالیکی دەریایی

---

١ـ (سوڵتان کامیلی باپیری پێشتر دژ بە شالاوی جان دی برین بۆ سەر میسر لەساڵی ١٢١٧ز. دا ئەو پلانەی بەکارهێناوە بوو هەروەها صالح ئەییوبی باوکیشی لەوەسیەتەکەیدا کە بەجێی هێشتبوو وەسیەتی بۆ کرد بوو، نوەیری لە کێتبەکەیدا (نهاية الأرب في فنون ج٢٧ لوحة ٨٩ـ٩٣) کە لە دار الکتب المصريه بە ژمارە ٥٩٤ لە (مصارف عامة) دا هەیە ئەو وەسیەتە هێناوە).

٢ـ (دەڵێن ژمارەی کوژراوانی فارسکور گەیشتوەتە سی هەزار کەس، تورانشاه خۆی لەو تەیەکیدا بۆ جەمالەدین یغموری جێگێری لە دیمەشق ئەو ژمارەی نووسیوە، هەر چەندە لەوانەیە زێدە ڕۆیی لەو ژمارەیە دا کرا بێت).

صالّحی بە تایبەتی ئوقطای و بیبرس بوند و قدارلە فارسکوردا کاری خۆیان کرد تا ئەوەی ئیبن واصل بە (داویة الأسلام) ناویان دەبات وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو هێزە هەیا نبوو کە لە سوارە داویەکانی خاچپەرستان دەچوو.[1]

لەسەر ئاستی جەماوەریش گیانی مەعنەوی زۆربەرزو بەشداری جەنگیش گشتگربوون، پێشتر ئاماژەمان بە چەند وێنەیەکی دا، ئەبو لقاسمی نوەیری لێرەدا وێنەیەکی زیندووی لە کاری بەرگرێکاری جەماوەریمان لەو کاتەدا، دەداتە دەست و دەڵێن: (ئەحمەدی دمیاطی) لە باوکیەوەکە بە ئیبن توهلیش ناسراوە بۆ گێرامەوە کە باوکی ووتویەتی: من لە دمیاط ڕاوەماسیم دەکرد، کاتێك جەنگی دمیاط ڕوویدا من پانزە ساڵ بوو، بنییم کۆمەڵێك لە فرەنجەکان لەسەر کەناراوی نیل لە برساندا کەوتون، منیش تورەکەم دابەسەریاندا کەوتمەسەر بڕینیان و سەرەکانیانم دەخستە ناو تۆرەکە و دەمبردن بۆ سوڵتان، سوڵتان بڕیاریدا بوو هەرکەس سەری فرەنجیەك بێنێت دینارێك وەردەگرێت، منیش هەر سەرێك کە یەکەمجار هێنا بوونم دینارێکم وەرگرت، پاشان بۆ ئەو سەرانەی کە دووەم جار هێنانم بۆ هەریەکەیان درهەمێکم وەرگرت، کەسانی تریش دەهاتن و سەریان هێناوە چییان بە من دابوو بەوانیشیان دەدا، منیش وتم یەکەمجار بۆ هەرسەرێك دینارێکم وەردەگرن کەچی ئێستا بۆ هەرسەرێك درهەمێك وەردەگرم؟ لەبەر ئەوەی موسڵمانان ئاسان بوو چونکە برسی بوون، چونکە بۆ هەرسەرێك درهەمیکە، سەربڕینی ئەوانیش بۆ موسڵمانان ئاسان بوو چونکە برسی بوون، چونکە موسڵمانان لەسەر ڕێگەکەیان بۆیان دادەنیشتن و هەر کات لەلایەن هاوەڵاکانیاوە لە دمیاطە وە بهێنرایەن ئەوان دەیانکوشتن و شمەکەکەیان دەبردن، بەمە فرەنجانەی لەگەڵ موسڵماناندا دەجەنگان برسییان دەبوو و توانای جەنگیان نەدەما، پردەکەیشیان بەسەردا ڕووخێنراو لە ئاوی نیلدا

---

١ـ(سوارەکانی داویەیان پەرستگاریان بەیکەر لە ناودارترین کۆمەڵە سوارە ئایینیەکان سەردەمی جەنگە خاچپەرستیەکان بوون کە ڕیبازی بارمتەو ڕێبازی سوارچاکیان پێکەوە گرێدا بو، ئەو دەستە و کۆمەڵە بە توندی و دلێری جەنگەیان ناسرا بوون، بۆیە ئیبن واصل دەستەی مەمالیکی دەریایی صالّحی بەوان چواندووە، ئەمەیش جێی خۆیەتی).

دەخنکان و نزیکەی حەفتا هەزار یان لێ بەدیلگیران تەنانەت فرەنسیی پاشایشیان بەدیلگیرا.[1]

لویسی نۆیەم نەیوست خۆی رزگار بکات هەر چەندە دوسنتاریا زۆر داوای لێکردا تا ڕابکات، بەڵکوو بە قسەی ئەبولمەحاسین بڕیایدا بمێنێتەوە تا گوروتین بە هاوەڵەکانی بدات و بیانپارێزێت، بۆیە میسریەکان توانییان خۆی و ئەو خانەدان و سوارچاکانەی گوندی (منیه أبی عبدالله)[2] کە لە باکوری مەنسورە چەند میلێك دوورە بگرن و لویسی نۆیەم برا بۆ شاری مەنسورە و لەوێ لە بەندیخانەی ماڵی قازی فەخرەدین ئیبراهمی کوڕی لوقماندا بەند کرا.[3]

بەوجۆرە هەڵمەتی خاچپەرستی حەوتەم لە کۆتاییدا بە فەزڵی مەمالیکە دەریاییەکانەوە شکستی خواردو تەنها دانووستان لە پێناو ڕێککەوتندا مایەوە.

بێگومان شکستی ئەو شاڵاوە خاچپەرستیە بەڵگەیەکی ڕوونی بێئاگایی خاچپەرستان بووە لە جوگرافیای وڵاتی میسر، چونکە بۆ ئەوان باشتروا بوو ڕێگەی صالحیە- بلیس بگرنە بەر کە زۆربەی جەنگاوەرانی میسر وەك قمبیز و ئەسکەندەرو عەمری کوڕی عاص و سەلمیی یەکەم لە وێوە بۆی چوون، نەوەك ئەو ڕێگەتەنگەڵانەی کە دەیبردنە نێوەندی دەلتاوە و دەبوو بە نیل و لق و نۆکەندە

---

١ـ (محمد بن قاسم النویري الأسکندري: کتاب الألمام بالأعلام، بزانە لە جەنگی ئەسکندەریەدا چی ڕوویداوە (مخطوط رقم ٦٧٧بکلیة الآداب جامعة الأسکندریة) دکتۆر عەزیز سوریا لە حەوت بەشدار لە حەیدەر ئابا لە ساڵی١٩٧٦ز دا بڵاکردتەوە).

٢ـ (منیه أبی عبدالله: گەندێکە لەسەر کەناراوی ڕۆژهەڵاتی لقی دمیاط کە تا ئێستایش ماوەو بە ناوی (میت الخولی عبدالله) وە ناسراوە و گەندێکی مەڵبەندی فارسیکورە لە پارێزگای دقهلیە).

٣ـ (جەمالەدین یەحیا کوڕی مە طروحی شاعیر هاوسەردەم ئاگادار فرەنسیەکان دوای ئەو شکستە دەکاتەوە و دەڵێت:

وقل لهم إن اضمروا عودة　　لأخذ ثأر أو لقصد صحیح

دار ابن لقمان علی حالها　　والقید باق والطوشي تبیع

بڕوانە: دیوان ابن مطروح ص١٨١ـ ١٨٢، ئەمە تا ئێستایش ماڵی ئیبن لوقمان لە مەنسوورە لە پاڵ مزگەوتی شێخی موافیدا یە ناسراوو بەناوبانگە).

ئەوەی جێی ئای پەژارەیە ئەوەیە موسڵمانان کاتێك هەستیان بە نەمانی مەترسی فرەنجەکان کرد نێوان خۆیان تێکچوو پاش ئەوەی پێشتر ئەو هێزەیان دژ بە دوژمنیان بەکارهێنا کەچی ململانێی ناوخۆیی دەستپێکرد و پیلانە سیاسیانە دانران کە بوون هۆی ڕووخانی دەوڵەتێك و دامەزرانی دەوڵەتێکی تر، چونکە تورانشاه لەبەر هۆکارێك کە سەرچاوەکان شرۆڤەکاری پێویستیان بۆ نەکردووە ڕقی لە مەمالیکە دەرییاییەکان بوون، تەنها هێندەیان و تووە کە تورانشاه گەنجێکی ئارەزووباز بووە و لەو لە باوکیەوە خۆ بەزل زانی وەرگرتووە، ئەمە وایکردووە سەرکردەکانی مەمالیك لێی بێزاربن، ئەویش دڵی لە مەمالیکی دەریایی صالحی کرمۆ بوو بوو و ترسی لە قوڵەمیرەویان هەبوو، بۆیە دەستبەرداریان بوو و مەمالیکەکانی خۆی و ئەو دەربارانەی لە خۆی نزیککردەوە کە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵیدا هاتبوون و شوێنی ئەو مەمالیکە دەرییاییانەی پێ گرتنە دەکە بوو نەجێی چەوساندنەوە و ترساندنی تورانشاه بەرامبەریان، کاتێك شەوان سەرخۆش دەبوو لەبەردەمیدا کۆڕو هەراو هوریانی دەبەست و بە شمشێردەیدا لەسەری سەرکردە مەمالیکە دەرییاییەکان تا سەر دەپەڕاندو دەیوتی وا دەکەم بە مەمالیکی دەریایی و هەریەکەیانی بە ناوی خۆیەوە بانگ دەکرد، بۆیە ئەوانیش نیازیان بەرامبەری گۆڕاو نیازی خراپیان لە ڕوویدا وەرگرت.

پاشان تورانشاه بە ڵێنی بە ئەتابەگ ئوقطای دابوو تا بیکات بە والی ئەسکەندەریە، کەچی بەڵێنەکەی نەبردە سەر بەڵکوو سوور بوو لەسەر ئەوەی بینێرێت تا موژدەی سەرکەوتن بدات بە بەردرەدین لوئلوئی بەرپرسی موصل، ئەو بەو کارەی دەیویست بەدرەدین بیگرێت و لەچەند قەڵایەکدا بەندی بکات، بەمە ئۆقطای ڕقی لە تورانشاه هەڵگرت و کەوتە قەرەوڵ بۆ گرتنەوەی دەڵێن هەروەها سوڵتان و یستوویەتی کۆمەڵێك لە مەمالیکەکانی بنێریت تا هەواڵی سەرکەوتنەکە بە پاشایانی وڵاتانی دراوسێ بگەیەنن تا بەوە لە قاهیرە دووریان بخاتەوە، مەمالیکەکانیش بە فێڵەکەیان زانی و زانییان ئەو دەویەێتلە دەستیان دەربازی ببێت و لە ناویان ببات.

تورانشاه تەنها بە بەرنگاری بوونەوەی سەرکردە سوپایەکانی و گەورەکانی

دەوڵەکەی نەوەستا، بەڵکو و ڕقی شەجەرو دوریش هێنایە مەیدان لە کاتێکدا ئەو ژنە پاڵپشتی دەسەڵاتی تورانشاه بوو، ئەو نامەیەکی بۆ شەرەجو دور نووسی و هەڕەشەی لێکردو داوای پارە و سامانەکەی باوکی کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە کە هەموو ئەو ماڵ و سامانەیی لە کاروباری جەنگ و کاروباری گشتی وڵاتدا خەرج کردووە، دەڵێن ترسێکی زۆر لای شەرجودور دروست بوو، بۆیە لە ترسی ناپاکی تورانشاه ماوەیەك چوو بۆ قودس، هەروەك نامەی بۆ مەمالیکی دەریایی نووسی و سکاڵای حاڵی خۆی لە ڕێڕەوی توندو تیژی تورانشاه بەرامبەر بە ئەو دەکرد لە کاتێکدا ئەو ماوەی تورانشاه لە میسر نەبوو شەرجەرودو ئەو هەموو خزمەتە گەورانەی بۆ بەجێگەیاندووە، مەمالیکی دەریایی صالحیش دڵسۆزییان بۆ شەرجەرو دور هەبوو چونکە شەرفی ئەو مامۆستایانەکە ئەوانەی کڕیوە هەروەها، بە هۆی پەیوەستی نێوان شەرجەرودورو مەمالیکەکان کە لەسەرچاوە هاوسەردەمەکاندا بە دەستەواژەی خەشداشی دەردەبڕێت کە بەهێزترین ئەو پەیوەندیان بوون کە کاریگەرییان هەبوو لە گەشەسەندن و گۆڕانەکانی مێژووی مەملووکیدا.

ئەم ئەمانە وای لە مەمالیکەکان کرد ڕق لە سوڵتان تورانشاه وەربگرن و کۆببنەوە بۆ کوشتن و دەربازبوون لە دەستی پێش ئەوەی ئەو دەستی خۆی بوەشێنێت، چوارە سەرکردەی مەمالیك هەستان بەجێبەجێکردنی ئەم پیلانە کە یەکێکیان فارسەدین ئوقطای و یەکێکی تریشیان بیبرس بوندو قداری بوو، لەبەرەبەیانی ڕۆژی دووشەمە هاو کات بە ٢ مایۆی ساڵی ١٢٥٠ز- ٢٧ موحەڕەمی ساڵی ٦٤٨ك) دوای ئەوەی تورانشاه لە خواردنی بەرەبەیانی بوویەوە و لە چادرەکەیدا بوو فارسکور، بیبرس بونداری چووە پێشەوە بۆی و شمشێرێکی بۆ وەشاندی بۆ وەشاندی دای لە دەستی وپەنجەکانی بڕی، تورانشاهیش پەنای برد بۆ ئەو بورجەی تەختەییەی لەسەر نیل دروستی بۆ وەشاندو دای لە دەستی کرد بوو تا لەو کاتەی لە فارسکورە جار جار لەوێ کات بباتە سەر و چوویە سەرەوە بورجەی کەو لەوێ خۆی پەناداو دەرگای لە خۆی داخست، بیری ئوقطان و کردە دەریاییە کانی تریش کەوتنە شوێنی ووتیان: (کەمار بریندار کرا هەردەبێت

بیشکوژرێت) گەمارۆدا وئاگریان تێبەردا، تورانشاهش بە هاوارو کروزانەی دابەزی و هاواری دەکرد، ماڵ و سامانی خۆتان ببەن و وازم لێ بهێنن تا بگەڕێمەوە بۆ قەڵای کیفا، بەڵام کە نە چوو بەهانایەوە، ئەوەیش بەرو نیل ڕای دەکرد و تیرو ڕمی مەمالیکەکانیش لە هەموولاوە بەسەریدا دا دەبارین تا خۆی فڕی دایە ناو ئاوەکە بەو هیوایەی مەلە بکات تا بگاتە لای یەکێك لە کەشتیە وەستاوەکان و خۆی ڕزگار بکات، بەڵام ئوقطای خێرا خۆی گەیاندە لای و کوشتی.

ئەوەی جێی باسە لێرەدا کوژرانی تورانشاە لەبەردەم پیاوانی سوپا دا ڕوویدا بەبێ ئەوەی هیچکامیان هەوڵێ ڕزگاری کردنی بدان، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە مەمالیکەکان بەتەواوەتی بارەکەیان گرتووەتە دەست، ئەبوو عزدەین نوێنەری خەلیفەی عەبباسی لەسەر بازگەکەدا ئامادە بوو و بە کوشتنی سوڵتان ناڕازی بوون، دەڵێن تورانشاە لە بەرزایی بورجەکەوە هاواری بۆلای ئەو دی برد و دەیووت: ئەی ئەبو عیزدەین فریام کەوە، ئەمەی چەند جار دووبارەکردووە، ئەبوو عیزدەینش چوو بە دەم داواکەیەوەو کەوتنە قسەکردن لەگەڵ مەمالیکەکاندا تاوازی لیبهێنێت، ئەوانیش ئەبوو عیزەدینیان گرت و هەڕەشەی ئەوەیان لێکرد ئەگەر دەستوەربداتە ئەم کارە دەیکوژن، ئەبوو شامەیش دەگێڕێتەوە مەمالیکەکان هەڕەشەیان لێکردووە کە حورمەتی خیلافەت دەشکێنن، نازانێن ئەبوو شامە لە پشت ئەم دەبڕینەوە مەبەستی چیە[1] پێدەچێت مەبەستی ئەوە بێت میسر لە بازنەی قەلەمڕەوی ئایینی خەلیفەی بە غداد بێننەوە دەرو نزا بۆ خیلافەتێکی تربکەن بۆ نموونە وەك خیلافەتی موەحیدین لە مەغریب.

پاشان تەرمی سولتان لە نیلوا کەتوتەوە سەرئاو و لە کەناراوەکەیدا سێ ڕۆژ ماوەیەوە تا بڕیادرا لە شوێنی خۆیدا بە خاڵ بسپێرێت[2]. بە مردنی تورانشاە سەردەمی دەوڵەتی ئەییووبیەکان لە میسر کۆتایی پێدێت.

---

١ـ (أبو شامة: الذيل على الروضتين ص١٨٥).

٢ـ (ئەبو شامە قسەیەکی والی قاهیرە دەگێڕێتەوە و دەڵێت دوای مردنی سوڵتان تورانشاە فڕێ درایە نێو بردیە ناو ئاوەکەوە نیلی بەسەر داکراو لەوێ سێ ڕۆژ مایەوە، دوارت ئاو

## *چەند دیمەنێکی ژیاری ( حضاری ) لەسەردەمی ئەییووبیدا :

پێشتر بینمان دەوڵەتی ئەییووبی هەر لەسەرەتایەوە وە تا کۆتاییەکەی دەوڵەتێکی ئیسلامی موجاهید بوو، لەسەرەتاکەیەوە سەرکەوتنی حطین بوو کە تیایدا بە یتولمەقدیسی گێرایەوە، لە کۆتاییە کەیشیەوە بە سەرکەوتنی مەنسوورە دێت، داگێرکەرانی فەرەنسی بە سەرکردایەتی لویسی نۆیەمی پاشایان لە خاکی میسریدا دەرکرد، بەڵام ئەم لایەنە سەربازیە سەرکەوتووە لایەنێکی تری گەشاوەی ژیاریشی لە مەیدانی جیاجیاکانی زانست و مەعریفەدا لەگەڵدا بوو.

دیارە ئەییوبیەکان بە بنەڕەت و ڕەچەڵەکیان کورد بوون، بەڵام لە ڕۆشبیری پەروەردی یاندا عەرەبی بوون، ئەوان بە پەروەردەیەکی عەرەبی ئیسلامی پەروەردەبوون و تێکەڵ بەوە بوون و زمانی و ئەدەب زانستی عەرەبیان لاخۆشەویست بوو و شاعیر و زانا و نووراسەرانیش لێیان کۆدەبوونەوە و دەکەوتنە بەر سۆزو ڕێز و شای و شکۆ و بە خشێنی ئەییوبیەکان، بە کۆڕەکانیان لێوانلیوی زانا و ئەدەبیان بوون، دواتر ئاسایی بوو ئەو وێنەیە لە دەروونی شاعیران و نووسەرانی هەموو بەشەکانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا ڕەنگ بداتەوە و زمان و پێنووسەکانیان بە شا نوبالێ سەرکەوتنەکان و کارە پاڵەوانێتەکانیاندا هەڵبدەن و بکەونە پیا هەڵدانی ئەو پاڵەوانانەی بەرگرییان بە بازنەی ئیسلام دەرکرد و هیوا ئارەزووی خۆیان بۆ داهاتوویەکی چاکتر دەبڕن.

خودی سەلاحەدین حەزی شیعری هەبوو و لە کۆڕەکاندا جار جار دەیوتنەوە و پام و خراپی شیعری لێك جیادەکردەوە، هەروەها تەواو شەیدا و ئالودەی حوکم بنەڕەتەکانی شەریعەت بوو بوو لەگەڵ فیقهناس و زانایاندا لەو بوارەوە چەند تۆماری و دانووسنانێکی هەبوون.

---

تەرمەکەی خستە دیار و بردیە ناو ئاوەکە وەك بلێنی نەهەنگ ئاسا بێت تا گەیشتە کەناراوێکی تری دەریاکە و لەوێ بە خاك سپێردرا).

ئەوە لەوبارەی سەلاحەدینەوە لە بارەی ئەندامانی بنەماڵەکەیشیەوە دەوترێت جا عادلی برای حەزی بەلای زانایان و زانستدا دەڕۆیشت بە تایبەتی زانای فەیلەسوف فەرخردەینی ڕازی کە چەند کتێبکی خۆی بۆ نووسیوە و لە خوراسانەوە بۆی ناردووە، هەروەها مەلێك موئەیدی مسعودی کوڕی سەلاحەدینی بەرپرسی یەمەن کە تەواو ئالوودەی کتێب بوو بوو تا ئەوەی کتێبخانەکەی هەزاران کتێبیٚ لە خۆ دەگرت، هەروەها مەلیك موعەزەم عیسای کوڕی عادلی بەرپرسی دیمەشق کە هەر کەسێك کتێبی (الفصل) ی زەمەخشەری لەبەر بکردایە سەد دیناری پۆشاکێکی پێ دەدا، هەروەك داوای لە قیوامەدین فەتی کوڕی موحمەدی بنداری ئەسفهانی ئەدیبی فاسی کرد تا کێتبی شانامەی ئەبو لقاسم فیردەوس وەربگێرێت)(شانامە داستانێکی شیعری فارسیە کە مێژووی پاشایانی کۆنی فارس و ئەفسانەکانیان تا فەتحی ئیسلامی دەگێرێتەوە).

لێرەدا لە پاڵ پاشاو سەرکردەکاندا چینی وەزیرو نوسەران لەو سەردەمەدا هەبون کە لەوانە قازی فازل ئەبو عەلی موحیەدینی لەخمی (کۆچکردووی ٥٦٩ك) وەزیری سەلاحەدین و خاوەنی تەریقەتی فازیلی لە دارشتن دابوو، عیمادی ئەسفهانیش (کۆچکردووی ٥٩٧ك) نووسەر و مێژوونوسی جەنگی سەلاحەدین وە خاوەنی چەندین دانانی ئەدەبی و مێژووییە وەك (دولة آل سلجوق) کە چاپکراوە و (البرق الشامی) دەستنووسە (فريدة القصر و جريدة العصر) چاپکراوە (الفتح القسي في الفتح القدس) چاپکراوە، هەروەها سەرکردەی سوار چاك ئوسامەی کوڕی مونقیذ (کۆچکردووی ٥٨٣ك) کە سەرکردەیەکی بەنی مونقیذ و بەرپرسی قەڵای شیرز بوو کە تا ئەمرۆیش شوێنەواری ماوە ناوی (سیجر) بە دووری پانزە میل بۆ باکووری حەمالەبەرەی ڕۆژئاوای (العاصي) دایە، بە هۆی ئەوانەی دراوسێی خاچپەرستان بوو ئوسامە لەگەڵ خاچپەرستاندا چەند گرفت و جەنگ و دۆستایەتیەکی هەبوو کە لە کتێبەکەیدا بە شێوەی یا داشتی تایبەت لە ژێر ناونیشانی (كتاب الأعتبار) کە فیلیپ حەتتی بڵاوکردۆتەوە تۆماری کردن، کتێبەکە چەند وێنەیەکی بەراوردکاری نێوان نەریتی موسلمانان و فرەنجەکان لە خۆ دەگرێت کە ئوسامە بە چاوی خۆی

بینیویەتی و پشکینی بۆ کردووە، هەروەها بەهادین ئیبن شدادی (کۆچکردووی ٦٣٢ک) مێژوونووس هەیە کە خاوەنی کتێبی (النوادر، السطانية، والمحاسن اليوسفية) یەکە چاپکراوە و ژیانی صەلاحەدین سوڵتانی هێناوە، پێویستە ئەم کەسایەتیە لەگەڵ عیزەدین ئیبن شەدا (کۆچکردووی٦٨٤ک) جیا بکەینەوە، چونکە عیزەدین پەنجا ساڵ دوای ئەو ژیاوە و لە شاری حەلەب بوون و لە بارەی ژیانی سوڵتان زاهیر بیبرسەوە کێتبکی نووسیوە بە ناونیشانی (الروض الظاهر في سيرة الملك الظاهر) دەستنووسە چاپ نەکراوە، هەروەها ئەدیبی زانا زیائەدین ئیبنو لئە ثیر (٦٢٨ک) وەزیری مەلیك ئەفزەلی کوڕی سەلاحەدین هەیە کە لە ڕەوانبێژی و زانستی چەندین کتێبی نووسیوە و برا بچووکی عیزەدین ئیبنو لئە ثیری مێژوونووسە (کۆچکردووی ٦٣٠ک) کە خاوەنی کتێبی (الكامل في التأريخ)ە، هەروەها قازی شەمسەدین ئیبن و خەلەکان (کۆچکردووی ٦٨١ک) نوسەری کتێبی (وفيات الأعيان) کە چاپکراوە، و مێژوونووسی حەمەوی جەمالەدین ئیبن واصیل (کۆچکردووی ٦٩٦ک) کە بارەی سەردەمی ئەییوبیەوە ئیسکلۆ پیدیایەکی نووسیوە، بە ناونیشانی (مفرج الكروب في أخبار بني أيوب) چاپکراوە کە ویستی پێشکەشی بکات بە تورانشاهی کۆتا پاشای ئەییووبیەکان، بەڵام کاتێك زانی کوژراوە وازی لەو بریارە هێنا هەروەها ئیبن ئەبی ئوسەیبعە (کۆچکردووی ٦٦٨) خاوەنی کێتبی (عيون الأنباء في اطبقات الأطباء) چاپکراوە، مێژوونووسی دیمەشقی ئەهابەدین ئەبوو شامە (کۆچکردووی ٦٦٥ک) کە هاو سەردەمی ئیبن واصیل بووە و مێژوویەکی گرنگی ئەو سەردەمەی نووسیەوەتەوە بەناونیشانی: (كتاب الروضتين في أخبار الدولتين النورية والصلاحية و ما وقع من الحروب الصليبية) چاپکراوە.

سەبارەت بە شاعیرانی ئەو سەردەمە زۆر بوون، تەنها ئاماژەدەدەین بە شاعیر سۆفی ناسراوبە عەمری کوڕی فاریزی میسری (کۆچکردووی ٦٣٢ک) لە قەسیدەکان دوو قەسیدەی گەورەو بچووکی ئائین کە تیایدا بە شێکی زۆری نیازە سۆفیەکانی تێدایە، هەروەها شاعیر بەهادین زوهەیرد (کۆچکردووی٦٥٦ک) کە لە خزمەت مەلیك صالّح ئەییوبدا ژیاوە، و شاعیر جەمالەدین یەحیای کوڕی مەتروح (کۆچکردووی

٦٤٩ك) کەلە بنەماڵەی صەعیدی میسرە و لەگەڵ بە هاء زەیردا چەند وتوێژێکی شیعرییان هەیە، قەسیدەیەکی بەناوبانگیشی هەیە کە تیایدا هێرش دەکاتە سەر فرەنسیەکان و لویسی نۆیەم، هەروەها ئیبن سنا ئولموللك (کۆچکردووی ٦٠٨ك) شاعیری میسری کە کتێبی لە بارەی هونەرەی جیاوازەکانی شیعرەوە بە تایبەت هەنەری (الموشعات) بەناونیشانی (دار الطراز) نوسیوە (بڵاوکراوەی جودە الرکابی).

ئەم راپەرینە زانستی و ئەدەببە چەند مەڵەندێکی ژیاری هەبوو کە لێیەوە رووناکی زانست و مەعریفە پەخش دەبوو وەك کورەکانی پاشای لە کۆشکەکانیان و ئەوەی بە کۆشکی میریان سوڵتان ناسرا بوون، یان وەك دیوانی دانان یان دیوانی نووسینەوە سوڵتانیەکان کە تەنها سی لێهانوو و خاون رشێبیری باڵا و زمانەوانی بە هێز لەسەریان دادەنرا، هەروەها وەك خانەکان کە پەرستگای و شوێنی سۆفیەکان بوون لەوێوە قەسیدە بە ناوبانگی سۆفیەکان بڵادەبوونەوە، هەروەها وەك خستەخانەوە نەخۆشخانەکان کە پزشیکی و پزیشکان و نووسینەوە پزیشکیەکانیان دەردەکرد، پاشان خوێندنگا کە تیایدا زانستە عەقلی نەقڵیەکان دەخوێنران، پێشتریش و تمان نیزامی خوێندنگا لە لایەن سەلجوقیەکانەوە داهات بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی سوننی و لێدانی مەزهەبی شیعی وئامادەسازی عەقڵی موسڵمانان بۆ بیری جیهاد پیرۆز، پاشان نورەدین موحمود زەنگی و پاشان، سەلاحەدین و جێگیرەکانی لە میسرو شام لەسەر هەمان سیاسەت چوون هەر چەند جیاوازیەکی بچووك هەبوو، ئەوەیش وئەوە بوو کە نورەدین حەزی بەلای مەزهەبی حەنەفیدا دەچووو لە کاتێکدا سەلاحەدین بە شێوەکی تایبەت حەزی لە مەزهەبی شافیعیدا نەبوو.

لەو خوێندنگانەی سەلاحەدین لە میسر دایمەزراندن بریتیبوون لە:

١ـ خوێندنگەی سەلاحی: لە پاڵ مەقامی پێشەوا شافیعیدا دایمەزراند تیایدا بنەڕەتەکانی مەزهەبی شافیعی دەوترانەوە، شوێنەکەی لە میرۆدا مزگەوتی پێشەوا شافیعیە.

٢- خوێندنگەی ئیبن زین تجار: خوێندنگەیەکی تری شافیعی بوو کە سەلاحەدین لە پاڵ مزگەوتی (العتیق) یان مزگەوتی (عمرو بن العاص) دایمەزراند و یەکەمجار بە خوێندنگەی ناسریە ناسرابوو، دواتر بە خوێندنگەی ئیبن و زین ناسرا بوو وەك ناونانی لەبەرزانای شافیعی ئەبو لعەبباس ئەحمەد کوڕی موزەفەری ناسرا ئیبن زین تجارکە ماوەیە کی دوور درێژ لەوێ خۆی بۆوانە وتنەوەیە گلاکردبوویەوە تا لە ساڵی ٥٩١ك. کۆچی دوایی کرد، بەمە ناوی خوێندنگەکەی بە ناوی ئەوەوە ناسرا.

٣- خوێندنگەی (القمحية): سەلاحەدین لە نزیك مزگەوتی عەمردا بنیادی نا تا تیایدا فیقهی مالیکی بخوێندرێت و بەشێکی زۆری گەنمی بۆ وەقف کرد، خواردنی مامۆستا و ڕاگرو خوێندکارانیش بە گەنم دەدرا، بۆیە ئەو ناوەی لێنرا.

٤- خوێندنگەی سوفیە: سەلاحەدین بنیادی نا تا تیایدا مەزهەبی پێشەوا ئەبوو حەینفە بخوێندرێت کە لە بنەڕەتدا ماڵی وەزیرێکی فاتیمی بوو کە بە عەبباس بانگ دەکرا، بازاڕی شمشێر فرۆشان لەبەر دەرگایدا بوو بۆیە خوێندنگەی (سیوفیە) ناسرا.

٥- سەلاحەدین لە دەرەوە میسر لە هەریەك لە قودس و دیمەسق و دا چەند خوێندنگەیەکی دامەزراند و بۆ هەر خوێندنگەیەك خەستەخانەیەکیشی دامەزراند.

ئیبن خەلەکان بەم قسەی بە پۆختی کارەکانی غەزالی دێنێت: (کاتێك سوڵتان سەلاحەدین ناوچەکەی گرتە دەست هیچ خوێندنگەیەکی تێدانەبووە چونکە دەوڵەتی میسری) (مەبەستی دەوڵەتی فاتیمیە) مەزهەبی ئیمامی هەبوو و بڕوایان بە شتی وانە بوو، بۆیە سەلاحەدین خوێندنگەیەکی لە پاڵ پێشەوا شافیعیدا(ﷺ) دروست کردو خوێندنگەیەکیشی لە پاڵ گلکۆی ناسراو بەگلکۆی حوسەینی کوڕی عەلیدا (ڕەزای خوا لە هەردووکیان) لە قاهیرە بنیادنا، ماڵی سەعیدو سوعەدا، خزمەتگوزاری خەلیفەی فاتیمیەکانی کرد بە بە خانە قاو وەقفێکی زۆریشی بۆ دانا، هەروەها هەر خوێندنگەیەکی دروست بکردایە وەقفێکی زۆی بۆ دادەنا ناو ماڵی عەبباس وەزیری عەبیدی کرد بە خوێندنگەیەکی حەنەفی و وەقفێکی باسی بۆ داناو لە کۆشکیشدا لە ناو قاهیرەدا خەستەخانەیەکی دروستکردو وەقفێکی باشی بۆ داناوە لە قودیش خوێندنگەو نەخۆشخانە و خانەقایەکیش کردەوە، منیش لای

خۆمـەوە بـیرم لـەو پیـاوە دەکـردەوە و وتم: بـە ڕاسـتی لـەو دنیـاو دوا ڕۆژدا بەختەوەرە، چونکە لە دنیادا ئەم کارە دیارانەی فتوحاتی زۆرو کاری تری کردووەو ئەو وەقفە گەورانەی داناوە و شتکێش نین درا بێتێنە پالێ و ناوی ئـەوی لێ نرابێـت، چونکە ئەو خوێندگەی لە قوراخە دایمەزراند ناوی ناوی شافیعی لێنـاو ئـەوەیش لـە پالْ گلکۆی حوسەینیدا دروستیکرد بە ناوی گلکۆکەوە ناوی دەبەن و خانەقاکـەیش بە سەعید و سوعەدا و خوێنگە حەنەفیەکەیش بە سیوفی ناوی دەبەن کە ئـەوەیش لـە میسر هەیە بـە خوێندنگـەی ئـیبن زیـن تجـار نـاو دێـنن هـەروەها خوێندنگـەی مالیکیش لە میسر هەر وایە، ئەمەیش ڕاستی نهێنـی ئـەوە بۆ حەقیقـەت و ڕاسـتی. سەلاحەدین لەگەڵ ئەو ناوچە دەسەڵاتە فراوانە و دەسـەلاتە گەوەریـدا زۆر خـاکی و نـەرمونیان و لـە خـەڵك نزیـك ز دڵنـەرم و بـە سـۆزو خـۆگر و ئـارام بـو، زانایـانی خۆشدەویست و لە خۆی نزیکی دەکردنەوە و چاکەە لەگەڵ دەنواندن شیعری باشی بە چاکی دەزانی و لە کۆڕەکانیدا دەیوتنەوە، نمونەی ئەمەیش ئەو بە قـسەی ئـیبن مونجمی مە غریبی ڕەچەڵەك میسری کۆچکردووی سەر سامبوو کە شاعیرێك بوو لـە وەسفی مووی سپی پیریدا دەڵێت:

وما خضب الناس البياض لقبحـه　　واقـبح منـه حـين يظهـر ناصـله

و لكنـه مـات الـشباب فـسودت　　على الرسم من حزن عليه منازلـه

دەلێن لەو کاتە ئەییوبیەکاندا دامەزراند و نۆژەنکردنەوەی خوێندنگە سوننیەکان لـە میسر دابێـت یـان لـە شـامدا بـەردەوام بـوون، نمونـەی ئەمـەیش خوێندنگـەی (الفاضلية) کە قـازی فازیـل لـە میـسر بـۆ مەزهـەبی شـافیعی دایمەزرانـد، هـەروەها خوێندنگەی (النقوية) کە میر تەقیەدین لە شاری حەلەب بنیادی ناو لەویش بە خـاك سپێردرا، خوێندنگەی (العادلية) یش هەیە کە مەلیك عادل بنیادی نـا، مـەلیك عـادل برای سەلاحەدین بوو و ئەم خوێندنگەی لـە دیمەشق بنیـادی نـاو لـەوێش بـە خـاك سپێردرا و لە گەورەترین خوێندنگە شافیعیەکانی دیمەشق بوو و کۆمەڵێك لە زانایام لـەوێ وانـەیان دەوتـەوە لـەوپێش دادەنیـشن، لەوانـە ئـیبن خەلـەکان خـاوەنی کتێبی(زفيات الأعيان) ئەو خوێندنگە ئێستا پێگەی کۆبوونـەوەی زانـستی عەرەبیـە لە دیمەشق.

هەروەها دیمەشق خوێنگەی موعەزەم عیسا کوڕی عادل و خوێندنگەی عەزیزیە هەبوو کە مەلیك عەزیز موحەمەد لەپاڵ مەقامی سەلاحەدین باوکی لە (الكلاسە) لە باکووری مزگەوتی ئومەوی لە دیمەشق بنیادی نا.

هەروەها خوێندنگەی (الكاملية) کە سوڵتان کامیل موحەمەدی کوڕی عادل لە قاهیرە لە نێوان دوو کۆشکدا بنیادی نا کە بە (دار الحديث الكاميلة) یش ناو دەبرا چونکە گرنگی دەدا بە لێکۆڵینەوە لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بە شێوەیەکی تایبەت، بەرپرسەکەیشی لە سەردەمی مەلیك صباڵحیدا زانای ئەندەلوسی ئەبو لخەتتاب عومەری کوڕی دوحەییەی بلنسی بوو (کۆچکردووی ٣٢ك) کە خاوەنی کتێبی (الطلوب في أشعار المغرب) ە و ئەو کتێبەیش چاپکراوە.

لە کوتاییدا (مەبەستمان ئەوە نیە کۆتا خوێندنگە بێت بەڵکو زۆر زیاتر بەلام ئێمە کۆتایی پێ دێنێن) ناوی خوێندنگە صالحیەکان دێنین کە سوڵتان سالح ئەییووب لە ساڵی (٦٤١ك) کۆچی بە هێڵێکی نێوان دوو کۆشکدا دایمەزراند، بۆ یەکمجار خوێندنگەیە لە میسردا هەر چوار مەزهەبەکەی پێکەوە دەخوێند (مەبەست چوار مەزهەبی سوننی شافیعی و حەنبەلی و مالیکی حەنەفیە) بۆیە بە شێوەی کۆناوی هاتووە، ئەمڕۆ هەر کەس سەردانی دەکات تەنها روخساری رۆژئاوایی لێ بەدی دەکات و پڕە لە نەخش و نیگار و نووسین و لە ناوەڕاستیدا دەرگایەکی تەختەیی هەیە کە لەسەرویەوە جێگەیەکی بانگدان هەیە و بەشەکانی تری خوێندنگەکەیش سیرانەوەی نەمانە و خەڵك داگیری کردن، لە پاڵ ئەو خوێندنگەیەدا گۆڕی مەلیك صالح ئەییووب هەیە شەجەرو دوری خێزانی بۆی بنیادی نا، ئەم گڵکۆیە لەو پەڕی وردەکاری و جوانی بنیادی تەختەییدایە.[1]

لە پاڵ ئەو خوێندنگانەیشدا قەڵای زۆری هەبوون کە ئەییوبیەکان دروستیان دەکرد،[2] هێندە بە سە ئاماژە بەوە بدەین هەموو شارێك لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە شارێك و قەڵایەکی خۆی و خاوەن سەربەخۆیی لە شارەکەی پێکدەهات، تا ئەوەی زۆربەی جار کاتێك شارەکە دەدرا بە دەستی داگیرکەران، قەڵاکەی خۆی

---

١ـ (النعيمي: الدارس في تاريخ المدار، نشر جعفر التسيفي).

٢ـ (ابن جبير: تذكرة بالأخبار عن اتفاقات الأسفار المعروفة برحلة جبير، نشر حسب نصار الجزء الخاص بالمنشآت العمرانية على عهد الأيوبيين).

نەدەدا بە دەستەوە چونکە توانای بەگریکردنی لە خۆی هەبوو و وا دانە دەنرا شارەکە بە تەواوەتی خۆی بە دەستەوە دابێت تا قەڵاکەیش گیرایە، لە گرنگترین ئەو قەڵایانەی ئەیوبیەکان بنیادیان نان قەڵای(الجبل) شاخ بوو کە سەلاحەدین لە بەرزایی شاخی(المقطم) بنیادی ناکە لەو ێوە دەیڕوانی بەسەر قاهیرە و فسطاط و نیل و قراخە دا، سەلاحەدین دەیویست بیکات بە قەڵا و پەناگەیەك بۆ خۆی و خێزانەکەی لە مەترسی شۆڕشە ناوخۆییەکانی و پیلانەکانی فاتیمیی و خەلیفە فاتیمیەکان، لە ساڵی ٥٧٢ك - ١١٧٦ز. دستکرا بە بنیاد نانی و بە هائەدین قراقوشی ئەسەدی ناسری وەزیری سەلاحەدین سەرپەرشتی دەکرد، ئەو بە چەند شورەیەکی گەورە چوار دەوری قاهیرەو فسطاط و نێوانیانی داو بنیادنانیدا چەند بەردێکی هەرەمە بچووکەکانی جیزەی بەکارهێنا، هەروەها سەلاحەدین لە چالاکی بنیادنانەکەدا پشتی بە ژمارەیەکی زۆری دیلە جەنگیە خاچپەرستیەکان بەست بە تایبەتی لە هەڵکەندنی گەشتیاری خەندەقی چواردەوری شورەکانی قەڵاکەدا کە خەندەقێك بوو لە بەرد دا تاشرا و بە پاچ ئەنجامدا، ئیبن جوبەیری گەشتیاری هاوسەردەمی ئەندەلوسی (کۆچکردنی ٦١٣ك/ ١٢١٧ز) سەرسامی خۆی بەو کارەنیشانداوە، کاری بنیادنانی قەڵاکەی لە سەردەمی فەرمانڕەوایانی دوای سەلاحەدیندا بەردەوام بوو وەك مەلیك کامیل موحەممەدی کوڕی عادل کە ڕووبەرەکەی فراوانکردو تیایدا چەند کۆشکێکی بنیادنا، ئەو یەکەم کەسی ئەییوبیەکانی بوو کە ئەو قەڵای کرد پێگەی دەسەڵاتی خۆی.

هێشتا نەخشێکی ڕۆژانی سەلاحەدین لەسەر دەرگای قەلای (الباب المدرج) ماوەتەوە و تیایدا دەڵێت: (بە ناوی خوای گەورە و بە خشندە و میهربان، مەولامان ناسر سەلاحی دنیاو دوا ڕۆژ ئەبو موزەفەر یوسف ئەییوب زیندوو ڕاگری دەوڵەتی سەرکردەی باوەڕدارا لە دیدی برا جێگیری خۆی مەلیك عادل سەیفەدین ئەبومحمدو دۆستی سەرکردەی باوەڕداران لە سەردەستی سەرکردەی ناوچەکەی وپاڵپشتی دەوڵەتەکەی) (قراقوش مەملووکی ناسیری لە ساڵی پێنج سەدو حەفتا ونۆدا فرمانیکرد بە دامەزراندی ئەم قەلا دیار و بەرژەوەندی دراو سێەی قاهیرە کە سوودو چاکە توانای ئەوانەی پەنایان بۆ ژێر سایەی دەسەڵاتەکەی هێناوە قایمو قولێ پێکەوە کۆکردوەتەوە).

تێبینی ئەوە دەکرێت ئەو نوسینە بە پێنووسی نەسخی ئەییووبی نوسرا، ئەمەیش پاڵپشتی ئەو وتە بە ناو بانگە دەکات، کە دەڵێت نووسینی نەسفی لە جیاتی کوفی لە سەردەمی سەلاحەیندا بەکار هاتووە، واتە لەو کاتەوەی مەزهەبی سوننی شوێنی مەزهەبی شیعی گرتەوە بە تایبەت لە بنیادو نینادا.

لەو قەڵایە دیمەشق، ئەم قەڵایە زۆر کۆنە، بەڵام وێرانە بوو بوو دواتر مەلیك عادل هات و سەر لە نوێ بنیادی نایەوە و بەسەر سەرکردەی ئەییووبیەکاندا دابەشکردو ئەوەنیش بە داهاتی خۆیان بنیادیان نانەوە و پێگەکانی بەرگریکارییان تێدا نوێ کردەوە، ئەمەیش لەسەر نوتێرین ڕێگە جەنگیەکانی سەردەمی خۆیان، ئەو قەڵایە هێشتا بە بورج و پێکهاتە سەربازیەکانیەوە تا ئێستایش ماوە، وا با بوو ئەو دروشمە لەسەر دامەزراوە ئەییوبیەکان دابنێت کە سەلاحەدین دایناބوو، ئەوەیش بریتبوو لە داڵێك بە یەك باڵیسیەوە (وەك دروشمی ئەمڕۆ ئێمە). ئاڵای ئەییوبیش لە ئاورشیمکی ڕەنگ زەرد و بەزێڕ نەخشێنرا و پێکهاتبوو و لە نازناوی سوڵتانی لەسەر بوو، شاعیر حەسەنی کوڕی عەلی شاتانی (کە خەڵکی شاتان بووە لە دیار بەکر کر لە چەزیرە) لەو بارەیەوە وەسفی سەلاحەدین دەکات دەڵێت:

(دەبینم بە ئاڵا زەردەکەتەوە سەرکەتوتن نزیکە. دەی بەرێکەوە دنیا بگرە دەست، چونکە تۆ پێی شیاوتری ئەو ئاڵا زەردە گەورەیە پێش سوپا دەخراو لەسەرویشەوە شیعرێك دەنووسرا کە پێی دەوترا (جیالیش) ئەمە نەرییێکی توورکی بوو کە دواتر لە ڕێگەی سەلجوقیەکانەوە گوازرایەوە بۆ ئەییووبی و مەملوویەکان. هەروەها ئەو نەریتە لەگەڵ سەربازە توورکەکان و ئەو غوزانە چوونە خزمەت موەحیدەکان و مورینیەکان گوازرایەوە بۆ ئەو پەڕی مەغربیش لیسانەدینی ئیبن خەتیب کە وەزێری غەرەناتی بوو وەسفێکی هێرشێك دەکات کە سوپای موڕینی پیێ هەستاوە و دەڵێت: (پاشان بە تیرو ڕم هاوێژی قسی عەرەبی یەوە هاتن و ئاڵاکانیان لەسر شێوای غوزە ڕۆژهەڵاتیەکان لە تەپڵ ڕوڕنا بوو لەسەرو ئاڵا کەیشیانەوە شیعریان نووسیبووە).

فەزل و گەورەیی ئەییووبیەکان تەنها لەسەر کەوتنە سەربازیەکان و دامەزراوە بنیادیەکاندا بەرتەسك نەبوو بوویەوە بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی لایەنەنا ئابووریەکانیش دەگریتەوە.

جا لە ئەنجامی کارێزانەی لە ڕۆژانی ئەوان لە میسردا لێدران کشیوکال گەشەی سەندو پێشکەوت و چەند ڕووبەرێکی فراوان میسر کە پێشتر ئاویان پێ نەدەگەیشت چاککران و چێنرا، لە شامیشدا ژمارەی (نافورەکان) زیادیان کرد کە کە نیزامی ئاودێری لەسەردەمی ئەییووبیەکاندا بە شێوەیەکی فراوانتر لەسەر وەستابوو، وشەی نافورە بە ناوی (Noria) ەوە گوازرایەوە بۆ زمانە ئەورووپیەکان.

لە ئەنجامدا داهاتی چەند بەرهەمێکی کشتوکانی ناو میسر وشام زیادیکرد و لێیَ دەنێردرا بۆ دەرەوە، وەك برنج و شەکرو کە بۆ یەکەمجار برایە ناو ئەورووپاو بە هەمان ناوێش نا دەبرا، دەڵێن ئیمپیراتۆری فردرێکی دووەم یەکەم کەس بووە پێشەسازی شەکری لە ڕێگەی صقلیەو لە ساڵی ١٢٣٩ز. دا بردوەتە نا ئەورووپا هەر چەند گومانمان لەوە نیە کە شەکر لە ڕێگەی مەغریب و ئەندەلوسەوە گوازرایەوە بۆ ئەورووپا، شوێنەوار ئاسان لەویَ چەندین دەزگای شەکر سازییان دۆزیوەتەوە مێژوو کۆنترینیان دەگەڕیەوە بۆ سەردەمی موڕابیتەکان لە مەملووکی ناسیری لە ساڵی پێنج سەدو حەفتاو نۆدا فرمانیکرد بە دامەزراندی ئەم قەڵا دیارە و بەرزە دراوسێیەی قاهیرە کە سوودو چاکە و توانای ئەوانەی پەنایان بۆ ژێر سایەی دەسەڵاتە کەی هێناوە و قۆڵێ پێکەوە کۆکردنەوە.

تێبنی ئەوە دەکرێت ئەو نووسینەی بە پێنووسی نەسخی ئەییووبی نوسراوە، ئەمەیش پاڵپشتی ئەو وتە بە ناوی بانگە دەکات کە دەڵێت نووسینی نەسخی لە جیاتی کوفی لە سەردەمی سەلاحەیندا بەکار هاتووە، واتە لەو کاتەوەی مەزهەبی سوونی مەزهەبی شیعی گرتەوە بە تایبەتی لە بنیادو بینادا.

لەو قەڵا گرنگانەی تریش سەر لە نویَ بنیادی نایەوە و بورجەکانی بەسەر سەرکردە ئەییووبیەکاندا دابەشکردو ئەوانیش بە داهاتی خۆیان سەر خۆیان

بنیادیان نانەوە و پێگەکانی بەرگریکارییان تێدا نوێ کردەوە، ئەمەیش لەسەر نوتیرین رێگای جەنگیەکانی سەردەمی خۆیان، ئەو قەڵایە هێشتا بە بورج وپێکهاتە سەربازیەکانیەوە تا ئێستایش ماوە، وا باو بوو ئەو دروشمە لەسەر دامەزراوە ئەییوبیەکان دابنێت کە سەلاحەدین دایناوبوو، ئەویش بریتبوو لە داڵێك بەیەك باڵیەوە، (وەك دروشمی ئەمێروی ئێمە). ئاڵای ئەییوبیش لە ئاورشمێکی رەنگ زەردو بە زێر نەخشێنرا و پێکهاتبوو و ناوو نازناوی سوڵتانی سەر بوو، شاعیر حەسەنی کوڕی عەلی شاتانی (کە خەڵکی شاتان بووە لە دیار بەکر لە جەزیرە) لەو بارەیەوە وەسفی سەلاحەدین دەکات دەڵێت:

(دەبینم بە ئالای زەردە دەکەتەوە سەرکەوتن نزیکە، دەی بەرێکەوە دنیا بگرە بە دەست، چونکە تۆ پێی شیاو تری ئەو ئالا زەردە گەورەیە پێش سوپا خراو لە سەروە شعیرك دەنووسرا کە پێی دەوترا (جیالیش) ئەمە نەرێتێکی تورکی بوو کە دواتر لە ڕێگەی سەلجووقیەکان گوازرایەوە بۆ ئەییووبی و مەملووکیەکان. هەروەها ئەو نەریتە لەگەڵ سەربازە توورکەکان و غوزانەی چوونە خزمەت مووحیدەکان و مورینیەکان گوزرایەو بۆ ئەو بەری مەغریبش. لیسانەدینی ئیبن خەتیب کە وەزیری غەرناتی بوو وەسفێکە هێرشێك دەکات کە سوپای موریني پێی هەستاوە و دەڵێت: (پاشان بە تیرو رم هاوێژ قسی عەرەبی یەوە هاتن و ئاڵاکانیان لەسەر شێوەی غوزە، ڕۆژهەلاتیەکان لە تەبڵ و روڕنا بوو و لەسەرو ئالا کەیشیانەوە شیعریان نووسیووە).

فەزڵ و گەورەیی ئەییووبیەکان تەنها لەسەر کەوتنە سەربازیەکان و دامەزراوە بنیادیەکاندا بەرتەسك نەبوو بوویەوە بەڵکو و بەشێوەیەکی گشتی لایەنە ئابووریەکانیش دەگرێتەوە.

جا لە ئەنجامی ئەو کارێزانەی لە ڕۆژانی ئەوان لە میسردا لێدران کشتوکاڵ گەشەی سەندو پێشکەوت و چەند ڕووبەرێکی فراوانی میسرکە کە پێشتر ئاویان نەدەگەیشت چاککران چێنران، لە شامیشدا ژمارەی (ناعورەکان) زیادیان کرد کە نێزامی ئاودێری لەسەردەمی ئەییوبیەکاندا بە شێوەیەکی فراوانترین لەسەری

وەستا بوو، وشەی ناعورە بە ناوی (Noria) ەوە گوازرایەوە بۆ زمانە ئەوروپیەکان.

لە ئەنجامدا داهاتی چەند بەرهەمێکی کشتوکالەکانی ناو میسر و شام زیادیکرد و لێی دەنێردرا بۆ دەرەوە، وەك برنج و شەکر کە بۆ یەکەم جار برایە ناو ئەوروپاو بەهەمان ناویش ناو دەبرا، دەلێن ئیمپراتۆری فردریکی دووەم یەکەم کەس بووە پیشەسازی شەکری لە رێگەی صقلیەو لە سالّی (١٢٣٩) ز. دا بردوەتە ناو ئەوروپا هەر چەندە گومانمان لەوە نیە کە شەکر لە رێگەی مەغریب و ئەندەلوسەوە گوازرایەوە بۆ ئەوروپا، شوێنەوار ناسان لەوێ چەنەدین دەزگای شەکر سازییان دۆزیوەتەوە کە مێژوو کۆنترینیان دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی مورابیتەکان لە.

سەدەی پێنجەم و شەشەمە کۆچیدا (١١،١٢ن) هەروەها لەسەردەمی ئەییووبیەکاندا بازرگانی گەشەی سەند، هەمان جەنگە خاچپەرستیەکان یارمەتی ئەو گەشە سەندنە بازرگانیەیان دا چونکە لە پالّ مۆرکە و جەنگیەکەدا سروشتێکی ئابووریشیان هەبوو.

پاشان بازرگانە مەسیحیەکان بە تایبەتی بازرگانەکانی کۆمارە ئیتالیەکانی وەك جەنەواو بیزاو بوندوقیە رۆڵی نێوەندیان بینی گواستنەوە شمەکە رۆژهەلاتیەکان بە کەشتیەکانیان بۆ بەندەرە ئەوروپیەکان میسرو شامیش لەبەر ئەوەی کەوتبوونە سەرەرێی بازرگانی هیند بۆ فارس و عێراق و نیمچە دوورگەی عەرەب سوودیان لەو چالاکیە بازرگانیانە وەرگرت.

ئەییوبیەکان مۆڵەتیان بە هەندێ لەبازرگانیە مەسیحیەکان دا تا لەچەند شارو سەر سنورێکی میسر و شامیدا نیشتەجێ بن، جا لە رۆژی سەلاحەدیندا جا لەیەك لەپردی موسکی لەنزیك قاهیرەدا هەبوو، هەروەك لە ئەسکەندەرییەو دیمەشق و بەیروت حەلەبیشدا هەبوون، ئەمانە چەند ئوتومبێلێکیان هەبوون کە بەئاژەلّ و سولّتان ئەییوبیدا بەپێی پەیماننامەی بازرگانییە بەستراوەکانی نێوان هەردوولا بەرژەوەندیەکانی ئەوانیان دەپاراست. بازرگانە مەسیحسەکانیش وایان دەبینی

بەرژەوەنـدیان لـەوەدا بەفـشار نەخەنـەوەك دراوێکـی تایبـەتیارە وەك دینـاری (صـوری)[1] لێـدا کـە ئایـەتیٚ:ی قورئانیـان بـەزمانی عـەرەبی لەسـەری نەخـشاند تـا مسولْمانان ئامادەبن کاری پـێ بکـەن. دەڵـێن: بابـا ئەنۆنـستی چـوارەمبەهۆی ئـەو ئایەتەوە بەکارهێنانی ئـەو دراوەی حـەرامکردووە، کاتێـك لوسـی سـێ یـەم لـەدوای هەڵمەتە شکستخواردووەکەی بۆسەر میـسر سـەردانی میرنـشینە خاچپەرسـتیەکانی شـامی کـرد دەسـتی لـەوکارە وەرداو بـەهۆی قەڵـەمیرەو بەدەتـدانی ئـەو ئایەتـە قورئانیە بگۆرێت دەسـتەواژەیەکی مەسـیحی کـە بـەزمانی عـەرەبی لەسـەر دینـاری صوری بنوسریت تا مسولْمانانی شام و عیراق ئامادەبن بەکاری بهێنن.

لەگرنگترین ئـەو شمەکـە بازرگانیانـەی ڕۆژهـەڵات لەئـەورووپا وەدیهێنـا تەختـەو کانزاو کۆیلە بوو، لەکاتێکدا ڕۆژهەڵات ئەو شمەکانەی دەرنار، کە پێشتر ئامـاژەمـان پێـدا، هـەروەها بازرگـانی ئاڵـەت و بـەهارات کەبـەناوی (الکـارم) ناسـرابوو، چـەند بازرگانێك هەبوون کە لەفرۆشتندا تایبەتمەنـد بـوون و بـەبازرگانی کارمـەیان کـارمی یان ئەکارییە ناسرابوون. ڕا لەسەر بنـەڕەتی ئـەو وشـەیە جیـاوازە، هەنـدێك پێیـان وایە بەواتای عەنبـەری زەرد دێـت، هەنـدێکی تـر پێیـان وایـە وشـەکە کـاتم بـووە و گـۆڕاوە بـۆ ئـەوە، کـاتم نـاوی شـارێکی باشـوری ئەفـەریقا لـەباکوری ڕۆژهـەڵات ی دەریاچەی تـشادەو چەند جالیەیـەکی بازرگـانی میـسرو یەمـەنی دەدرێتـەوە پـاڵ. دەسـتەیەکی تـر دەڵـێن مەبەسـتی لایەنـە چـاکەو بـەڕێزەکانی بازرگـانی عەدەلـە. هەرچۆن بێت ئەو ووشەیە لەبازرگانی ئاڵەت و بوهارات نراوە.

لەناو زۆری تێکەڵبوونی بازرگانە مەسیحیەکان بەژیانی ڕۆژهەڵاتی ژیانی تایبـەتی خۆیانـدا پیـشەنگیدان بەمـسولْمانانەوە دەکـرد ڕیـشیان دەهێـشتەوەو بـەرگی ڕۆژهەڵاتیان دەپۆشـی و خـانووو کلێـساکانیان لەسـەر شـێوە ڕۆژهـەڵاتی بینادەنـاو چواردەور و کەنیزەك و سەماکەرو قسەیان دەبوو.

---

١ ـ دیناری صوری دراوێکی بوندقیەکان لەشاری صور دەریانکردووە ئەو شارە مەڵبەنـدێکی گرنگی بازرگانی بـوو خاچپەرسـتان، لەکاتێکدا قلقشندی صوری وانادێنێـت کـە وێنـەی پاشـا فرەنجەکان لەسەر ئەو دراوە نەخشێنراوە.

هەموو ئەمانە تەنانەت لەکاتی جەنگی نێوان هەردوو لا دا ڕوویاندەدا، جا بازرگانەکان دەهاتن و دەچوون و کەس زیانی پێ دەگەیاندن. ئیبن جوبەیری گەشتیار ئەمە دەنوسێت و دەڵێت: (جیاوازی عەککا هەروابوو، بازرگانانی مەسیحیش کەس نەدەهاتە ڕێیان وەڕێگری لێ نەدەکردن.... دارو دەستەی جەنگیش سەرقاڵی جەنگی خۆیان بوون، بەڵام هاولاتیان و بازرگانان لە هەموو ڕوبارێکی شاستی یات شەڕدا لەئاراس و ئاسایش بەردەوامدا بوون).

بەو جۆرە لەسەر دەمی ئەیوبیەکان بازرگانی و پیشەسازی گەشەی ساندو ئوروپایش سودێکی زۆری لەو ڕاپەڕینە وەرگرت، جا لەدیمەشق و موسڵەوە ئەوچینراوە ئاوریشمیان گەیشتە ئەوروپا کەبەناوی Damask دیمەشق) و (Musulin (وشەی موسڵەو گۆڕدراوە) ناسرابوون، لەفارسیشەوە فەرش و قاڵی تەبریزو پێکهاتووە، کە لەناودارترین شارە فارسیەکانە.

پوختەی قسە ئەوەیکە دەوڵەتی ئەییوبی بەیەکێك لەو دەوڵەتە ئیجابیەکارایانەدا دەنرێت، کە لەیەشە جیاوازەکانی مەیدانە سیاسی و سەربازی و ئابووری و زانستیەکاندا کاری زۆر گەورەو گەشاوەی ئەنجامدا بۆیە مێژوو بەنەمری هێشتوویەتیەوە.

سوپاس بۆ خوا ئەم بەشەش تەواو بوو بەمە مێژووی ئەییوبیەکان تەواو بوو لەمەودوا مێژووی مەمالیك دێت.

# بەشی چوارەم

## گواستنەوەی دەسەڵات بۆ مەمالیکی دەریایی صالحی

جوانفیل چیرۆکێکی نامۆ دەگێڕێتەوە کە پوختەکەی ئەمەیە سەرکردە مەمالیکەکان دوای ئەوەی سوڵتان نوانشاهیان کوشت لەئەنجومەنی ڕاوێژکرندا تا با شالوسی نۆیەم دەسەڵاتی میسر بگریتە دەست، ئەگەر نەیانزانیبا دەمارگیری بۆ مەسیحیەت هەیەو لەوەترسیاوە نەبوایەکە ناچاریان بکات تا ناچاریان بکات ببن بەمەسیحی، ئەوا ئەو پێشنیارەیان جێبەجێ دەکردو لە خودی پاشایشەوە ڕەزامەندییان وەردەگرن.[١]

دیارە ئەو چیرۆکە لەبنەڕەتدا لەدروستکراوە و لەو باروگرۆیەوە دێت تووشی سەربازگەی بوو بوو و سەرکردەکانی مەمالیك سەرسام بوو بووە، کە خۆزگەی کوژرانی تورانشاه، لەخێراییەکی کتوپڕدا پاشان ئەییوبیەکان لەشام هەبوون لەسەروو هەموو شیانەوە ناسر یوسفی کوڕی عەزیز موحەممەدی کوڕی زاهیر غازی کوڕی سەلاحەدینی ئەیوبی هەبوو کە دوای مردنی باوك لەساڵی ١٢٣٧ز/ ٦٣٤ك. دەسەڵاتی حەلەبی گرتە دەست، لەسەر ئەوپاشا ئەییوبیەکان سەخت بوو بەو ڕازی بن مەمالیکەکان دەسەڵاتی خۆی بەکەسی شەرعی بزانێت، تا دوای تورانشاه دەسەڵات بگرێتە دەست.

هەر چۆنێك بێت وا دیارە مەمالیکەکان بڕیاریان دا ئەوگرێیە بکەنەوە کە لە چۆڵبوونی کورسی دەسەڵاتدا میسردا دروستبوو بوو ئەمەیش بەدانانی شەجەرودوری دایکی خەلیلی کوڕی صالح ئەییوب بەدەرنەکەوتنی دیمەنی لێدەرچوونی پاشان ئەتابەگیان خستە ڕوویان نوێنەرایەتی دەسەڵات نەهاتبوو، هۆکاری ئەمەیش ئەوەبوو هەموویان ڕقیان لێی بوو یان مەمالیك لەهێزو شارو

١ ـ Joinvilleihistory of saint. Louis by Evaans P.١٠٩

شکۆوخۆ دیاریکردنی ئەیبەکی تورکمانی[1] بۆ پایەی ئەتابەگی بەرچاو کەوت ئەو کەسەرکردەیەکی مەمالیکی دەریایی صالحی بووە ئەوە بەشیوەیەکی سروشتی بوویە هۆی دوژمناری نێوان ئۆقطای و ئەیبەك کە دواتر ئەنجامەکەی دەبینرێت.

لەمایۆی سالی ١٢٥٠ز/ ١٠ سەفەری سالی (٦٤٨ك) بەیعەت بۆ ژنە سولتانی نوێ وەرگیرا بەو پێیەی دایکی کورێك بوو، کە خەلیل شەجەر شا بوو کەلەتەمەنی باوکیدا مرد.[2] شەجەرودور سووربوو لەسەر ئەوەی لەنیشانەو ئامازەکانیدا کاروبار و مەراسیمەکانی بەناوەوە نیشانە بدات و دەینووسی (دایکی خەلیل). لەشێوەی نزایش لەسەر مینبەرەکاندا دەوترا (خوایە بەری چاکەخوازی شاژنی موسلمانان عیسمەتی دونیا و ئایین دایکی خەلیل موستەعسەمیە خاوەن دەسەلاتی چاکە بپارێزە) هەروەها بەمجۆرە ناوی لەسەردراو نەخشێنرا (المستحمیه الصالیحه ملکه المسلمین والدی خلیل أمیر المؤمنین).[3]

لبە چۆلی مێژوو نوسی ئینگلیزی لەکتێبەکەیدا (تأریخ مصر فی الصور الوسفی) باس لەوەدەکات کە وشەی موستەعسەمیەکە پێشتر باسکرا بەلگەی شەجەرودور وەك کەنیزەکی خەلیفە موستەعسەمی عەبباسی (١٢٤٢ ـ ١٢٥٨ز) بووە پێش ئەوەی مەلیك صالح ئەییوب بیکرێت، بەلام سەرچاوە عەرەبیەکان کە لەو بابەتە بێدەنگن ئەوە هەلدەگرێت، کە پێدەچێت شەجەرودور لەدووا ووتاریدا ئەوەی وەك

---

١ ـ وشەی ئەیبەك لەدوو ووشە پێکدێت کە یەکێکیان (ئای) بەواتای مانگ دێت، (بەگ)یش بەواتای مانگە، جا سەکردەی مانگ واتاکەیەتی (أبو المحاسن: النجوم الزاهره جـ ٧، لا ١٩) ئەیبەگ لەبنەرەتدا مەملوکی مندالانی تورکمانی بوو، کە ئەوانە بەنورەسول بوون، کە لەیەمەنە سەربەخۆییان وەرگرت، بۆیە لەتورکمان لەخیلافەتی موستەنجیدا (کۆچکردووی ٥٦٦ك) هاتن بۆ بەغداد، هەیانە رەچەلەکەکەی بۆ غەسارە دەگەرێتەوەو هەیانە نایانباتەوە سەرتورکمانەکان. (الخزرجی: العقود اللؤلؤیة في تأریخ الدولة الرسولیة جـ ١ لا ٢٧ ـ ٩٨.

٢ ـ أبو شامة: الذیل علی الروضتین ص ١٩٦.

٣ ـ لەمۆزەخانەی بەریتانی چەند دراوێکی زێرە هەیە کە (قاهیرە لەسەردەمی جەرودوری ٦٤٨ ك. لێدراون نازناوی ئەم شا ژنەیان لەخۆ گرتبوو.

ڕازیکردنی خەلیفەی عەبباسی نووسیبێت تادان بە بوونی دەسەلاتەکەی بنێت باسێکی تر لەمەبارەیەوە ماوە کە پێویستە ئاگاداری بین ئەویش ئەوەیە کە لەعێراقدا کەنیزەیەکێکی تر هەبوو و کەبەشەجەرودروزناودەبرا و کەنیزەکی خەلیفە نارد لیدینیلاهی عەبباسی بوو(١١٨٠- ١٢٢٥ز)و لێی نزیك بوو، دەستنوسێکی چاکی هەبوو ئەو زانیاریانەی لەسەری هاتبوون کاتێك تێروانینی بۆیان دەگوڕا ئەمە کەنیزەکەی بۆی دەخوێندەوە و سولتانیش حەزی بە وەلامی ئەو کەنیزەکە بوو. لەسالی ١٢٣٦ز / ٦٤٣ك. ئەو کەنیزەکە مرد لەخاکی (الخلاطبة)لە بەغدا بەخاك سپێرا.[1] پێدەچێت لێن پوڵ شەجەردوی عێراقی لەگەڵ شەجەردوی میسردا یێکەڵ بوو بێت.

هەر چۆنێك بێت شەجەرود کاروباری میسری بەدەستێکی پۆلایینەوە گرتە دەست، ئیبن ئیاس کاتێك وەسفی ئەو ئافەرتە بە ئافرەتێکی توندو تۆڵ و بە غیرەت و بەتوانا و دلێری زۆر و ئەوپەڕی ئابڕووی سەرمەستی لەسەر کوتکردنی شالاوی گەورەی خاچپەرستیدابۆ سەر میسر فەزلی ئەوی لەخۆدەگرت، کە هاتە سەردەسەلات هاودەمیەکان دانیان بەو فەزلەیدا نا. جگە لە ڕەزیە تودین شاژنە دلهی(١٢٣٦- ١٢٤٠ز) ئیتر شەجەرودور بەیەکەمە شاژنی موسلمان دادەنرێت کە لەسەرد کورسی دەسیلاتێکی ئیسلامی دانیشتبێت لە ڕاستیدا ئیبن ئیاس بەبەشێکی دەولەتی ئەییووبی دادەنێت، بەلام بێگومان دەولەتی ئەییوبیەکان هەبووبێت لەسەر مەمالیکەکان سەخت بووبێت پیاوانی بنەمالەی ئەییوبی لەشام شیاوی ئەوە بن دەسەلاتی قاهیرە بگرنەدەست.

یەکەم کار کە شەرەتودور گرنگی پێدا بریتیبوو لەیەکلاکردنەوەی هەلوێست لەگەڵ فرەنجەکان و کۆتایی هێنان بەدانوستانانەی لەسەر دەمی توانتاه لەگەڵ خاچپەرستاندا دەستیپێکرد تا لەمیسر دەریان بکەن.

---

١ ـ ابن الفوطي: الحوادث الجامعة ص ٩٧.

ڕوایژکاری میسر کە میر حیسامەدین ئەبوو عەلی هەزبانی بوو لەگەڵ نوسی نۆیەمدا ڕێککەوت لەسەر وەرگرتنەوەی دەمیاط وچۆڵکردنی ڕێگەکەی و ڕێگە بۆخۆی و گەورەدیلەکانی تر بەرامبەر بەفیدیەیەك عەککا بدات. جریت دی بروڤانسی شاژنی فەرەنسا کی لەو هەڵمەتە دا هاودەسی مێردەکەی بوو کە یەك لەدمیاط لەوماوەی کە خاچپەرستان لەمیسر یوون، ئەو ژنەهەستا بەکۆکردنەوەی بیری داواکردنی پارەکە تا نیوەکەی بدات. پاشان لەگەڵ کوڕەکەیدا لە دمیاط بوبووی و ناوی نابوو جان تریستان واتە زادەی غەمباریەکان لەدەریاوە پەڕیەوە بۆ عەککا جوانفیل دەگێڕێتەوە شاری دمیاط لەشەشی مایۆی ساڵی ١٢٥٠ ز درایەوە دەست میسریەکان و کۆمەڵێك لەمەمالیکەکان کەوتنە تالان و بیری سەربازگەی فرەنجەکان ئەمەوای لە لویسی نۆیەم کرد تا قەشەیەك بەناوی ڕائوولەوە بنێرێت بۆ لای میرئۆقطای و سکالای ئەو کارە بکات. ئۆقگایش وەڵامی دایەوە(ڕائوولی برام بەپاشا بڵێ من ناتوانم خراپەکان چاك بکەمەوە و دڵم بەخراپە بێزارەو لەجیاتی من با وریا بێت هیچ شتێك نیشان نەدات لەوەی کە لەدەروندا کڵپەدەکات تا ئەوکاتەی لەبەردەستی ئێمەدایە ئەگەر نا مەرگ سەرەنجامی دەبێت). ئەوە دەبڕێنەوە واتاکەی ئەوەیە ئۆقگای بەوباری هەڵوێستەی دەسەڵاتی شەجەرودو ئەتابەگی ئەیبەك ڕازی نەبووە. پاشان لەوەی کە وتویەتی زیادەڕەون نەکردووە. چونکە دەستەیەکلەسەرکردەکان لەسەروی هەموویانەوە میر حسامەدین ئەبوو عەلی هەزبانی هەر لەسەرەتاوە وای بەبەرژەوەندی مسوڵمانان دەزانێت و لەنەسرانیەیشدا پاشە ئایینیەکەی گەورەیە و دمیاگیش کەوتوتەوە دەست مسوڵمانان، بەڵام شەجەردو چەند سەرکردەیەکی سوپا ئەودەستە و تاقمەیان ڕازیکرد بەوەی کە پێویستە ڕێزی ئەو بەڵێنە بگرن کە لە سەرخۆیان دایاننەوە.

پاشان لویسی نۆیەمەو شوێنکەوتەکانی لە ٧ی مایۆی ساڵی ١٢٥٠ز(سەفەری ساڵی ٦٤٨ك)دا لە دەریاوەبەرەو عەککا چوون و بەمەیش ئەو شاڵاوە خاچپەرستە کۆتایی پێهات کە ڕووداوەکانی نزیك بوون بە کۆتایی دەوڵەتی ئەییوبی و دامەزرانی دەوڵەتی یەکەمی مەمالیك لەمیسردا.

شەجەرودتو دور خۆی لە هەموان نزیك دەكردەوە و هەوڵیدا بەهەر جۆرە پێناوێك ڕازییان بكات بەتایبەت مەمالیكەدەریاییەكان كە ماڵو سامانێكی زۆری بەسەریاندا ڕژاندو زەویەكی فراوان و مووچەی باڵای بریەوە بۆیان. بەلاملەگەڵ ئەوەیشدا میسریەكان بەگشتی ڕقیان لەوەبوو ئافرەتێك دەسەڵاتدار بێ و چەندین ڕێپێوان وبارگرژی لەقاهیرەدا ڕوویدا تا ئەوەی حكومەت ناچاربوو دەرگاكەی شارەكە دابخات نەوەك بارگرژیەكان بگاتە ناوچەكانی تری وڵات پیاوانی ئایینی لەپشت ئەم بزوتنەوە بارگرژیەدا بووە بەبەڵگەی ئەوەی سیوگی دەیگێڕیتەوە شێخ عیزەدینی كوڕی عەبدوسەلام كە گەورەترین سەكردەی ئایینی بوو لەوكاتەدا كتێبێكی نووسیوە لەسەر ئەو گرفتەی مسوڵمانان تووشی بون كە ئافرەتێك سەركریان بێت. بۆ ئەمەیش پش بەفەرموودەیەكی پێغەمبەرﷺ دەبەستین كە دەفەرموێت: ((لن يفلح قوم ولوا أمرهم امرأة))[١]

مەمالیك ناسر یوسفی بەرپرسی حەلەب و نەوەی سەلاحەیدن ئەمەی دەرفەتی لەبارەی قۆستەوەو بەسوپاكانیەوە بەرو دیمەشق كشا و دەستگیرت بەسەر یمەشق

---

١ ــ السيوطي: حسن المحاضرة في اخبار مصر والقاهرة ص ٣٤. شێخ عیزەدین كوڕی عەبدوسەلامی شافیعی لەساڵی ٥٧٧ كۆچی لەدایك بووە لە دیمەشق لەسەر دەستی زانایانی سەردەمی خۆی وەك ئیبن عەساكیر خوێندوویەتیو وتار بێژی وپێش نوێژی مزگەوتی ئومەی دیمەشقی كرتوەتە ئەستۆ ئەبو شامەبوەتە خوێندكاری و لەدیمەشق ماوەتەوە تا مەلیك صالح ئیسماعیل بەرپرسی ئەوێ پەنای بۆ فرەنجەكان بردووە، شێخ عیزەدینیش سەركۆنەی كردووەو لەساڵی ٦٣٩ك چووە بۆ میسر و كەلیك صالح ئەییوب چووە بۆ لای و وتاربێژی مزگەوتی عەمری كوڕی عاصی پێ سپاردووە.

كاتێك صالح ئەییوب لەنێوان دوو كۆشك لەقاهیرەدا خوێندنگەكەی خۆی دامەزران ئەوی ڕاسپاردتا مەزهەبی شافیعی تێدا بوترێتەوە. بەردەوامە ئەو پایە بەرزەی هەبوو تا لەمیسر لەساڵی ٦٦٠ك كۆچی دوایی كرد. دەڵێن كاتێك تەرمەكەی برا بەژێر قەڵاكەداو سوڵتان زاهیر سەلاتی من چەسپا چونكە ئەو زانا گەورەیە ئیگەر بیخەڵكی بوتایە لەدەسلاتی لابدەن ئەوا دەسەلاتی لەمن دادەڕنی. بگەڕێرەوە بۆ تاج الدين السبكي: طبقات الشافعية الكبرى ج٥ ص ٨٠، أبو الفداء: المختصر في أخبار البشر ج٣ ص ٢٢٤، السيوطي: حسن المحاظرة في أخبار مصر والقاهرة ص ٣٤.

و چەند شارێکی تری شامدا بەبێ ئەوەی هیچ جەنگێك ڕوویدات، پشان بەرەو باشوور بەرەو میسر درێژەی بەکشانەکەی خۆی دا.

مەمالیکیەکان ترسان دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکەیان بە کێبڕکێ ئەییوبیەکان لەناوبچیت. بۆیە نامەیان بۆ خەلیفە موستەعسەمی عەبباسی نووسی و داوایان لێکرد پاڵپشتی دەسەڵاتی شەجەرودوربکات، لەپێش ئەمەوە ئامانجیان ئەوەبوو بەسیاجی پاڵپشتی شەرعی دەسەڵاتی خۆیان قایم و قوڵ بکەن، بەڵام خەلیفە ئەوەی بەشەرم بۆ ئەوان زانی کە ئافرەتێك فەرمانڕەوایان بێت و بۆی نووسین: ((ئەگەر پیاوتان نەماوە پێمان بڵێن با پیاوێکتان بۆ بنێرین)) کاتێك وتەکەی موستەعسەم گەیشتە قاهیرە، سەرکردە مەمالیکەکان دانیان بەهەڵەکەی هەڵوێستی خۆیاندا ناوە وتیان: ((تا ئافرەتێك پاشامان بێت ناتوانین ولاّ بپارێزین. هەر دەبێت پیاوێك دابنێن کە هەموان پێی ڕازی بن)).

بۆیە ئاماژەیان بۆ شەجەرودور کرد، تا شووبکات بە ئەتابەگی تورکمانی و دەستبەرداری دەسەڵات بێت بۆ ئەوەی ئەویش ڕازیبوو خۆی لەدەسەڵات دارنی ئەمەش لە یۆلیۆی ساڵی (١٢٥٠ن)دا بوو دوای ئەوەی هەشتا ڕۆژ فەرمانڕەوایی کرد.

لەڕاستیدا دەسەڵاتی شەجەرودور لەمیسر زادەی ئەو باروودۆخە بوو کە لەوکاتەی دا تووشی میسر بوو بووهەروەها لەئەنجامی ڕازمەندی کۆمەڵێك لە هاودەمەکانی یان خشداشیە مەمالیکەکانی بوو، گەر نا ئەنجامی ڕەزامەندی گەل یان پیاوانی ئایینی یان خیلافەتی عەبباسی نەبوو، ئەمە وێڕای ئەوەی بوونی شەجەرودو بەسەرکردە نەشەریعەت و نەباو ونەریتی ئیسلامی دانیان پێدا نەدەنا.

ئەیبەکی تورکمانی کوری دەسەڵاتی میسری گرتە دەست و نازناوی سوڵتان مەلیك موعەیزی وەرگرت لەڕاستیدا ئەیبەك گەورەترین سەرکردەی مەمالیکیەکان نەبوو نەلەتەمەن و نەلە خزمەت نەلە تواناو پلەو پایە و ڕایە قەڵەمڕەویشدا چونکە کەسانی لەو بەەمەنتر و لەپێشتر و بەتواناتری وەك فارسەدین ئۆقگای و ڤاهیر بیبرس هەبوون ئەم بارە نائاساییەی ناو نیزامی مەملوکی وای لەمێژوو نووسانی وەك ئەبولمەحاسین کردووە لە کتێبەکەیدا (النجوم الزاهرە) ئەیبەك بەلاوازی شان و شکۆو قەڵەمیرەویش تۆمەتباربکات و بڵێت سەرکردەکانی تەنها لەبەر ئەوە هەوڵیان

بژاردووە تاکەی بیانەوێت لای ببەن.

هەروەها بلوشیەی ڕۆژهەڵات ناسیش بۆ ئەوە دەچێت ئەیبەك لەگەڵ لابردنی شەجەرودو وەك مێردی شاژنێك فەرمانڕەوایی دەکرد لەگەل ئەوەی خۆی فەرمانڕەوابوو، بەڵام ڕووداوەکانی بەڵگەی ئەوەن کە ئەیبەك پیاوێکی نایابی خاوەن سیفەتی سیاسی ویەکلایی و دلێری بووەو وەك ئەو مێژوونووسانە دەڵێن کەسایەتی لاوازی نەبووە. ئەبولمەهاسین خۆی هەسی بەو هەڵەیەکردووە کەتێی کەوتووە کاتێك لەکتێبەکەیدا (النجوم الزاهرە) ئەیبەك بەلاوازی وەسفی دەکات چونکە لەکتێبەکەی تریدا (المنهل الصافی) وەسفی چاکەی ئەیبەك دەکات و بەئایین پەروەری و توندو تۆڵی و ژیری وسیاسەتمەداری وەسفی دەکات و دەڵێت ئەو دەوڵەتی لەومەترسیە دڵنیا و هاتووە ڕزگارکردووە.[١]

ئەگەر باسی ئەوگرف و سەختیانە بکەین کە بەرەو ڕوی سوڵتان ئەیبەك بوومەتەوە دەبینین خۆیان دەبینەوە چەند هەڕەشەیەکی ئەییوبیەکان و خاچپەرستان لەدەرەوە شۆڕشەکانی عەرەبەکان لەناو خۆداو دواتر مەترسی خاوڕی مەمالیکەکانی لەناوەخۆودەرەوەی وڵاتدا.

## ١ـ مەتری ئەییوبی و خاچپەرستی:

مەترسی ئەییوبی خۆی لەشام و لەسەرکردە ئەییوبیەکانی ئەوێدا دەبینیەوە لەسەر هەمووشیانەوە مەلیك ناسر یوسفی بەرپسی حەلەب و دیمەشق. ئەیبەك هەوڵی دەدا ئەو بەرهەڵستکاریە ئەوییوبیە بەهۆی دانانی سەرکردەیەکی نەوەی ئەییوبیەکان لەپاڵ خۆیدا تێکبشکێنێت، ڕا لەسەر ئەوە بوو کەسێك دابنێن، کە بەئەشرەف مووسا ناو دەبرا[٢]، ئەو منداڵێکی تەمەن حەوت ساڵان بوو، تا ببێتە

---

١ ــ أبو المحاسن: المنهل الصافي والمستوفي بعد الوافي ج ١الوحة ٢(مخطوط بدار كتب المصرية).

٢ ـ ئەشرەف موسای کوڕی یوسفی مەسعودی کوڕی کانیلە، مەسعودی باوکی بەرپرسی ئەقیسف ناسرابوو لەساڵی ١٢٢٨ز دا مرد باوکی لەکۆشی صالح ئەییوبیدا گەورە بوو تا منداڵە بچووکەوە موسای لێکەوتەوە. (المقريزي: ج ١ ص ٣٦٩).

هاوبەشی دەسەڵاتی ئەیبەك، ئیتر لەوتاردا ناوی هەردوکیان لەسەر مینبەرەکانی میسرو ناوچەکانی دەهات، بەناوی هەردووکیشیانەوە دینارو درهەم لێدراوە، بەڵام ئەو فێڵە ئەییوبیەکانی بێدەنگ نەکرد، چونکە ئەوان بەچاکی دەیانزانی ئەشرەف موسا تەنها ناوەو بەس لەکاتێکدا هەمووکاروبارەکان بەدەستی ئەیبەکە، ئەوکات ئەیبەك ڕایگەیاند وڵات لەژێردەسەڵاتی خیلافەتی عەبباسی خاوەن دەسەڵاتی کۆنی وڵاتدایە و ئەویش نوێنەری خەلیفە موستەعسەمە لەوێ. بەم فێڵە یان ئەیبەك لەهەوڵێدا بەرگریکاری ئەییوبی تێکبشکێنێت بەڵام ئەوەشەوە نەوەستا، چونکە دەیزانی ناسر یوسف هەرگیز بەو ئاسانیە واز ناهێنێت بۆیە خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگان لەگەڵ ناسر یوسفدا.

مەلیك ناسر یوسف پێی وا بوو بۆ ئەوەی زامنی سەرکەوتنی هەڵمەتەکەی بۆ سەر میسر بکات پێویستە پاشا دژ بەئەو بکات ئەوا هەموو خاچپەرستانی ناو میسر دەکوژێت، لەهمان کاتدا ئامادەیی خۆی نیشان دا بۆ گۆڕانکاری لەپەیماننامەکەی دمیاط و دەستبەردار بوون لەنیوەی ئەو فیدیەی بڕیاری لەسەر درابوو ئەگە بێتو دژ بە ناسر یوسف هاوپەیمانی لەگەڵدا ببەستێت، بەلام لویسی نۆیەم مەوای پێ باش بوو هەڵوێستی بێلایەنی لەنێوان هەردوولادا بنوێنێت و لەبەرژەوەندی خۆیاندا ناکۆکی نێوانیان بقۆزێتەوە.

کاتێك ناسر یوسف لەهاریکاری لویسی نۆیەم بێهیوا بوو بەسوپاکانیەوە بەرەو میسر کشاو ئەیبەکیش بەپەلە چوو تا بەرەو ڕووی بێتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا موسا خاچپەرستان هێرشێکی کتوپڕی بکەنەسەر میسر بۆیە فرمانی کرد سەر سنوورەکانی دمیاط وێران بکات، بەمەلە ڕۆژی دووشەممە ١٨ی شەعبانی سالی ٦٤٨ك/ کۆتاییەکانی ساڵی ١٢٥٠زدا شورەکانی وێران کراوە، تا هەموو ڕووخێنرا و هیچی نەما جگە لەمزگەوتەکەو بەشێکی سەرکەناراوی نیل نەبێت، کە کۆمەڵێك لەڕاوچیان و هەژاران تیایدا بوون و پێیان دەوت (المنشیه).[١]

---

١ ـ المقریزي: السلوك ج ١ ص ٣٧٢. دمیاط بەردەوام لەوبارەدا بوو تا سوڵتان بیبرس بوندو قداری سەر لەنوێ لەساڵی ١٣٧١ز/ ٦٦٩كۆچیدا بنیادی نایەوە(بڕوانە ابن إیاس: سەرچاوی پێشو، ج ١ ص ٨٧، ١١١).

پاشان مەمالیك و ئەییوبیەکان لەجەنگێکی گشتی و لەشاری (العباسە) لەنێوان شاری بلبیس و شاری صالحیە لە ٣ فبرایەری ساڵی ١٢٥١زدا پێکانداراو وتیایدا یەکەمجار مەلیك ناسر سەرکەوت، بەڵام دەستیەك لەمەمالیکەکانی کە عەزیزیەکان[١] بوو فێڵیان لێکرد و دایانە پاڵ مەمالیکەدەریایەکان، چونکە بەپێی سەرچاوە هاوسەردەمەکان ئەوان لەگەڵ مەمالیکە دەرياییەکاندا هاو ڕەگەز بوون، بەمە ناسر بە کوڕانی بنەماڵەی ئەییوبیەوە بەشکاوی بەرەو شام ڕایانکرد هاو ڕەگەز بوون، بەمە بەجێهێشت. ئەیبەك بریاریدا درێژە بەکشانی خۆی بەرەو شام بدات تا بەسەر مەڵبەندەکانی بەرگرتیاری ئەییوبیدا سەرکەوتن، بۆ ئەوەی سەرکەوتن بۆ پرۆژەکەی زامن بکات هەوڵیدا لویسی نۆیەمی بداتە پاڵ خۆی و بەڵێنی بەیتولمەقەدیسی پێدا ئەەر بێتو بەسەر مەلیك ناسر یوسفدا سەرکەوێت، لویسی نۆیەم دوای ئەوەی بینی بەری میسری لەسەرکەوتندایە چوو بەدەم پێشنیارەکەی ئەیبەکەوە وسیاسەتی بێلایەنی واز لێهێنا.

لەسەرەتاکانی مایۆی ساڵی ١٢٥٢زدا ئەیبەك و لویسی نۆیەم، ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی هەڵمەتێکی هاوبەش ببەن تا ناسر یوسف لەشام دەربکەن. ئەو نەخشە لەسەری ڕێککەوتبوون ئەوە بوو، کە لوریسی نۆیەم دەستگیر بکرێت بەسەریافادا، لەکاتێکدا ئەیبەك غەززە بگرێت، لەوێوە هەردوو سوپا لەنیوەی مایۆی ساڵی١٢٥٢زدا. پێکەوە کۆ ببنەوە تا هێرشێکی گشتی هاوبەش ببەنە سەرو ویلایەتی ئەییوبیەکان.[٢] بۆ جێ بەجێکردنی ئەو پیلانەش مەلیك لویسی نۆیەم شاری یافای بەبێ بەرگریکاری داگیرکرد و مەمالیکەکانیش بەسەرکردایەتی ئۆقطای بەرو غەززو پێشڕەوییان کرد، بەڵام مەلیك ناسر یوسف کە هەواڵی ئەوهاوپەیمانیەی بەست پێش ئەوان بەهێزێکی گەورەی جەنگیەوە چووتا داگیری بکات، بەو کارەی دلێرانەش توانی نەهێڵێت مەمالیکیەکان بگەن بەخاچپەرستی هاوپەیمانەکانیان و نەخشە هاوبەشەکەیان تێکبدات.

---

١ ـ عەزیزی لەبەر عەزیز موحەممەدی باوکی ناسر یوسف، دوای مردنی باوکی لەساڵی ١٢٣٦ز چوونە خزمەتی ئەو.

٢ ـ King.Op. cit. p.٢٥٠.

سوپای مەمالیك لەصالحیەو سوپای ئەییوبیەکانیش لەغەززە درێژەیان بەکشانەوەی بەڕووی ئەویتردا داتا لەکۆتاییدا خەلیفەی عەباسسی موعتەسەم بیلا کەوتە نێوان هەردوولا و نەجمەدین بادەرانی[١] نوێنەری خولیفە توانی لەئەپریلی سالی ١٢٥٣زدا/ ٦٥١ك دا. ڕێککەوتنێك لەنێوانیاندا ببەستێت لەسەر ئەوەی میسرو باشوری فەلەستین بەغەززە و بیتو لمەقەدیسەوە بۆ مەمالیك بێت و ولاتی شامیش لەدەس بنەماڵەی ئەییوبیدا بمێنێتەوە و بەو جۆرە لویسی نۆیەم نەیتوانی هیواکەی خۆی بەدیبهێنێت کە بریتیبوو لەگرتنی بەیتومەدیس دوای ئەوە نەیتوانی لەشامدا بمێنێتەوە بەتایبەت دوای مردنی شاژنە بلانشی (قشتالی) دایکی لەکاتی دووری لویس لە فەڕەنسا وەك وەسی فەرمانڕەوایی فەڕەنسا دەکرد بۆیە لویس سالی ١٢٥٤ز دا ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ ولاتی خۆی.

پێویستە لێرەدا دا تێبینی ئەوە بکەین دەستتێوەردانی خەلیفەی عەبباسی لەوکاتەدا بەئامانجی وەستاندنی ڕەگدا کوتانی خاچپەرستی لەکاروباری ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا نەبوو و بەس، بەلکو ئامانجیش بوو هەولەکان یەکبخات بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی ئیسلامی لەبەردەم مەترسیەکی نوێی تریناکتر لەمەترسی ختچپەرستی کە ئەویش مەترسی مەغۆلی بوو، کە بەسەرکردایەتی جەنگیزخان سنووری ئیسلامی بڕیبوو دەولەتی خوارزمی لەناو برد بوو، کە وەك بەربەرستی پارێزەری هەموو دەولەتانی ئیسلامی بوو لە ڕۆژئاوای ئاسیاو ڕۆژهەلاتی نزم لەشالاوی مەغۆل و ئاسیاییەکانی تردا. بەمجۆرە بەربەرستی یەکەمی بەردەم دامەزراندنی دەولەتی مەملوکی تازە پێگەیشتوو کۆتایی پێهات، کە بریتیبوو لە ململانی نێوان مەمالیك و پاشایانی بنەمالەی ئەییووبی.

## ٢ـ شۆڕشی عەرەب دژ بە دەسەلاتی مەمالیك:

بەربەستی دووەم کە هاتە ڕێی سولتان ئەیبەك ئەو شۆڕشە جەماوەریە بووکە عەرەبەکان لەمیسر لە سالی ١٢٥٣ز. دا بەپێ هەستان.

دیارە ئەو هۆزە عەرەبیانەی لەدوای فەتحی ئیسلامی نیشتەجێ بوون

---

١ ـ بادەرانی لەناوی گوندی بادەران لەئەسبەهان هاتووە.

بەرەبەرەدەبوون بە گەلێکی کشتوکاڵی سەقامگیر بەتایبەت لەهەرێمی صەعید و ڕۆژ هەڵاتیدا و ناوی عەرەبە کشتوکاڵیەکانیان لێنرا. ئەو عەرەبانە لەنزیکی گوندە کۆنەکانی جوتیاراندا کە هی خەڵکی وڵات بوون کشتوکاڵیان لەزەویدا دەکرد.

بەڵام تێبینی دەکرێت ئەو عەرەبانە پلەو پایەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزتریان لەجوتیاران هەبوو بەهۆی ئەو یارمەتیە جەنگیانەی لەکاتی جەنگدا پێکەشی دەوڵەتیان دەکرد بەتایبەت لەدەوروبەری جەنگە خاچپەرستیەکاندا شێخە عەرەبەکان دەبوو لیزانی ناو گوندو لادێکان بپارێزن هەروەها لەبەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و دانی باجدا بەشداریەکی زۆریان هەبوو.

توندو تیژی سەرکردە مەمالیکیەکان لەسنورداركردنی نرخی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان و یاری پێکردن و قۆرخکرد بەنرخی ئەو بەرهەمانە لەهەندێ جاردا، لەو هۆکارانە بوو، کە بەو جوتیارە عەرەبانەوە تا بەدرێژایی سەردەمی مەملوکی چەند شوێنێك ئەنجام بدەن، ئەو شۆڕشانە لەکتێبە هاوسەردەمیەکاندا ناسرابووە بە(فساد العربان) بەشێوەیەکی ئاسایش بەشکستی عەرەبەکان کۆتایی پێ دەهات، چونکە مەمالیکەکان لەهونەرەکانی جەنگدا لێهاتووو شارەزا بوون.

مەمالیکەکان بۆ سەرکوتکردنی ئەو شۆڕشانە چەند پێناوێکیان گرتە بەر کە توندی و ڕەقی لەخۆ گرت وەك: توسیگ، تمسیر، المعاصر، بڵاوکردنەوەی جەستە پێست هەڵکۆڵین، زیندە بەچاڵکردنی، هەڵواسینی سەری کوژراوەن بەملی ئافرەتانیاندا و چەندین پێناوی تری کوشتن و سزادانی ناسراوی دەکانی ناوەڕاست لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا.

ئەوسیاسەتە بوو بەهۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆری جوتیاران لەبەر دزەیان بەشداریکردن لەململانی و بارگرژی بەناوخۆییەکانی نێوا سەرکردە مەمالیکەکاندا بچن بۆ شارە گەورەکان. ئەوانە بە (حرافیش)یان (زعر) یان(زعر العامە) ناسرابوون، ئەو وشانە ڕۆژهەڵاتی بەیتن بەبەڵگەی قسەی لیسانە دین ئیبنولغەتیبن مێژوو نووسی ئەندەلوسی لەوکاتەی بە یەکێك لەپاشاکانی غەرناتە قسەی دەوت: (حەرفوشێك بوو لەسەر نەریتی ڕۆژهەڵاتیەکان).[1]

١ ـ ابن الخطیب: نفاضة الجراب فر علالة الأغتراب ص ٢٠نشر احمد مختار العبادي.

هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێت ئەو شۆڕشە عەرەبیانە لەپاڵ پاڵنەرە ئابووریەکەیاندا چەند ئامانجێکی سیاسیشیان هەبوو، کە بریتیبوو لەکارخستنی دەسەڵاتی مەمالیکەکان و گێڕانەوەی عەرەبە ئازادەکان کە لەکۆندا دەسەڵاتی ولات هی ئەوان بوو.

ئەو ئامانجە سیاسیە توس و بیعی مەمالیکەکان و وروژاند و وای لێ کرد سیاسەتی اوندە تیژی بگرنە بەر لەسەرکوتکردنی ئەو شۆڕشانەدا، شونکە لەدەسەڵاتەکەی خۆیان دەترسان، یەکەم و مەترسیدارترین شۆڕشێك کە عەرەبەرکان لەڕۆژانی مەمالیکدا پێی هەستان ئەو شۆڕشە بوو، کە لەساڵی ١٢٥٣زدا/ ٦٥١ك. و لەسەردەمی سولتان ئەیبەکی تورکمانی پێیی هەستان، هۆکاری ئەو شۆڕشەیش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی سیاسی و ئابوری و وەك پێشتر باسمانکرد، جا مەمالیکەکان لەکاتەوەی لەجەنگی عەباسەوە بەسەر ئەییوبیەکاندا سەرکەوتن و خیلافەت لەبەرژەوەندی ئەواندا وەردا بە بارەکە، بڕوایان وابوو ولات و کاروباری ئەوێ بۆ ئەوان هیچ ڕکەبەرێك نیە، بۆیە لەخراپە و لاساری و زۆرکردنی باجدا هێندە چوون تا ئەوەی هەندێك لەمێژوو نووسانی وەك مقریزی و ئەبولمەحاسن خاچپەرستانیان لەوان پێ باشتر بوو وە دەیانوت فرەنجەکان گەر میسریان بگرتایەوە دەست بەو جۆرەیان نەدەکرد.

لەڕاستیدا بزووتنەوەی خراپە و ناڕەزایی تەنها لەڕەگەزی عەرەبیدا بەتەسك نەبوویەوە، بەڵکو بوویە بزوتنەوەیەکی گشتی جەماوەری بەبەڵگەی قسەکەی ئەبولمەحاسین کە دەڵێت: (خەڵکی میسر بەهیچ جۆرێك لەسولتان ڕازی نەبوون و تا ئەوکاتەی سولتان ئەیبەك مرد شتی وایان لەڕوودا دەوت کە پێی ناخۆش بوو، کاتێك بەڕێگەی و باندا دەچوو پێیان دەوت ئێمە تەنها سولتانێکی سەرکردەمان دەوێت کە لەسەرپاکی لەدایك بوبێت).

شەریف عەلەوی کە حسنەدینی کوڕی ئەعلەب بوو و چاوی بڕیبوویە دەسەڵات سەرکردایەتی ئەو شۆڕشە جەماوەرییەی دەکرد ئەو ڕاشکاوانە دەیوت پێویستە شای میسر بۆ عەرەب بێت نەوەك بۆ کۆیلەکان، لەمیسری ناوندی لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی بەڕووی دەریادا دەوڵەتێکی عەرەبی سەربەخۆی دامەزراند، بنکەی ئەو

دەوڵەتە لەدەورووبەری فەیوم لەشارێك بوو، کە (ذورة سریام)یان (ذورة الشریف) ناسرابوو و دەکەوێتە نێوان نیل و (ترعة المنهی)کە دەریای یوسفی ئێستا دەکات.

شەریف حصنەدین پەیوەندیەکی کرد بە مەلیك ناصر یوسفی ئەییوبی بەرپرسی شام داوای لێکرد تا دژ بە ئەیبەك یارمەتی بدات، بەڵام ناسر یوسف نەیدەتوانی لەوکاتەدا لەگەڵ ئەیبەکدا بجەنگێت، چونکە نێردراوی خەلیفە موسەعسەم بێیەکلاکردنەوەی ناکۆکی نێوانیان دەستی وەردابوویە بارەکەوە.

لەو ڕۆژگارەدا عەرەبەکان سەربازو ئەسپ و سامانی زۆریان هەبوو، چونکە لەجەنگی خاپەرستاندا بەشدارییان کردبوو، بۆیە سوپایەکی گەورەیان پێکهێنا لەدەرەوەی حصنەدینی سەرکردەیان کۆبونەوەو سوێندیان بۆ خوارد، سوڵتان ئەیبەکیش ناچار بوو هەڵمەتێکی تەمێ کردن بنێرێت بۆ ئەو شۆڕشە، ئەجێی سەرسورمانە بوو، کە بۆ سەرکەبەری ئەوانە ئۆقطای کرد بەسەرکردەی ئەو هەڵمەتە، چونکە لێهاتوویی جەنگی هەبوون.

ئۆقطای بەپێنج هەزار سوارچاکی مەمالیکەوەلەقاهیرە دەرچوو و بەرەوشەرقیە چوو، کە گەورەترین ناوچەی نیشاندانی سەرکەشی بوو، لەگەڵ کەمی ژمارەی مەمالیکەکان لەچاو عەرەبەکاندا کەچی مەمالیکەکان بەهۆی لێهاتوویی زیاتری جەنگی و شارەزایی سەرکردەکەیانەوە سەرکەوتن بەرگریکاری عەرەبی بەبلبس لە ساڵی ١٢٠٥٣زدا تێکشکا، بەڵام لەمیسر نیوەنددا بەشێوەی خۆی مایەوەو حصنەدین هەر ئازاد بووو لەوی حکومەتێکی سەرەبخۆی دامەزراندو ئەیبەك و سوڵتانەکانی دوای ئەویش نەیانتوانی بەسەریاندا زاڵ بن تا ئەوەی سوڵتان بیبرس بوندوقداری خەڵەتاندی و دوای ئەوەی پەنای داگرتی و لەئەسکەندەریە لەسێدارە درا.[١]

---

١ ـ بڕوانە: شهاب الیدن العمری: التعریف بالمصالح الشریف ص ١٨٨، مقریزیش لە (السلوك ج ١ ص ٣٨٨)دا گێڕانەوەیەکی تری جیا لەم گێڕانەوەیە دێنێت و تیایدا دەڵێت: شەریف حصنەدین داوای پەنای لەئەیبەك کردووە، ئەویش پەنای داوەو بەڵێنی پێداوە چەند پارچە زەویەکی پێبدات بۆ خۆی و هاودەمەکانی بەوە شەریف هەڵخەڵەتاوە بەهاودەمەکانیەوە بەرەو قاهیرە ڕۆشتووە لەوێ هەموو لەسێداراە دراون و شەریف ناردراوە بۆ ئەسکەندەریەو لەوێ بەند کراوە،بولیاك قسە لەسەر ئەو گێرانەوە دەکات و وانیشان دەدات ئەو گێڕانەوەیەی مقریزی

هەر چۆنێك بێت میسر لەکۆتاییدا میر حسنەدین کە نەما گرنگ ئەوەیە ئەیبەك توانی بنکەی دەوڵەتی مەمالیك و سەقامگیر بوونی لەمیسر دا دابمەزرێنێت.

## ٣ـ مەترسی هاوڕێ مەمالیکەکانی:

بەربەسی سێیەم کە هات ڕێی دەسەلآتەکەی ئەیبەك و هەڕەشەی لەقەوارەی دەوڵەتە تازە پێگەیشتوەکە دەکرد، مەترسی دۆست و هاودەمە مەمالیکیە دەریاییەکانی خۆی و فارسەدین ئۆقگای سەرکردەیان بوو. ئەیبەك ترسی لەودەستەیە هەبوو، چونکە هەستی بەبەهێزی و مەترسی ئەوکەسە دەکرد. پاشان هەوڵیدەدا خۆی بەهێز بکات. بۆیە دەستەیەك لەمەمالیکەکانی پێکهێنا کەبە موعیزی ناسرابوون وەك دانەوە پاڵ نازناوەکەی (الملك المعز)هەروەك قوتر موعیزی مەملوکی خۆی وەك جێگیری دەسەلآت لەمیسر دا دەستنیشانکرد، پاشان هێندەی نەبرد مەمالیکە دەریاییەکانی لەنیشنگەی خۆیان لە دوورگەی (الروضة)دەرکردو موسا پاشای بچووکی ئەییوبی و بەهاوبەشی تەنها بەناوی لەدەسەلآتدا لابردو بەتەنها دەسەلآتی بۆخۆی هێشتەوە.

هەموو ئەم لێپێچینەوانە تەنها تەنها چەند پێشینەیەکی شێوەین، کە هیچ لەمەترسی ئۆقگای و هاودەمە دەرییەکانی کەم نەکردەوە، مێژوونووسان لەسەرەئەوە یەکدەنگن، کە ئۆقگای گەیشتە لوتکەی بلندی بەتایبەت دوای ئەوەی بەسەر شۆڕشی عەرەبدا سەرکەوت و لەهەر شوێنێکدا دەربکەوتایە پاسەوانێکی زۆری سوارەی چەکدار بەدەوریدا بوون وەك ئەوەی پاشایەکی گەورە بێت، خۆیشی وای دەبینی پاشای میسر لای ئەو هیچ نیە، زۆرجار لەکۆیەکانیدا باسی مەلیك موعیزی دەکردو بەکەم ناوی دەهێناو بەئەیبەکان ناوی دەهێنا ئەمەیش گەیشتەوە

---

لەبارەی ڕیشەکیشکردنی عەوب لەسەردەمی ئەیبەکدا هێناویەتی تەنها شاردنەوەی ڕاست و مەبەست بەرزڕاگرتنی تورکە مەمالیکەکانە، چونکە مەترسی عەرەبەکان تا کۆتایی سەردەمەی مەمالیك مایەوە بڕوانە:. pohakiles Revoltes populaires en Egypte. R.E.I.١٩٣٤

دەم موعیزە، بەڵام لەبەر زۆری خشداشیە دەرياييەكانی چاوپۆشی لێدەكرد بەدەربڕێکی تر ئۆقگای بەئاشکرا بەرەودەسەڵات دەچوو هەروەك خشداشیەكانی هەوڵیان دەدا تا ئامانجەکەی بەدی بهێنن بۆیە لەناوخۆیاندا بە (الملك الجواد) ناویان دەهێنا و هەوڵیان دەدا کچە سەرکردەیەکی بنەماڵەی ئەییوبی بۆ بهێنن (واتە هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات)، کە ئەویش کچی مەلیك موزەفەرتەقیەدینی پاشا حەما بوو، بەڵکو هاوڵەکانی پیلانیان دانا بۆ کوشتنی ئەیبەك تامەیدانەکە بۆ ئۆقطای چۆڵ بکەن، پاشان ئۆقگای داوای لەئەیبەك کرد تا مۆڵەتی پێ بدات لەگەڵ بووکدا لەقەڵای شاخ(المقطم)دابنیشێت، چونکە ئەو بووکە کچی پاشایە، بەمە ئەیبەك هیچ گومانێکی نەما بەرامبەر نیازی ئۆقگایو بریاری دا ئۆقگای بکوژێت، لەرۆژی چوارشەمە٣شەعبانی ساڵی ٦٥٢ك، ١٢٥٤ز ئەیبەك داوای لەئۆقطای کرد تا بێت بۆ قەڵای شاخ تا لەبارەی کارێکەوە راوێژی پێ بکات دوای ئەوەی لەگەل مەلیکە موعیزیەکانیدا رێککەوتبوو بۆ کوشتنی ئۆقطای، ئۆقطای لەگەڵ چەند مەملوکێکدا چوویە سەرەوە بۆ ناو قەڵاکەو هەر کە لەدەرگای قەڵاکەوە چوویە ناو هۆڵی گەورە یەکسەر لەپیشتەوە دەرگای لەسەرداخرا و ـ رێگە نەدرا مەمالیکەکان لەگەڵی بچن، ئینجا موعیزەکانی لەوانیش میر قوتزی موعیزی دایان بەسەریدا و بەشمشێرەکانیان کوشتیان، هەواڵی کوژرانی ئۆقطای لەقاهیرەدا بڵاو بویەوە و حەوسەد کەس لەخشداشیەكانی لەوانە سەرکردە بیبرسی بوندوقداری و سەرکردە قلاوون ئەلفی چوون بۆ فریاکەوتنی، ئەوان گومانیان هەبوو لەوەی ئایا کوژراوە یان نا وایان دەزانی تەنها دیل گیراوە، کەچی هێندەیان بینی سەری ئۆقطای لەشورەکەی قەڵات فرێ درياه ناويانەوە.

ئەم رووداوە گەورە مەمالیکەکانی ترساند و لەوترسان بازنەکە ئەوانیش بگرێتەوە بۆیە هەرکامیان پێی کرا[1] رایکرد بۆلای پاشای ئەییوبی بۆ شام وەك ناسر

---

١ ـ تێبینی ئەوە دەکرێت لەکاتی راکردنی مەمالیکەکاندا دەرگاکانی قاهیرە داخرابوون، بۆیە سەرکردەکان ناچاربوون دەرگایەکی رۆژهەڵاتی قاهیرە بسوتێنن کە دەرگای (القراطین) بوو، ئیتر لەوکاتەوە بەدەرگا سووتاوەکە ناودەبرا.

یوسفی بەرپرسی حەلەب و دیمەشق و موغیپ عومەری پاشای کەرەك، هەروەك سەدو سی کەسیان پەنا برد بۆلای عەلائەدین کیقاذی کوری کەیخەسرەوی پاشای سەلجوقیەکان و بەرپرسی قونیە لەئاسیای بچووك.

لەڕاستیدا کوژرانی ئۆقطای مەمالیکەکانی بۆ دوو دەستەی خەیاری یەکتر دابەشکرد، کە مەمالیکی دەریایی ز مەمالیکی موعیزی بوون ئەمە وایکرد دەمەزراندنی دەوڵەتی مەمالیك بەرەو ڕووی توندترین مەترسی بوویەوەو، چونکە ئەو مەمالیکانەی ڕایانکردبوو پاشایانی بنەماڵەی ئەیوبیان هاندەدا، تا هێرش بکەنە سەر میسر، ئەمەیش لەئەیبەگ شاراوە نەبوو، بۆیەیەکەمجار کەوتە دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانی مەمالیکە دەریاییەکاندا، هەروەك ئەوانەی تریان کەلەمیسر مابوونەوە هەموویانی گرت و بلاوەی پێ کردن و ئەوانەی هەولداریان بوون لەناو مەمالیکەکانی تردا ئەوانیشی لێ دوورخستەوە.

پاشان ئەیبەك نامەی بۆ ئەو پاشایانە نووسی کەمەمالیکە دەریاییەکان پەنایان بۆ بردبوون و ئاگاداری لەبارەیانەوە پێدان کە چ ناپاکی و خراپەیەکیان هەبووە، ناسر یوسفیش وەڵامی داواکەی دایەوە کە داوای لێکرد تا ئەو شارانە بگێڕێتەوە کەلە فەلەستینی داڕنیبوو ئەویش شاری قودس و کەناراوەکانی فەلەستین بوون تا مەمالیکیە دەریاییەکان لەوێ بن، چونکە ئەوە پشکی ئەوان بووە، بەمەیش هەم ڕازییان دەکات و هەم لەمیسریش دووریان دەخاتەوە.

بەڵام ئەیبەگ وای زانی ئەو وەڵامە فێڵی تێدایە و ناسر دەیەوێت جارێکی تر بەرەو میسر بکێشێت دوای ئەوەی مەمالیکەدەریاییەکان داویانەتە پاڵ ئەو، بۆیە پێی باشبوو بچێت بەدەم داواکەیەوەو ئەو وولاتانە بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانی، بەڵام بەسوپاکانیەوە خۆی ئامادەکرد تا بەرەو سنووره میسرییەکان بچێت و لەنزیك شاری عەبباسە سەنگەری گرت و نزیکەی سێ ساڵ لەوێ بوو نەگەڕایەوە بۆ قاهیرە تا دوای ئەوەی لەساڵی ١٢٥٣ز/ ٦٥٤ك، دا بڕیاری ڕێککەوتنی نێوان ئەو و نێوان نارسردار، ئەمەیش لەڕێگەی نێرداراوی خەلیفەموسەعسەمەوە کە ناوی (مەجمەدین بادەرانی)بوو، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن ناوچەکانی میسرو کەناراوی شام

بۆ ئەو بێت و مەلیك ناسر هیچ مەلیکێکی دەریایی پەنا نەدات، مەمالیکەکان کاتێك بەمەیان زانی ناچار بوون بچن بۆ لای موغیپ عومەری پاشای کەرك، کە ئەییوبیەکی تر بوو و چاوی بڕیبوویە میسر و هەندێك لەباکانیشیان هەر لەسەرەتاوە پەنایان برد بوو بۆ سولتانی سەلجوقیەکانی ڕۆم، بۆیە ئەیبەك نامەیەکی بۆ نووسی و تیایدا وتی: (چەند مەمالیکی دەریایی بێ بار هەن کە لەسنووری ئیماندا ناوەستن و ناگەڕێنەوە بۆ قسەی گەورەتر لە خۆیان، ئەگەریش تۆ پەنایان بدەیت ناپاکی دەنوێنن دەی خۆت لەدەستیان ڕزگار بکە، چونکە ئەوانە ناپاك و فێڵبازو تۆقێنەرن و هیچ متمانەیەك نیە، کە داوت بۆ نەنێنەوە) بەمە سولتانی سەلجەقیەکان لێیان ترساو بانگی کردن و وتی: ئەی سەکردەکان لەگەڵ گەورەکەتاندا چیتانە؟ میسر عەلەمەدیین سجری باشقەردی پێشکەوت ووتی: گەورەمان پێمان بڵێ گەورەی ئێمە کێیە؟

زتی: مەلیك موعیزە بەرپرسی میسر، باشقەردی وتی: (خوا مەولوگەورەمان سولتان بپارێزێت ئەگەر مەلیك موعیز لەنامەکەیدا تێبینی ئەو مامۆستا گەورەمانە ئەوا هەڵەی کردووە، بەڵکو تەنها خشداشمانە و ئێمەش کردمان بەبەرپرسی خۆمان کەچی کەسی لەو زۆر بەتەمەنتر و بەڕێزترو شیاوتری دەسەلات بوو ئێمەش پەنامان هێنا بۆلای تۆ) بەسولتان پێان ـ رسام بوو لای خۆی خستیە کار.

بەلام ئەیبەگ هیچ ترسی لەسەلجوقیەکانی ڕۆم نەدەترسا چونکە ماوەی نێوانیان دوور بوو، بەڵکو و خەلیفە موسەعسەم نووسی و داوای لێدەکرا بەدانان و بەرگ پۆشین و ئالا شەرەفمەندی بکات وەك پاشایانی پێشووی میسر و لەهەمان کاتدا ئەوەی هاوپەیمانیش لەنێوانیاندا هەبوو، چونکە دەترسا دوای ئەوەی بڕیاری ڕەزامەندی خەلیفەی پێ بگات چاو چبۆکیەکانی سەر لەنوێ هەڵبدنەوەو. وا دیارە ئەیبەك هەستی بۆیە بڕیاریا چنێکی تر بهێنێت و لەساڵی ١٢٥٦ز دا هەوڵی بۆ بەدرەدین لوئلوئی[١] ئەتابەگی بەرپرسی موسڵ ناردو داوای هاوپەیمانیتێکی

---

١ ـ ناوی لوئلوئی عەبدوڵلای نوری مەلیك ڕەحیم بەدرەدین ئەبولفەزائیلی ئەرمەنی ئەتابەگی بەرپرسی موسڵە کەلەبنەڕەتدا لەمەملوکی نورەدین ئەرسەلان شاه ونکی بوو، لای ئەو پلەی

هاوسەرگیری لێکرد بەڵام سەرچاوەکان تەنها هێندەیان لەبارەوە هێناوەکە ئەیبەگ داوای کچی بەدرەدینی کردووە. عەقڵ نایگرێت تەنها وەك حەزێکی هاوسەرگیری داوای ژنی لەو کردبێت، بەڵکو پێدەچێت لەپشت ئەمەوە هاوپەیمانیتیەك ببەستێت تا بزاوتی مەغۆڵ لەرێگەی بەرپرسی موسڵەوە بزانێت و ئاگای لێ بێت. هەرچۆنێك بێت ئەو شتە سەرەتای کۆتایی سەردەمی ئەیبەگ بوو، چونکە زیانمەندلێی ئافرەتێکی وەك شەجەرودور بوو، کە بەڵگەی لێهاتوویی و بەهێزی کەسایەتی بوو لە رۆژان خاچپەرستاندا، ئەمەیش لەباریکردن بەئاگر خراپتربوو چونکە کاتێك شەجەرودوربەمەی زانی کەوتە سەرکردایەتی کردنی بزوتنەوەیەکی بەرهەڵستکاری ناوخۆیی و دەرەکی دژ بەدەسەڵاتی ئەیبەك، بۆیە هەندێك لەو مەمالیکە دەریاییەانەی لەمیسر مابوونەوە دژ بەو پرۆژەی هاوسەرگیری بوون، بۆیە ئەیبەگ ژمارەکیانی بەدیل گرت لەوانە ئەیدکین صالحی، ئینجا بردنی بۆ قەڵای شاخ تا لەوێ بەندیان بکات، کاتێك لەدەروازەی کۆشکی سوڵتانی نزیك بوونەوە، کە شەجەرودوری تێدا بوو. میر ئەیدکین وەك رێز لێنان سەری دانەواند و بەورکی وتی (والله یا خوند)[1] هیچ تاوانێکمان نەکردووە تا بەند بکرێن، بەڵام کاتێك چوو تا داوای کچی بەرپرسی موسڵ بکات ئێمە لەبەر تۆ ئەمەمان پێ قبوڵ نەکرا، شونکە پەروەردەی بەخششی تۆ و شەهیدی کۆچکردووە صالح ئەییوبین کاتێك لەسەر ئەو

---

بەرزبوویەوە تا بووبە (استاداره)و (خادم) لەدەوڵەتەکەیدا. دوای مردینی نورەدینلەساڵی ٦٠٧ك.دا دوای ئەو قاهیرە و دواتریش دوو کورە بچووکەکەی، بەدرەدین لەساڵی ٦٣١ك.دا دوسوڵاتی بۆ خۆی وەرگرت و بەمەلیك رەحیم نابرا و خۆی لەخەلیفە موستەنسیرببیلا نزیك دەکردەوە تا ئەوەی سوڵتان بەرگ و دەقی دوسەڵاتی بۆنارد، ئیبن واصیل خۆە بینیبوو واوەسفی دەکات و دەڵێت لەجوانی و گرنگیدانیدا بە نێردراوو هاتوون بۆلای هیچ پاشایەکی ترم وەك ئەو نەدەیوە، بەدرەدین بەردەوام موسڵی لەدەستدا بوو تا تەتەرەکان لەساڵی ١٢٥٩ز/ ٦٥٦ك.دا بەغدادیان گرت و دەستیانگرت بەسەر عێراق و جەزیرەدا، بەدرەدین ئەو کات چوو بۆ لای هۆلاکۆی پاشای تەتەر و ئەویش لە دەسەڵاتەکەیدا هێشتەوە، پاشان گەرایەوە بۆ موسڵ و لە ساڵی ١٢٥٩ز/ ٦٥٧ك.دا لەوێ مرد.

١ ـ خوند: وشەیەکی تورکی یان فارسیە و لەبنەرەتدا خوداوەندە واتاکەی گەورە یان لەسەرکردەیەو بۆ نێرو مێ بەکاردێت. ٠المقریزی: ج ١ ص ٢٢٤، پەراوێزی ژمارە٢).

هاوسەرگیریە کۆنەمان جووڵاند بەرامبەرماندا گۆڕاو ئەوەی پێ کردین، کە دەیبینیت، شەجەرودوریش دەستە سڕەکەی دەستی بۆ جووڵان بەواتای ئەوە قسەکەتم بیست).

کاتێك بردنیان بۆناو بیرەکەو لەناو بەندینخانەی قەڵاکەدا ئەیدکین وتی: (ئەگەر بەندمان بکات ئێمە کوشتنمان بۆ داناوە)ئەمە واتا شەجەرودور پاداشتی کۆتایی بۆ ئەیبەگ بەرامبەر ئەوە داناوە و گرتنی ئەوانەیش تەنها لەبەربەرهەڵستکارییان بۆ هاوسەرگیری یەکەی نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو پیلانی ئەوانی زانیبوو دەیویست بەجیاکردنەوەی سەرکردە مەمالیکیەکان و سەرکردە ژنەکەیان(شەجەرودور) لەیەکتر بزووتنەوەکەیان لەناو ببات، بەڵام شەجەرودور پلانێکی دانا بو کە جێی چاوەڕوانی نەبوو، ئەو بەنهێنی یەکێك لەمەمالیکە عەزیزیەکانی بەدیاری و نامەیەکەوە ناردبوو بۆمەلیك ناسر یوسفو تیایدا هەواڵی ئەوەی پێ دابوو، کە ئەوبیریایداوە ئەیبەگ بکوژێت و شوویەو بکات و دەسەڵاتی میسری پێ بدات، بەڵام ناسر لەترسی ئەوەی ئەو کارە پیلان و فیلّ بێت پشتگوێی خست و هیچ وەڵامێکی نەدایەوە و بەدرەدین لەئلوئیش هەواڵی ئەو گفتوگۆ نهێنیانەی پێگەیشتبوو، بۆیە هەواڵی بۆ ئەیبەگ ناردو ئامۆژگاری دەکردو بێداری پێ دەدا و ئەیبەگیش لەژیانی خۆی ترسا، بۆیە قەڵاکەی بەجێهێشت و لە(ناڤر اللوق) نیشتەجێبوو و بڕیاریدا پێش ئەوەی شەجەرودور ئەم بکوژێت ئەم شەجەرودور بکوژێت، لەوبارەیەوە دەڵێن: فاڵچیەك هەواڵی بەئەیبەگ داوە، کە بەکوژراوی و لەسەردەستی ئافرەتێك دەمرێت، بێگومان ئەم کەسە ئاگادار چەند زانیاریەکی پشت پەردەی زانیوە، چونکە دیارە هەردوو ژن و مێرد پێشبڕکیان دەکرد لەپیلام دارشتندا دوای ئەوەی مەمالیکەکانی قاهیرە بەندکران پێشبڕکێکە بەسەرکەوتنی ژنەکە لەمەیدانەکەدا کۆتایی پێهات و شەجەردور دوونامەیەکی جوان و ڕازاوەی بۆ ئەیبەگ نووسی و داوای لێکرد تا بێت بۆ قەڵا بۆلای، ئەویش چوو بەدەم داواکەیەوە و سەرکەوت بۆ کۆشکی سوڵتانی لەقەڵاکەدا، شەجەردوریش پێنج کەسی بەهێزی دانا تا تیرۆری بکەن و لەوانە موحسین جری و نەسر عەزیزی و

سـنجر و کۆتـا کەیـشیان لەمـەمالیکی تۆقگـای بـوو. ئـەوانیش فرمانەکـەیان بەجێگەیانـدو لەحەمامـدا لەئـەپریلی سـاڵی ١٢٥٧ز/ ٦٥٥ ك کوشـتیان. شـەجەردور ویستی دەرەنجامەکانی ئەو تاوانە نەهێڵێت بۆیە سـەرکردەیەکی دانـا وەك سـوڵتان تابارەکـە بگریتـە دەسـت و ئـەویش لەپـشتی ئـەوەو دەسـەڵاتی شـاراوە بێـ بۆیـە پێشنیازی دەسەڵاتی بۆ جەمالەدینی کوڕی ئەیدغدی و عیزەدین ئەیبـەکی حەلـەبی کـرد، بـەڵام هـیچ کامیـان بـەوە ڕازی نـەبوون و ئامـادە نـەبوون. بـۆ ڕۆژی دواتـر هەواڵەکە لەشاردا بڵاو بوویەوە و مەمالیکە موعیزەیـەکان بەپەلـە چـوون بـۆ قـەڵا و خزمــەتکوزارو دەرباکانیــان گــرتن و ســزایان دان و ئــەوانیش دانیــان بەڕاسـتی ڕووداوەکە دانـا، ئـەوکات مـەمالیکی مـوعیزی هەوڵیانـدا شـەجەردور بکـوژن، بـەڵام مـەمالیکی صـاڵحی نەیانهێـشت و هەوڵیانـدا ڕزگـاری بکـەن و لـەبورجی سـووردا شەجەردوریان لەقەڵاکەدا بەدیلگرت.[1] مەمالیکی موعیزەیش گەمارۆی قەڵاکـەیان داو بۆ دەرفـەت دەگـەڕان تـا شـەجەردور بکـوژن، لەکاتـەدا لەبـەرپارێزگاری مـەمالیکی دەریایی چاوەڕوان دەکرا شەجەردور لەمردن ڕزگاری ببێت هێنایەکایەو کلّپەی دادە بـۆ تۆڵەسـەندنەوە لەشـەجەردور کـە نەیدەهێـشت مێردەکـەی سـەردانی بکـات و ناچاری بکات تا قەڵای بدات، بۆیە خۆی و کوڕەکەی زۆریان لـەموعجیزەکان دەکـرد تا شەجەرودور بکوژن تـا ئـەوەی بەرهەڵـستکاری صـاڵحی لـە کۆتاییـدا لاواز بـوو و شەجەرودور برا بۆلای ئەوژنـە، ئـەویش فرمـانی بـەژواردەورەکانی کـرد ال بیکـوژن، مقریزی لێرەدا دەڵێت: کەنیزەکان بە لێان دا تا مردلەشورەی قەڵاکەوەفرێیان دایە ناوخەندەکـەو تـەنها شـەرواڵێکی لەگـەڵ کراسـێکدا لەبـەردا بـوو، چـوند ڕۆژێـك لەخەندەقەکەدا مایەوە و چەند ڕیسواریەك هەندێك شـەڕواڵەکەیان بـرد، دواتـر دوای چەند ڕۆژێك بەخاك سپێردرا، تەرمەکەی بۆگەنی کردبوو بە بەلەمێکە بچووك بـرا بـۆ گۆڕەکەی لە (المشهد النفسي)دا.

---

[1] ـ لە قەڵاکەدا چەند بورجێك هەبوون لەوانە بـورجی سـوور کـە مـەلیك کامیـل بمیـادی نـاو ئەمڕۆ ناسراوە بە ناوی بورجی (المقگم) لەبەری باشووری قەڵاکە دایە.

مەمالیکە موعیزەیەکان دەمارگیرییان بۆ ئەو کوڕی ی گەورەکەیان هەبوو کە بە نورەدین عەلی ناسرابوو و وەك سوڵتان لە ڕەبیعولئەوەلی سالّی ٦٥٥ك/ ١٢٥٧ز.دا وەك سوڵتان ناو نازناوی مەلیك مەنسوریان لێنا ئەوکات تەمەنی پانزە ساڵ بوو، مەمالیکی صالحی بەدەسەلاتی ئەو ڕازی نەبوون و لەسەردەسەلاتی ئەتابەگی سەربازی میرعەلەمەدین سنجری حەلەبی ڕێککەوتن و سوێندیان بۆ خوارد، بەلام خێرا موعیزیەکان گرتیان و لەبیری قەلاکەدا بەندیان کرد، ئەوکات خشداشیە صالحیەکانی بەرو باری نائاسایی چوون و ترسان بازنەکە ئەوانیش بگرێتەوە بۆیە بڕیاریاندا بەروشام ڕابکەن مەمالیکی موعیزیش کەوتنە شوێنییان و زۆرێکیان لێ بەدیلگرتن و ڕێرەوی موعیزیش هەندێ لەدەستە و تاقمەکانی تری مەملوکی بێزرا کرد وەك ئەشرەفیەکان تا ئەوەی وا بلاو بوویەوە ئەوانە لەسەر ئەوە یەکدەنگ بون قەلەمڕەوی موعیزی لەدەولەت لابەن، موعیزەکانیش ئەشەرەفیەکانیان گرتن و مال و سامانیان بەتالان بردن بۆ پاشا ئەییوبیەکانی شام، بەتایبەت موغیث عومەری بەرپرسی کەرك ئەوان موغیثیان هان دەدا تا میسری مولکی باوباپیرانی بگرێت، تا ئەوەی ئەویش چوو بەدەم داواکەیانەوە و بەیارمەتی ئەوان هەولیدا دەستبگرێت بەسەر میسردا. لەسالّی ١٢٥٧ز ذوالقعدة ٦٥٥ك.دا و لەسالّی ١٢٥٨ز ڕەبیعولئەوەلی سالّی ٦٥٦ك.)دا دووجار هەولّی ئەوەی دا، بەلام لەهەردووکیاندا بەستکستخواردوویی و بێهیواییە وە بەهۆی دلێری جێگیری دەسەلات میرسەیفەدین قوتزی موعیزیەوە گەڕایەوە دواوە بەمجۆرە دەولەت سوڵتانێکی مندالّی هەبوو لەکاتێکدا هێشتا دەولەت لەباری پێکهێناندا بوو پێویستی بەوەنەبوو لەسەردانانی مندالان ڕکەبەری و پیلانی ناوەخۆیی بێنە مەیدان وێڕای ئەو هۆکارانەی مەترسی ناوەخۆیی کەلەوکاتەدا نادیار بوون و لەهەمووی مەترسیدارتر بوو، کە ئەویش مەترسی مەغۆلی بوو.

# بەشی پێنجەم

## مەترسی مەغۆل یان تەتار لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی یەکەمی مەملوکی لەمیسر

ئیسلام پێشتر هەرگیز بەرەو ڕووی بارێکی سەختی لەو جۆرە نەبوو، کە لەسەردەمی شالاوی نەغۆلی لەسەدەی شانزەی زاینیدا واتە شەدەی حەوتەمی کۆچیدا تووشی بوو، چونکە سوپا مەغۆلیەکان شارو شارۆچکەی مسولمانانیان وێرانکردو کشت و بڕیان بەدیلگرتن یان سزادانێکی زۆریان لەڕووی خەڵکدا ئەنجامداو بەهەموو شێوەیەك لەهەموو شوێنێکدا بێ ڕەحمانە مەشخەڵە شارستانیەکانیان کوژاندەوە لەبەختی خراپی ئاسیای ئیسلامی ئەوەبوو، کە لەو کاتەدا هێزێکی ئیسلامی لەئاسیای ئیسلامیدا نەبوو، کە بتوانێت بەرەو ڕووی شالاوی توندو تیژی لەو جۆرە بێتەوە کە جەنگیزخان[١] کوڕو نەوەکانی سەرکردایەتیان دەکرد، جا خلافیەتی عەبباسی لەو پەڕی پێشوودیدا بوو، دەوڵەتی سەڵجوقیەکانیش لە بەغداد لە پەلو پۆ کەوتبوون، لە ڕۆژئاوای بەغدادیشدا دەوڵەتی سەلجوقیەکانی ڕۆم هەبوو کە کەئاسیای بچووك بوو ئەویش لە لاوازی و داڕماندا بوو، پاشان دەوڵەتی مەملووکی تازە پێگەیشتوو هەبوو لە میسرو شام کە هێشتا تەمەنی لە چەند ساڵێك تێنەدەپەڕی و قەوارەکەیشی هێشتا لە دەست دابوو،

---

١ ـ جەنگیزخان واتە بە هێزترین فەرمانڕاویەکان، ئەو خۆی ئەم ناوەی هەڵبژارد، ناوی خۆی کە لە منداڵیەوە پێی ناسرا بوو تیموجین بوو کە لە زمانی چینیدا واتای ڕەق و پرخت دێت، تیمۆجین دوای چەند جەنگ و ڕکەبەریەك لەگەڵ هاو ڕەگەزەکانی خۆیدا توانی بگاتە ئامانجی خۆی کە سەرکردایەتی، مەغۆڵ بوو ساڵی ٦٠١ ك.دا توانی هێزێکیان لێ دروست بکات کە هاوسەردەمیەکانی وایان دەزانی شکست ناخوات، بەو هێزە، نا ئاسایی ئەو ئەسکەندەر ئاساییە توانی وەڵات لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە فراوان بکات تا ئیمپراتۆرتێکی بۆ نەکانی بە جێهێشت کە نێوان دەریای چین و دەریای ڕەشی گرتەوە، لە ساڵی١٢٢٧ز ـ ٦٢٥ك. دا مرد.

مەترسیەکانی تازەیی کە هێشتا لە هەموو لایەکی ناوخۆیی دەرەکیەوە لێیان دەدا، پاشان هۆلا گۆی نەوەی جەنگیزخان لە فبرایەری ساڵی ١٢٥٤ ز. دا ڕۆژئاوا کشاوە قەڵاکانی شیعەی ئیماعیلی باتینی لەوێ لە ناو برد، پاشان خیلافەتی عەبباسی و هەموو ویلایەتەکانی ڕۆژئاوای ئاسیای لە ناو برد و تەنها دەوڵەتی مەملووکی لە میسر و شام لەبەر دەمیدا مابوویەوە).[1]

نهێنی سەرکەوتنەکانی مەغۆڵ دەگەڕێتەوە بۆ پێشڕەوییان لە چەك و خێرا هەڵکوتانە سەر دوژمن و خێرایی تیرهاوێژی و توندی و تۆڵ جەنگیان، چا کاری جەنگی ئەوان وەستا بوو بریتیبوو لە تیری نوکنی پۆلایین و یان ئێسك یان شاخی، سندوقی سەربازیشیان ژمارەیەکی زۆری بەتی توند و تۆڵ و سوژنی لەگەڵدا بوو لەگەڵ مێویێك بۆ چاککردنی و بڕبەنێکی تێرکەرەوە نوکی تێرەکانیان، پاشان شمشێری مەغۆڵەکان تەواو نووك تیژبوون و زیاتر لەوەی بۆ وەشاندن بە ڕووی کەسێکدا بشێن بۆ ئەوەش دەشان لێی بدەیت بیکەیت، بە جەستدا، قەڵغانی ئەسپەکانیشیان لە بەرگێکی توندو تۆڵ پێچرابوو، مەغۆڵەکان چەکە و شمەکی خۆیان دەخستە چەند سندوقێکی پێتەوە تا بکرێت فووی تێبکەن تا بۆ پەڕینەوە لە ڕووبار پشت بەو سندوقەانە ببەستن. سوپای مەغۆڵ لە ڕەگەزە سەنەکان پێك هاتبوو وەك مەغۆڵ و تەتارو دواتر چەند ڕەگەزێکی تری پەیوەست بەو وەك باشقرد و قرغیزو تورك و تورکمان و چەندێکی تر، زربە شیان چەند دەستەیەکی سوارەبوون، کە هەر یەکەیان دەیان سەدیان هەزاریان دەهەزار سەربازی بوون، ئەمە وێڕایی جەنگاوەران چەند دەستەیەکی ئەنداز وتایبەتمەندانی هونەری بەکارهێنانی مەنجەنیق و ئامێرەکانی گەمارۆدان و چاککردنەوەی چەکە جیاوازەکانی جەنگ هەبوون.

نیزامی تەتەری ملکەچی تەواوی لە خۆ دەگرت و نەدەکرا کەس لە ڕیزی سەربازاندا ڕابکات، یان هاوڕێکەی بە پەککەوتەیی یان بەدیلی لە دەست دوژمندا

---

١ـ Howorth: History oF the Mongols VoI. I.p. ١٩٣ هەروەها Dhosson : Histoire des mongis III p.١٣٤.

هەروەها بەجێبهێلێت تا ڕزگاری نەکات، ئافرەتانی مەغۆلیش ئازایەکی زۆریان هەبوو، وەك پیاوان دەجەنگان، زۆرجاریش منالەکانیان لەسەر شانیان هەڵدەگری، هەروەها قەسە ئەوەیە گەلی مەغۆلی هەمووی لە ڕیزی سوپادا کاری دەکرد بۆ ئەوەی خۆراك و شمەکی پێویست بەدەست بهێنن.[1]

ساڵی ١٢٥٨ز/ ٦٥٦ك بە ساڵێکی شومی ناو مێژووی دەوڵەتی ئیسلامی دادەنرێت، چونکە مەغۆلەکان لە فبرایەری ئەو ساڵەدا دەستیان گرت بەسەر بەغدادی قەڵای ئیسلام و پایتەختی عەبباسیەکەندا و کاری وێران و کوشت و بڕیان بۆ چەند ڕۆژێك تیادا بەکارهێناو خەلیفە موعتەسەم بیلاو ئەندەمانی خێزانەکەی و گەورەکانی دەوڵەتەکەیان کوشتن و موسڵمانانی لە تاو ئەوکارەساتەدا بوونە چەند بەشێك، چونکە خیلافەتی عەبباسی لەگەڵ ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی لاواز بوو، بەڵام مەڵبەندی سەرکردایەتی ڕۆحی تا ئاستێکی سەروتر لە مەڵبەندی پاپەوی لە ڕۆما پاراستبوو، بۆیە جێی سەرسوڕمان نەبوو، کە موسڵمانان وا گومانیان دەبرد لە ڕێی لە ناوچونەو ڕۆژی دوایی نزیك بوتەوەو هەر دیاردەیەکیان وا لێکدەدایەوە، کە ئەوە دەربڕی تووڕەیی خوایە و دەیانکردە بەڵگە بۆ ئەوەی، کە دواتر لە جیهاندا ڕوداوێکی خراپ ڕوو دەدات، چونکە خەلیفەی تیا نەماوە.[2]

لە ئەنجامی ڕووخانی بەغداد بدەستی مەغۆلەکان چەندین ئەنجام لە ژیانی ئیسلامیدا ڕوویاندا، جا یەکبوونی سیاسی موسڵمانان بوو بەکارێك، کە هەرگیز چاوەڕوانی بەدیهاتنی نەبوو، وێڕایی ئەوەش ڕۆشەنبیری ئیسلامی لە سەر دەستی مەغۆلەکان زیانێکی گەورەی لێکەوت کاتێك مەغۆلەکان چەندین کاتێك مەغۆلەکان هەزاران کتێبی بەنرخ و دەستنوسی نایابیان لە ناوبرد و زۆرێك لە زاناو ئەدیبانیان کوشتن و ئەوانەشیان مابوون بە بەشە جیاجیاکانی جیهانی ئیسلامیدا بڵاوەیان پێ کردن، میسر ژمارەیەکی زۆری ئەو زانایانەی ڕاکێشکرد، ئەمە بوو بەهۆی

---

١ـ ئیبن بەتوتەی گەشتیاری تەنجی تێبینی ئەمەی کردووەو دەڵێت: ئافرەتانیشان وەك پیاوان دانەپۆشراوی لە کۆڕی پیاواندا ئامادەوە سولتانی مەغۆل بەناوی خۆی و ڕنەکانیەو، فرمان دەردەکات.

٢ـ السیوطي: تأریخ الخلفاو، ص.٣٠٩

گواستنەوەی مەڵبەندی سەرکردایەتی هزری بۆ قاهیرە، کە بە هۆی بارە جوگرافیەکەی زیاتر لە بەغدا لە ئەوروپا نزیکتر بوو، ئەمە یارمەتی دا تا جیهانی ڕۆژئاوا لە ژیاری ڕۆژهەڵاتی نزیك بێتەوە،[١] ئەوەی لە بارەی کۆچی زاناو ئەدیبانەوە دەوترێت بۆ پیشەگەرو پیشەشازان و خەڵکی تری وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیش هەروایە، نمونەی ئەمەش ئەوەیە، کە میسر لە دەوروبەری شاڵاوی مەغۆلیدا پێشوازی لە ژمارەیەکی زۆری ئەو ڕۆژهەڵاتیانە کرد، کە لە بەرەی کەنداو و لە دەوروبەری(برکة الفیل) دا خانوویان بۆخۆیان بنیادنا[٢] پیشەگەرانیش لەوانەوە چەند شێوەو ئوسلێبێکی هونەری وڵاتی ئەوانیان وەرگرت و بیناسازی میسری ئەنجامی ئەوەدا لە سەدەی سیانزەی زانیدا، بەچەند کاریگەریەکی فارسی و عێراقی کاریگەربوو، تەواو پێدەچێت نەخشەی بنیادنانی مزگەوتی زاهیربریس لە ئێوەی مزگەوتی میافارقین وەرگیرابێت، میافارقین لە ساڵی ١٢٢٣ز دا بنیادنرابوو[٣] لەگەڵ ئەوەی ئەوە شێوەو کاریگەریە هونەریەکانە، لە میسردا لە پێش سەدەی سیانزەدا ئەوە هەبوو، بەڵام ئەو کۆتا کۆچانە بانگەشەکەری دەرکەوتن و

بووژانەوەی بوون[٤] لە ڕاستیدا ڕووخانی بەغدادو دامەزراندنی دەوڵەتی ئیلغاکانی فارس لەسەردەمی هۆلاکۆدا خاکی ڕۆژهەڵاتی دیجلەی لە ڕۆژئاوایی دیجلە جیا کردەوە، جا ڕۆژهەڵاتدا بازنەی ژیاری فارسی فراوان بوو، لە ڕۆژئاشدا پاش ماوەی ڕۆشنبیری عەرەبی هەبوو دوای ئەوەی ژیاری جیهانی ناوەڕاست لە سەمەرقەند بۆ

---

1 _caml.Nad, Hizgyf,voI,4P.64

٢_ المقریزي: الخطط ج ١ ص ٣٦٤_ ٢٦٥

3_ Crazwall: Tha ksof sulfan Baibars,da f In sfifuf, Francais panhaolOgie, orianfale fome 26p 181.

٤_ لەڕاستیدا کۆچ ڕەوی پیشەگەران لە ئەنجامی شاڵاوی مەغۆلیدا بۆ سەر میسرو ئیسلام نوێ نەبوو، لێرەدا چەندین نمونەی لەو جۆرە حەرەکە لەوانە ڕووداوی ئەو سێ ئەندازیارە ئەرمەنە باس دەکەین کە لە ڕەهاوە کۆچیانکرد بۆ میسر و سەرپەرشتی بنیادنانی قەڵاکانی فاتیکانیان لە قاهیرە کرد لە ساڵی ١٠٨٧ز ٤٨٠ك، کە سەردەمی مونتەسیربیلادا بوو، پێدەچێت هاتنیان بۆ میسر لە ئەنجامی ڕاکردنیان لە شاری ڕەهاوە بووبێت، کە سەلجوقیەکان ساڵێك پێش ئەوە گرتبوویان.

ئیشبیلە لەسەر هاریکاری هزری و ئالوگۆڕی زانستی وئەدەبی نێوان فارس و عەرەب لە سایەی خیلافەتی عەباسیدا بەرپابوو بوو، لەڕاستیدا جیاخوازی نێوان دوو زمانی فارسی و عەرەبی بە چەند سەدەیەك پێش ئەوەو لە ئەنجامی دەرکەوتنی ڕاپەڕینی نەتەوەی فارسدا دەرکەوت، بەلام لە کەوتنی بەغدادەوە گرنگی زمانی عەرەبی لای فارس کەمی کرد وتەنها بۆ لێکۆڵینەوە ئاینی فەلسەفیەکان بەکار دەهات.[1] بەدوای ڕووخانی بەغداداڕاستەی زمانی ڕێکخستنەوەی جیهانی ئیسلامی هات وەك پێویستی دیاریکردنی سنورێکی نوێ و بەستنی چەند هاوپەیمانیەکی جیاواز، هەروەك بەدوای ئەمەدا سوڵتانە مەمالیکەکان لە میسردا سیاسەتی خۆیان خۆیان بەرامبەرخیلافەت گۆڕی وای لێکردن بیر لەوە بکەنەوە سەر لە نوێ بیبوژێننەوە، لە هەمان کاتدا دەرفەتێکی کورتی پێدان تا تیدا خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕێگرتن لەو لافاوە مەغۆلیەی بەرەو ڕوویان دەهات لەگەڵ ئەوەی ڕووخانی بەغداد دوای ئەوەی بۆ موسڵمانان ڕوونکردەوە، کە پێویستە هەوڵەکان بەرامبەر ئەو مەترسیە گشتیە یەکبخەن، مململانێنی نێوان سونەو شیعە هێشتا بەردەوامبوو، مەغۆلەکانیش لێرەدا ئەو ڕکەبەریەیان لە بەرژەوەندی خۆیاندا قۆزتەوە و بەرەو ڕۆژئاوا کشان و خراپەو وێرانیان دەنایەوە و دابەشکاری موسڵمانانیش لەمەدا یارمەتیان دەدا، هۆلاکۆ یارمەتی شیعەکانی دەدا و ئەو هەنگاوانەی گرتەبەر، کە دەبوونە زامنی گۆڕی ئیمامی عەلی لە نەجەف لە هەر وێرانکاریەك.

شتێکی ئاسایی بوو بەدوای ئەمەدا شالاوبێتە سەر شام و ڕۆژئاوای، چونکە ئەو ئیمپراتۆریەتەی، کە سوڵتان سەلاحەدینی ئەیبوی دایمەزراند بوو دابەشکرد بۆ دووبەش، کە بریتیبووە لە میسر، کە دەسەلاتی ئەیبویەکانی لێ دابڕابوو، کەوتبوویە دەست مەمالیکەکان، پاشان شام کە ژمارەیەك لە پاشایانی شام دەستیانگرتبوو بەسەر چەند شارێکدا، لە سەروو هەمووشیانەوە ناسر یوسفی بەرسی حەلەب و دیمەشق کەترسی پێشڕەوی مەغۆل دایگرتبوو والی دانابوو هۆلاکۆ

1_Nickolzon:Alifery Hisfry Of fhe Arabz.p 446

سەربازەکانی سەربازەکانی دواتر خێرا دەستبگرن بە سەر شامدا وهیچ پاشەیەکی شام یان مەمالیکی قاهیرە نین بتوانن بیپارێزن، بۆیە لە ساڵی ١٢٥٨ز دا مەلیك عەزیزو محمدی کوڕی خۆی نارد بۆ لای هۆلاکۆو هۆگری خۆی بۆ نیشانداو داوای لێکرد تا یارمەتی بدات تا یارمەتی بدات میسر لە دەست مەمالیکەکان بستێنێت، بۆ هۆلاکۆ پێش ئاسان بوو تا داواکەی قبوڵ کبات، ئەگەر میری دیمەشق جۆرە یارمەتیەکی بدایە و خۆی بچوایە بۆ لای و داوای هاوپەیمانی ئیلخانی مەغۆلی لێکردایەو هەواداری و شوێنکەوتەیی خۆی بۆ بخاتە ڕوو، بەڵام ناسر وای نەدەبینی بەڵێنێکی پتەو بیبەستێتەوە، بۆیە وای بێ باشتربوو لە هۆلاکۆ خۆی بە دوور بگرێت، تا ئەوەی ئەگەر هێزە مەوغۆلیەکان لە بەردەم موسڵماندا شکستیان خوارد بتوانێت چەند بیانویەك بۆ خۆی بهێنێتەوە، هۆلاکۆ لەو وەفدە تورەبوو، کە لە شان و شکۆی ئەودا نەدەبوو، بۆیە نامەیەکی بۆ مەلیك ناسر ناردو تیادا فرمانی ملکەچی و شوێنکەوتەی بێ کۆت و مەرجی پێکرد، کاتێك مەلیك ناسر بینی هەوڵەکەی سەری نەگرت و وای لێکرد لای موسڵمان جێ ی گومان بێت، نامەیەکی هەڕەشەو جنێودانی ناردەوە بۆ هۆلاك، دواتریش باجێکی سەختی ئەوەی دا.

لە سێپتێمبەری ساڵی ١٢٥٩ز/ ٦٥٧ك. دا هۆلاکۆ بە سوپایەکی بە هێزەوە شاڵاوی بردە سەر شام و شیتمی کوڕی گەمارۆی میافارقینی دا، ناسر زانی ناتوانێت بە تەنها لە ڕوو تەتاردا وەستێت بۆیە بڕیاریدا داوای یارمەتی لە مەمالیکەکان بکات بە جۆرێك یارمەتیەکی جەنگی بدەن، کە دەلافەتی پێبدات بۆ وەستاندنی لافاوی شاڵاوبەران، لە وە کاتەدا سوڵتانی میسر مەلیك موزەفەر سەیفەدین قوتزبوو، کە لەو خوارزمیانە[1] بوو، کە داخ لە دڵ بوو بۆ تەتارەکان و

---

١ـ قوتز گەنجێکی جوانی ڕیش درێژ بوو، کە دەڵێن: ناوی بنەڕەتی خۆی محمدی کوڕی مەودوودە دەدرێتە وە پاڵ ماڵی دەسەلاتی ناو خوارزمە، خوشکەزای جەلالەدین خوارز شاە، کاتێك مەغۆل دەسەلاتی ئەو خێزانەی لە ناو برد قوتز لەو یلانە نەبوو، کە بران بۆ دیمەشق، لەوێ فرۆشا بە سوڵتان ئەیبەکی تورکمانی، دەڵێن: قوتز بە یەکێك لە ئەستێرەگەراکانی و تووە: من تەتەراکان دەڕوخێنم و تۆڵەی خوارزمشاهی دەسێنمەوە، دەڵێن وشەی قوتز بە

دەیزانی مەغۆل چووبنە سەر هەر ولاتێك چ خوێنێكیان ڕێشتووە، لەگەڵ ئەوەی پەیوندی نێوان قوتزو ناسر خراپ بوو، بەلام مەترسی بارەکە وای لە سولتانی مەملوکی کرد ڕق و کینە وەلابێت و داوا تایبەتەکەی قبوڵ بکات بەناردنی چەند فریاگوزاریەکی سەربازی بۆی، لێزانی قوتز بە ڕوونی لەو نامەیەدا دەرکەوێت، کە ناردی بۆ ناسر لەو بارەیەوە و تیایدا هەواڵی پێدا، کە بەلێکی پاکەوە هەموو داواکانی قبوڵ دەکات و کەمتەرخەمیشی تێدا ناکات، بەڵکو ناسر وەك ئەوەی لە نەوەی سەلاحەدینە پاشای هەموو ئەو ناوچانە دەزانێت، کە ملکەچی دەسەلاتی ئەیبویەکیەکان بوون لەوانیش میسر، پاشان ئەوەش دەلێت: کە ئەو(قوتز خۆی) تەنها سەرکردەیەکی بەری نیلەوەو بەس بەلێنی پێدەدات، ئەگەر بیەوێت بێت بۆ قاهیرە ئەوا دەسەلاتی بالای دەداتە دەست، هەروەك ئەویشی بۆ نەخاتە ڕوو، کە سوپایەکەی بنێرێت و بۆ دیمەشق، ئیتر ئایا ئەو دلنیایە

لە ترسی هۆلاکۆ بێت، یان لەوەوە بێت، کە قوتز ویستبێتی فێڵ لە میری دیمەشق بکات دواتر ناوچەکانی بگرێت، بەلام مەغۆل دەرفەتی بێدەنگی ناسریان قۆستەوەو بەرەو شام درێژەیان بەشالاوی خۆیان داو لە٢٥ ینای ١٢٦٠ز سەفەری ٦٥٨دا پاش حەوت ڕۆژ خوێنڕێژی و وێرانکردی دەستیانگرت بەسەر حەلەبدا، پاشان دوای ئەوە بە چەند میافارقنیش کەوتە دەست سیموی کوری هۆلاکۆ دوای ئەوەی مانگێك پارێزەرەکانی بەرگریەکی دلێرانەیان کرد مەغۆلەکان نمونەی لەوەیان نەدیبو، مەلیك کامل محمدی ئەیبووی بەرپرسی میافارقینیش شەهید بوو.

لەبەردەم ئەو مەترسیەدا هەندێك لەسە کردە ئەیبویەکانی شام پێیان باشبوو لە پێناو پاراستنی قەوارەی خۆیاندا ملکەچی شالاوبەران بن، لەوانە مەلیك ئەشرەف موسای نەوەی ئەسەدەدین شێرکۆ، کە لەو کاتەدا تەنها گوندی (تل باشر)ی بچوکی

---

تورکی واتە: سەگی درندە. بڕوانە: (الكلبي: فوات الوفيات ج ١ ١٣٢ـ ١٩٣) تێبینی دەکرێت لەو ساڵەی قوتز سولتان عەلی کوڕی تەیبەگی لابردو خۆی وەك سولتان ڕاگەیاند ئەوەی دەربڕی و توی و وتی: (هەروەها بێت سولتانێکی بەهێز هەبێت لەگەڵ دوژمندا بجەنگێت و پاشایەکی سەرکەوتوو بێت بەسەر منالێکدا، کە نازانێت ولات بەڕێوە ببات).

لە نزیك ڕەهادا لە دەستدابوو، هۆلاکۆ لەسەر ئەو کارەی دەستگرۆی کرد میرنشینی حیمسی گێرایەوە، کە ناسر یوسف دوانزە ساڵ پێش ئەو لە ساڵی (٦٤٦) دا لێی سەندبوو، هەروەها هۆلاکۆ مەلیك ئەشەرەفی کرد بەسەرکردەی گشتی خۆی لە شام ناسریش بە سوپاکانیەوە مەمالیك ناسری و عەزیزەکانی و ژمارەیەك لە مەمالیکەکان دەریاییەکانەوەو لە سەروو هەمووشیانەوە بیبرس بوندقداری[1] لە دیمەشق دەرچوو لە گوندی(یەرزە) چادری هەڵدا کەمێك لە باکورە دیمەشقەوە دوربوو، بەڵام فرە ڕەگەزی سوپاکەی و ڕکەبەری کۆنی نێوان ئەو ڕەگەزانەی وێڕایی ناکۆکی دڵی سەرکردەکانی و پیلانگێڕی مەمالیکە ناسریەکانی بۆ کوشتنی و ترسی سەرکردەکان لە هۆلاکۆو سەربازەکانی خێرا وای لێکرد بۆ غەزە پاشەکشە بکات، کە لە نزیك ئەو فریاگوزاریەوە بوو، کە سوڵتانی میسر بەڵێنی پێدابوو، ئەو هەنگاوە چاوەڕونکراوە تا ئەوەپەڕی ڕێ هاوتایی سروشتی خۆی بوە، چونکە بەهیچ جۆرێك بیری نەدەکردەوە لە پاراستنی پایتەختەکەی و بەوەش ژیانی بەرەو ڕوی مەترسی بوویەوە، بەڵکو خێرا بەجێیهێشت بۆ وەزیرەکەی خۆی(زەینەدینی حافظي)[2] کە لە مارسی ساڵی (١٢٦٠)ز ربیعولئەوەلی ساڵی ٦٥٨ی ك دا دایە دەست

---

١ــ پێشتر ئاماژەمان دا بە بەرگریکاری مەمالیکی دەریایی بۆ مەلیك ناسرو پەنا بردنیان بۆ لای مەلیك موعینی ئەیبوی بەرپسی کرك، ئەوەشی بۆ زیادەکەین، کە ئەو مەمالیکانە پەنایان بۆ شاڵاو بردنە سەر ناوچەکانی مەلیك ناسر، ئەمە وای لێکرد بە سوپاکانیەوە بەرەو کەرك بکێشێت و ساڵی (٦٥٧) دا لەوێ گەمارۆی موعین بدات، چونکە موعین ئەو مەمالیکانەی پەنا دەدا، موعین ناچاربوو ئەو مەرجانەی ناسر قبوڵ بکات، کە تیایاندا هاتووە چی مەمالیکی دەریایی لایە بیاندات بە دەستەوە، کاتێك بیبرس بەمەی زانی ببەکۆمەڵێك مەمالیکی دەریاییەوە ڕایکرد بۆلای مەلیك ناسر داوای لێبوردنی لێکرد، ئەویش لێیان خۆشبوو و خستنیە خزمی خۆیەوە، موعینیش مەمالیکەکانی دەریاییەکانی تری گرت وناردنی بۆ مەلیك ناسرو ئەویش لەگەڵ قەڵای حەلەب بەدیلی گرتن، لەوێ مانەوە تا تەتار دەستگرتن بەریاندا هۆلاکۆ لە گەڵ دیلەکانی تردا بردنی بۆ وڵاتی خۆی(بگەڕێوەبۆ: إبن واصل: مفرج الكروب ج ٢ ص ٣٩٠ــ ٣٩١) یان (أبو الفراو، ج ٣، ٢٠٣) المقريزي السلوك ج١ ص٤١٤ـ٤١٥، النجوم الزاهره ج٧ ص ٥٣)

٢ــ زەینەدین سولەیمانی کوڕی موئەیدی کوڕی عامرعەقرەبانی ناسراو بە(زەینەدینی حافقی)یە، کە باوکی وتاربێژێکی لێهاتووی گوندێکی دیمەشق بوو، ئەویش سەرقاڵی پزیشکی بوو تیایدا بوویە

مەغۆل، قەڵا توندو تۆڵەکەی ئەوێ هەوڵیدا بەبێ ڕاپایی بەرگری بکات، لە ٣ی یولیۆی هەمان ساڵدا پارێزەرەکەی خۆی دابە دەستەوە[1] ودیمەشق لە وێرانکرن ڕزگاری بوو[2]، ئەمەش بە هۆی سکاڵا کەسە ناودارەکانیەوە ئەنتاکیەش لە خۆ بەدەستەوەدانیدا پێشەنگی کرد بە دیمەشقەوە، بەڵام هەر وێران کرا[3]، لەو کاتەدا هۆلاکۆ هەواڵی مردنی براکەی لە (خانی گەورە منگۆقان)ی پێگەیشت بۆیە بۆیە سەرکردایەتی سوپاکانی لەشامدا سپارد بە کەتبەغانوین و خۆی بە پەلە چوو بۆ قورلتای پێکەی کۆبوونەوەی سەرکردەکانی تەتەر لە لە پایتەختی قرەقەرم[4]، لەوێ هەڵبژاردنی بۆ کرا خاقانی نێی مەغۆل، هۆلاکۆ وای دانابوو ئەو بکرێت بە خاقانی مەغۆل لە بەرگرنگی و بەرفراوانی فتوحاتەکانی، بەڵام لە تەبریز[5] زانی قوبیلای برای

---

هەڵکەوتە نازناوی(حافظي) وەگرت، چونکە لە خزمەت حافز نورەدین ئەرسەلانشاهی کوڕی عادل ئەبو بەکری کوڕی ئەیبووی بەرپرسی قەڵای جەعبەر دابوو، پاشان چووە خزمەت مەلیك ناسر یوسف حەلەب و پلەو پایەکی بڵندی هەبوو لای ئەو وماڵ و سامانی زیادیکرد و لە دەوڵەتەکەیدا جێپێی چەسپاو نامەی بۆ هۆلاکۆ ناردو تەماعی دەخستە بەریان تابێن، ئینجا گەڕایەوە ناسری ترساند تا ڕایکرد وخۆی کاروباری دیمەشقی بۆ تەتار گرتە دەست و بەمەلیك زەینەدینی ناو دەبرا، پاش شکستی عەین جالوتدا لەگەڵ نوێنەرانی تەتاردا لە دیمەشق ڕایکرد لە ترسی مەلیك موزەفەرەدین لە ساڵی ٦٦٢ك دا بە دەستی مەغۆل کوژرا.

١ــ لە سەر دیواری قەڵای دیمەشق دەربڕینێکی یادەوەری سەبارەت بە شاڵاوی مەغۆل نەخشێنراوە، کە تیادا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەوتنی قەڵاکە لە ٢١ی جەمادی ئاخیری ٦٥٨ك ٣ی یونیۆی١٩٦٠ ز دابووەو سوپایی میسری و شامی لە ٢٧ ڕەمەزانی هەمان ساڵدا(٥/سێپتێمبەر) گرتویانەتەوە، شارەکەیش دوو مانگ پێش کەوتنی قەڵاکە خۆی داوە بەدەستەوە.

٢ــ مێژووش ناسراو بە ئەبو شامە لە کاتی داگیرکاریەکەی مەغۆلدا لە دیمەشق بووەو بە دوورو درێژی وەسفی ئەو جەنگەی کردوە لە کتێبەکەیدا(الذیل علی الروضتین ص: ٢٠٤) لە کۆتایدا دەڵێت: سوپاس بۆ خوا، کە لەو بەلایەدا پاراستنی کە کەسانی تر توشی بوون

٣ـ Cambidge Medieal Hifoyry trp٦٤٣

٤ــ قرەقەرم شارێکە لە مەنغۆلیا لەسەر ڕووباری ئەرخون لە ناوەڕاستی ئاسیادا و ئێستا تەنها چەند کەلاوەیەك و پەرستگاکانی بوژی لێبەجێماوە.

٥ــ لەوکاتەوە تەبریز لە شان و شکۆو دەوڵەمەندیدا شوێنی بەغدای گرتەوەو عێراق لەوێوە فەرمانڕەوای مەغۆل دەکرا.

هەڵبژدراوە[1] (١٢٦٠ـ١٢٩٤)و بە سیفەتێکی نا شەرعی و لە ڕێگەی سەرکردەکانی مەغۆل لە ڕۆژهەڵاتی دووردا، کە دەیانوسی پێش هاتنی فەرمانڕەوایانی ڕۆژئاوا تێکبدەن، ئەمە دژ بەوبنەمایانەی دەسەلات بوو، کە جەنگیزخان داینابوون، بەڵام هۆلاکۆ وەك ڕێزگرتن لە قوبیلای برای بەو ئەنجامە ڕازیبوو.

ناسریش هەرکە بە سوپاکەیەوە گەیشتە غەزە قوتز کەوتە لە خشتە بردنی یەکەکانی ئەو سوپایەو ڕاکێشانیان بەلای خۆیدا، چونکە قوتز لە شتێك نەدەترسا هێندەی گەیشتنی سەرکردەیەکی ئەیوبی بە سوپایەکی جەنگیەوە بۆ سەرسنوری میسر لەخشتەبردنەکانی قوتز سەریان گرت تا ئەوەی ناسر بە تەنها خۆی چویە ناو غەززەو لەگەڵ هەندێك لە نزیکان و دەربارەی تیدا چوویە دەرێ لەوێ و ڕێکوپێك نەیدەزانی چی دەکات، ئینجا چوو بەرەو (قطربا)[2] لە باشوری فەلەستین، بەڵکو پەناگەیەکی دوور لە دەستی مەغۆلی لەلایەکەوەو دەست مەمالیکی لە لایەکی ترەوە دەست بکەوێت، کاتێك لەم بارەدا بوو دوو کەس لە پیاوەکانی نهێنی ڕوو وەرچەرخا نوسی ناسریان لە سنورە میسریەکان بۆ کەتبە غاینی[3] جێگری هۆلاکۆ

---

١ــ قوبیلای تا ساڵی (٦٩٣/٢٩٤)ز خانی گەورەی وڵاتی تەتەر بوو لە ماوەی دەسەلاتیدا دەستیگرت بەسەر بەشەکەی تری چینداو پایتەختی تەتەری لە قراقرمەوە گواستەوە بۆ خان بالق کە بەکینی ئێستایە، دەوڵەتی قولابیی لەوکاتەوە مۆرکێکی چینی وەرگرت بە جیا لە هەموو دەوڵەتەکانی تری تەتەر لە پێشداو خێزانی دەسەلاتداری پێی ناسراوە بە یوك(yuen) بڕاوانە: Blocf:Hisfre des sulfans MaMlks ١,p ٣٧٧

٢ــ هەروەها بە قورتبە دەنوسرێت، کە گوندێکی دەوربەری جفارە لەڕێگەی نێوان میسرو شام لە نێوە ئەو لمەدا لە نزیك قرما کە مزگەوت و نەخۆشخانەی تێدابوو و والی تەپڵخانە لەوێ تا دەیەك لە بازرگانان وەربگرێت وەربگرێت هەروەها(قاش و نافر، شهود ومباشـهر)ی تێدابوو کەس نەیدەتوانی بەبێ مۆڵەت لە میسرەوە بچێت بۆ شام یان بە پێچەوانەوە، گومرگ لەو کەسانەوە وەردەگیرا، کە دەهاتن بۆمیسر(یاقوت: معجم البلدان، ج٢ ص ١٤٤) ئێستا ئەو گودە وێران بووە و تەنها شوێنەوارو پایەکانی لە ڕێگەی نێوان قەنتەرەو عەریش لە باشوری ڕۆژهەڵاتی وێستگەی رومانە(رومانی کۆن) ماون، کە دەکیلۆمەتری تر دوورە(أبو المحاسن: النجوم الزاهره ج٧ ص٧٧ حاشیه رقم٢)

٣ــ ناوی ئەو سەرکریە بە چەند جۆرێکی جیاواز دێت، وەك کەتبوغا کتبو قانوین ئەم کەسە لە هۆزێکی تەتەریە چەند سەدەیەك بوو ئەو هۆزە ئاینی مەسیحیان وەرگرتبوو، پێدەچێت ئەمە یەکێك

لە دیمەشق ئاشکراکرد، کەتبەغایشق دەستەیەك لە سوارەکانی ناردو لە (برکـة، زیراء)[1]دا سەرکردەی ئەییوبیان گرت وناردی بۆ لای هۆلاکۆ و هۆلاکۆ و پێی باشبوو ئەو دەقی قسە وتنەی لە بیر ناکەن پێدەچێت لە بەر ئەوەبوو بێت پێی وابووبێت سەرکردەی دیمەشق بە سودترە بۆ خۆی و ئەو سیاسەتەش، کە شوێنکەوەکانی خۆی دەبینی لەگەڵ موسڵمانان لەگەڵ میری گەنجی حیمسدا مەلیك ئەشرەف موسا بن، بۆیە بە جوانی پێشوازی لێکردن و بەڵێنی پێدا ئیمپڕاتۆریەتی ئەیبوی بۆ زیندو بکاتەوە، کە لە دەروبەری شامەوە تا نەوب و لە بەرقەوە تا فورات درێژ دەبوویەوە، هەروەك بەڵێنی پێدا، کە دواتر دەسەڵاتی کرداری هەموو وڵاتی پێدەدات بە میسریشەوە بەمەرجێك دان بنێت بەدەسەڵاتی مەغۆل و سەرکردایەتی خانی گەورەدا، لێرەدا ڕاستیەکمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە گرنگی خۆی هەیە سەبارەت بە ئاسایشی دەوڵەتی مەمالیك لە میسر، ئەویش ئەوەیە پاشای ئەیبویان لەگەڵ مەغۆلدا ڕێکدەکەوێت بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی مەملوکی تازە پێگەیشتوو، ئەمە ڕاستیەش ئەگەر هەر شتێك بڵێت ئەوا بەڵگەیە لە سەر ئاستی ئەو مەترسیە هەڕەشەدارەی بەرەو ڕووی قەوارەی دەوڵەتی مەملوکی دەبێتەوە هەروەك ئەوەیە لە دەوڵەتی بە ناتەواوی دامەزراوە تا کاتێك ئەو مەترسیانە بهێنن.

هۆلاکۆ پێی باشبوو سوپایەکی بەرەو ڕۆژئاوا درێژە بە کێشانی خۆیان بدەن و بەو فتوحاتە گرنگانەوە نەوەستێت، کە دەستیگرتووە بەسەر حەلەب و دیمەشقدا بۆیە خۆی ئامادەکرد بۆ هێرشبردنە سەر بەیت لمەقدس و بەدوای ئەوەشدا شاڵاو بینە سەر وڵاتی میسر بۆیە نێردراوی خۆی بە نوسراوێکەوە نارد بۆ میسر، کە

---

بێت لەو هۆکارانەی وایانکرد موسڵمانانی دیمەشق بچەوسێنێتەوەو قسەکانی مەسیحی بەرز ڕابگرێت و بچێتە کلێساکانیانەوە، ئەمە هانی مەسیحیەکانی دیمەشقی دا تا توندی لە ڕووی موسڵماناندا بنوێنن(أبو شامە: الـذيل علـى الروچتين ص٢٠٨، المقـرزی الـسلوك ج١ ص ٤٢٥)نوین وشەیەکی فارسیەو زۆر لە پاك ناوی سەرۆك تەتەرەکاندا دێت و بەواتای پێشڕەوی هەزار دێت، یان دەهەزاردێت (أبو المحاسن: النجوم الزاهره ج٧ ص٧٧ حاشيه رقم٢)

١ــ گوندێکی بەلقایی گەورەیەو بەلقاش ناوچەیەکی سەربە دیمەشق جاجیەکان دەچوونە ئەوێ وبازاری تێدابوو بۆیان بەرەکەتێکی زۆری تێدابوو(یاقوت ــ معجم البلدان ج٢ ص ٩٦٦).

پڕبوو لە هەڕشەو گوڕەشە و ترساندنی سوڵتانی مەملوکی میسر، ئەگەربێت و ملکەچ نەبێت و دان بە دەسەلاتی مەغۆلدا نەنێت، ئێمەش وەك پاشکۆیەك لە کۆتایی کتێبەکەدا دەقی ئەو وتەیەمان هێناوە، کە بەڵگەی ئاستی دەستدرێژی مەغۆلەکان و ئەو وێرانی و کوشتنە نیشان دەدات، کە وڵاتە داگیرکراوەکاندا ئەنجامیان دەدا.

لە بەردەم ئەو مەترسیەدا سوڵتان قوتز کوڕێکی لەگەوره سەرکردەکان بەست و دواجار بڕیاردرا بە ئامادەزانی بۆجەنگ وەلامی هەڕەشەکانی تەتەر بدەنەوە، لەو ماوەیەدا زۆرێك لە سەرکردە مەمالیکە دەریاییەکان، ئەوانەی لە ڕۆژانی ئەیبەگدا لە ترسی کوشتن ڕایانکردبوو و لە نێو دەوڵتۆکە شامیە ئەیبوبیەکان و ناوکۆشکی دەوڵەتی سەلجوقیەکانی ڕۆم لە ئاسیایی بچوکدا مابوونەوە بەرەبەرە دەهاتنە ناو میسر دوای ئەوەی مەغۆلەکان بەناو گەورەترین شارەکانی شامدا بلاوبوونەوە و هەڕەشەیان لە خودی ئاسیایی بچوکیش دەکرد، ئەو مەمالیکانە مەترسیەکانی خۆیانیان لە بیرکردو قوتزیش بەهەمان شێوە پێشوازی لێکردن و ئیقتاعی فراوان و بە نرخی بۆ بڕینەوە، بەمە مەمالیکەکان بوونەوە بە یەك دەستەی یەکبوو، ئەو دیاردەیەش لە نا ڕیزی مەمالیکەکاندا لە کاتی ئەو تەنگەژانەی بەرەورووی دەوڵەتەکەیان دەبێتەوە لەمێژووی دوورو درێژیاندا زۆر دووبارە دەبێتەوە، لە ناو مەلیکانەش، کە گەڕانەوە بۆ قاهیرەو دەیان ووت: پێویستە لەگەڵ تەتەرەکاندا بجەنگن، میر بیبرس بوندقدارەی بوو[١]، کە قوتز لە ساڵی ١٢٦٠ز/ ٦٥٨ك پێشوازی لێکردو لە دارولوەزرا دایناو[٢] ناوچەی قلیوب ز دەورووبەرەکەی بۆ بڕیەوە[١]، قوتز

---

١ـ دەڵێن: بیبرس داوای لە ناسر کردووە کاتێك لای ئەو بووە تا خۆی یان کەسێکی تر چوار هەزار سوارەوە بنێرێت، تابیان بەرەو کەنداوی فورات تا نەهێڵێت تەتەرەکان لێی بپەڕنەوە، بەلام ناسریی ئەوەی پێنەدا، بۆیە بۆیە ئەویش لێی جیابوویەوەو چوو بۆ میسر (الکتبي: فوات الوفیات ج١ ص ٨٦) هەروەها دەڵێن: بیبریس وەزیر زەینەدینی حافظی داوە بەرقسە کاتێك ئاماژەی بۆ مەلیك ناسر کردووە، کە لەگەڵ تەتەردا لە جەنگێت و بەهاوارەوە وتوویەتی: ئێوە هۆکاری لە ناوچوونی موسڵمانن، المقریزي: السلوك ج ١ ص ٤١٩؟

٢ـ دارولوەزرالە پاڵ کۆشکی خیلافەتی فاتمیدا بوو وناسرابوو بەکۆشکی گەورەی ڕۆژهەلاتی، وەزیر ئەلفزلی کوڕی بەدرولجەمالی بنیادی نا، دەڵێن: بەدرولجەمالی خۆی بنیادی

وەڵامێکی ڕوونی بۆ هەڕەشەکەی هۆلاکۆ هەبوو و نێردراوەکانی مەغۆل گرت و دای لە ملی هەموویان و سەرەکانی بەسەر(باب زەویلەدا) هەڵواسی و لە قاهیرەدا لە هەموو هەرێمەکاندا بانگەوازی دەرچوون بۆ جیهاد کراو لە هەمان کاتیشدا قوتز هەوڵیدەدا سوپا کۆ بکاتەوە و ماڵ و سامانی پێویست یەکبخات بۆ خەرجی ئەمەش بە دانانی چەند باجێکی نوێی جۆراو لە سەر دانیشتوانی میسرو قاهیرە،[٢] قوتز لە کۆکردنەوەی ئەو باجانەدا تووشی نارەزاییەکی توندی دادوەران وپیاوانی ئاینی بوویەوە، ئەوان سەرجیان لەسەر دانا بوو، کە دەبێت یەکەمجار چی لای خۆی و لای دەوربەرەکەی هەیە بیهێنن و چی شمەکی لای سەرکردەکان هەیە بیهێنن تا بیکەنە دروا و دابەشی بکەن بە سەر پیاوانی سوپادا ئەگەر ئەمە بەشی نەکردن ئینجا دروستە باجی نوێ لە سەر هاوڵاتیان دابنێن، هەروەها لە ماڵ و سامانی بازرگان قەرز وەربگرە تا پشتی پێببەستن بۆ جەنگی دژ بە دوژمنانانی ئیسلام قوتز گوێڕایەڵی پیاوانی ئاینی بوو و نەکەوتە کۆکردنەوەی سامان لە میسریەکان تا ئەوەی خۆی و سەربازەکان چی ماڵ و سامانی لابوو هێنایانە بەردەست شێخ

---

ناوە، وەزیرانی دەوڵەتی فاتیمی ئەوانەی شمشێر بەدەست بوون لە سەردەمی ئەلفەزلدا لەوێ دادەنیشتن تائەوەی دەوڵەتەکە ئاوابوو، کە بە دارلئەلفەزلدا ناسرابوو، پاشان سەلاحەیدنی ئەیوبی و مەلیك عەزیزی کوڕی و دواتر مەلیك عادلی تێدابوو، دواتر بە داروسلتانیە ناویان دەبرد، یەکەم کەس کە لەوێ دەچوو چوو بۆ قەڵای شاخ مەلیك کامیل کوڕی عادل بوو، کە کردی بەماڵی نێردراوان، کاتێك قوتز بوو بە پادشای میسرو مەمالیکی دەریایی لە شامەوە هاتن بۆ لای قوتز چوو بەرەو پیریان و میر بیرشی لە دارلوزەرادا دانا(المقريزي: المخطط: ج٢ ص ٣٠١-٣٠٢)

١ـ الكتبي: الفوات الوفيات/ ص ٨٦ـ المقريزي: السلوك ج ١ ص ٤١٩ـ ٤٢٠.

٢ـ المقريزي: السلوك ج١ ص ٤٢٩ ئیبن ئیاس: بدائع الزهور ج١ ص ٩٦ـ ٩٧ ئەو باجانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەڵێت: قوتز: کەوتە گرتنە بەری پێناوەکانی سامان کوکردنەوەو بۆ هەرکەسێکی نێرو مێ خەڵکی میسر و قاهیرە دینارێکی لێوەرگرتن و زەکاتی خێرو بێریشی ماڵ و سامانی لە خەڵکی دەوڵەمەند و بازرگان سەندو کرێی مانگانەی لەسەر بازرگانەکان دانا و بەگشتی شەش هەزار دینار کۆکردەوە، مە بەست بە تورکی ئەو ڕەگەزە تورکانەی، کە لە ماوەیەکی دوورو درێژدا لە میسر نیشتەجێبوون، السلوك: ج ١ ص٤٣٧ حاسیة٥ تاج الدين السبكي: الطبقات الشافعية الكبرى ج٥، ص٨٣، إبن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٣٩٢.

عیزەدینی کوڕی عەبدوسەلام، کە بە هێزترین پیاوی ئاینی بوو لەو کاتەدا سەکردەکانیش تەنها لەم بوارەوە کاریان نەبوو، بەڵکوو قوتز لە ڕازیکردنی زۆرێک لە سەرکردەکاندا سەختیەکی زۆری چەشت تینیان سەر بۆ بخاتەوەو دەیوت: ئەی سەرکردەکانی موسڵمانان ڕۆژگارێکمان هەبوو بەیتولتان دەخوارد و ئێستا حەزتان لە جەنگ جیهاد نیە، دەی من وا دەڕۆم کێ جیهاد هەڵدەبژێرێت با بێت لەگەڵمدا، هەرکەسیش جیهادی ناوێت بابگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی ئەوا خوا ئاگادارە پێی و تاوانی موسڵمانان لە گەردنی ئەوانەیە، کە نایەن و دوادەکەون، ئەو وتارە کاریگەری هەبوو لە بەهێزکردنی دەروونی داڕماویاندا هەموو سوێندی یەکدەنگیان خوارد لە سەر جیهادی دژ بەدوا ڕۆژ من و دورخستنەوەی وڵات.

لەمەی پێشووەوە بۆ مان دەردەکەوێت وێڕایی ئەو سەختیە دەرکیانەی بەرەو ڕووی دەوڵەتی مەمالیك دەبوونەوە لە ئەنجامی پەیوەستبوونی ئەیوبیەکان بە مەغۆلەوە بۆ بەهێرش بردنە سەر میسر چەند سەختیەکی ناخۆشی توشبوو، کە لەو مەترسیە کەمتر نەبوون، کاتێك ئامادەسازی گشتی لە ڕووی سامان و سەربازەوە ڕاگەینرا بۆ ڕێگرتن لەو مەترسیە مەغۆلیە ترسناکە، لە ئۆغسطي ساڵی ١٢٦٠ز / ڕەمەزانی ساڵی ٦٥٨ك دا قوتز بە سوپا میسریەکان و ئەو سوپا شامیانەی دابوویانە پاڵی و سەربازانی تریشەوە لە میسر دەرچوو و فەرمانی بە میر بیبریس کرد تا بەدەستەیەك لە سەربازەکانیەوە پێشکەوێت، تا هەواڵی تەتارەکان بزانێت، بیبریس چوو تا غەززەدا گەیشت بە مەغۆلەکان شکستەکە یەکلاکەرەوە نەبوو، بیبریس بەردەوام لەگەڵ دوژمندا دەستەو یەخەدەبوو و ئەملاو لای پێدەکرد، تا بێئاگایان بکات لە جموجوڵی سوپایی سەرەکی بەسەرکدایەتی قوتز، پاشان قوتز لە ڕێگەی، کە ناراوەوە پێشکەوت و یەکەمجار ڕوویکردە عەککا تا نیازی ئەو فرەنجانەی بۆ ڕوون ببێتەوە، کە پەیوەندیان لەگەڵ ناسری سوڵتانی حەلەب و لە دیمەشق دا، ئەمەش بە پێی پەیمانامەیەك لە ٢١ی فبرایەری ساڵی ١٢٥٤ ز کە تا دەساڵ درێژە بکێشێت میسر دوای بەستنی ئەو بەیاننامەی لە ساڵی ١٢٥٦از چویە ناو پەیمانەکەوە هەندێك لە مێژوونوسان لەو بارەیەوە دەڵێن فرەنجەکان لەو کاتە دا پێشنیازیان بۆ قوتز کرد بە چەند هێزێکی خۆیان یارمەتی

قوتز بدەن، بەڵام قوتز ووتی: هێندە بەسە بێلایەنی تەواو بنوێنن، ئەگەر نا پێش تەتەرەکان لەگەڵ ئەواندا بجەنگێت، بەڵام باری خاچپەرستان لە وڵاتی شامدا دەرفەتی پێنەدات، تا هیچ یارمەتیەك پێشکەش بکەن بە سوڵتان قوتز، یان مەغۆل، سوڵتان قوتزیش لە ڕاسیدا پێویستی بە ترساندنی خاچپەرستان نەبوو، چونکە باری هەموو شیعەکەکانی شام بە تایبەت عەککا لەو پەری خراپیدا بوو، چونکە ململانێیەك لە نێوان جەنەویەکان و بوهمەندی شەشەمی میری ئەنتاکیەش دایە پاڵ جەنەویەکان و داویە تیوتون و دەستەی قەدیس تۆما ئەکوا لازاریش دایانە پاڵ بندوقیەکان، جەنگەکە بە درێژایی وشکانی و دەریای کە ناردی پەلیهاوێشت وژمارەیەکی زۆریان کوژران شمەکێکی زۆر زۆریان لە ناوچوو، ئەو ململانیە بە بەستنی پەیمانامەی نێوان هەردوو لا ٩ ئۆکتۆبەری ١٢٥٨ز کۆتایی پێهات، لێرەوە باری ناخۆی فرەنجەکان دەزانین، کاتێك قوتز لە ساڵی ١٢٦٠ز دا چوو تا لەگەڵ مەغۆل بجەنگێنن مەسیحیەکان لە بارێکی لاوازی وادابوون، کە نەیاتوانی بەشداری لەو جەنگەدا بکەن ئیتر یارمەتدانی هێزی میسری بێت یان مەغۆلی.[١]

پاشان قوتز لە عەین جالوت گەیشتەوە میر بیبرس[٢] هەندێك لە مێژوونوسان دەگێڕنەوە، کە گەڕانەوەی هۆلاکۆ بەبەشێك لە سوپاکەیەوە بۆ فارس کەمێك پێش ئەوەی هێزی مەغۆلەکانی لەبەردەم مەمالیکدا لاوازکردبوو، بەڵکو ئەبولمەحایس دەڵێت: هەندێك لە سەرکردەکانی موسڵمانان، کە ملکەچی تەتەرەکانی بوو بوون ئامۆژگاری سەرکردەی مەغۆلەکانیان کرد تا چاوەڕوان بێت تا هۆلاکۆ بگەڕێتەوە، یان یارمەتی هۆلاکۆی پێبگات تا بتوانێت بەرەو ڕووی سوپایی میسری ببێتەوە[٣]

---

١- Wiet: Histoire da nation Egyptienne n lv, p ٤١٠

٢ ـ شارۆچکەیەکە لە ڕۆژهەڵاتی دارین لە نێوان بیسان و نابلس لەناوچەی فەلەستین، ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئەفسانەی، کە دەڵێت: داود لەو شوێنەدا جالوتی کوشتووە، خاچپەرستان پێیان دەوت: شاری(Tubanea) یاقوت: معجم البلدان ج٣ ص٧٦.

٣ـ دەڵێن: هۆلاکۆ بەنزیکی چل هەل هەزار سەربازەوە خۆی ئامادە کردبوو تا بەرەو میسر بکشێت، بەڵام مردنی قانی برای ناچاری کرد بە شێك لە سوپاکەی بکشێتەوە بۆ فارس دوای ئەوەی شامی بە دەهەزار سەربازیەوە بە جێهێشت بۆ کەتیبە غانوین تا ئەرکی داگیرکردنی

هەرچۆنێك بێت گەڕانەوەی هۆلاکۆ بۆ فارس بڕیاری تەتەری نەگۆڕی بۆ هێرش بردنە سەر میسر، هەروەك دەروونی مەمالیکەکان لە ئاسایش و ئارمیدا بوو، بەڵکو دڵیان ناڕەحەت و پڕ ترس بوو لە گەڵ مەغۆلیەکە ئاسیاو پەشێکی ئەورپایان بێ هیچ شکستێك بڕیبوو، لە بەرە بەیانی ڕۆژی هاوکات٣ی سێپتەمبەری ساڵی ١٢٦٠ز/٢٦ی ڕەمەزانی ساڵی ٦٥٨ك هەردوو هێزی مەغۆلی و مەملوکی لە جەنگێکی گشتیدا لە عەین جالوت پێکگەیشتن، چاکترین بەڵگەش بۆ درێژەی ئەو جەنگە نهێنیەکانی گێڕانەوەی صارمەدین ئەزبەك عەبدوڵای ئەشرەفیە، کە لە کاتی هێرش بردنیان بۆ شام بە دیلی کەوتە دەست مەغۆلەکان و ڕازیبوو لە ڕیزەکانی ئەواندا خزمەت بکات و لەو جەنگەدا لەگەڵیاندا بەشداری کرد جاگێڕانەوەکەی نرخی خۆی هەیە، تەنها لەبەر ئەوەنا کە خۆی لە جەنگەکەدا بوو، بەڵکوو لەبەر ئەو ڕۆڵەی، کە لە جەگەکەدا بینیویەتی و لە دەقەکەدا دەردەکەوێت، کە تیادا دەڵێت: هەرکاتێك چومە شام دەبینم تەتارەکان لە سەر ڕووباری ئوردون کۆبوونەتەوەو بەرەو میسر دەچن منیش کەسێکم وەك جاسوس ناردو فرمانم پێکرد تا لە گەڵ مەلیك موزەفەر قوتز ومیر بیرس بوندقەداری و بلبان ڕەشێوی و سنقری ڕۆمدا کۆبێتەوەو هەواڵیان پێبدات، کە تەتارەکان هیچ نین وبا لێمان نەترسن و با لای ڕاستی موسڵمانان بە سوارەو سەرباز بەهێز بێت هەواڵی پێبدات پێکبگەی، جا کاتێك ئەو کەسەی من گەیشتە سەربازگەی موسڵمانان دەبینێت ئەوان زۆر لە تەتارەکان دەترسن، ئەویش لەگەڵ ئەو سەرکردانە کۆبویەوە، کە من پێم ووتبو: ئەوەی وتن، کە من وەسیەتم پێی کردبوو، من لە قسەکەمدا پێم ووتبو بەسەرکردەکان بڵێ: مەترسن وامن و هاوەڵەکانم و مەلیك ئەشرەف لە بەردەمتاندا چۆك دادەین، سوێند بەخوا وایش بوو، کاتێك سەرکردەکان قسەی ئەوکەسەی منیان بیست لە نێوان خۆیاندا وتیان: ئەمە بەسەر موسڵماناندا پەیڕەو ناکرێت، کاتێك لە عەین جالوتدا هەردولا پێکگەیشتن خۆرمان لێ هەڵدەهات و سەربازگەی موسڵمانان یەکەم سنجق بوو

---

میسر بەجێبگەینێت (تلفيق الأخبار وتلقيح الآثار في وقائع قزان وبلغار وملوك التتار ج١ ص ٤١٩).

سوروسپی ڕەنگ بوون، خۆر ئاوابوو بەوبارەوە، کەتبەغانمی بانگکرد، کە ئەوکات من و ئەو تەتارانەی لەگەڵیدابوون تاو زۆری ئەو سەربازگەیەو چاکی سواریاندا دەستەوسان وەستا بووین، کاتێك لە شامەوە دابەزین، کەتبەغا پێی ووتم: ئەرێ کابرا ئەمە ڕەنگی کێیە؟ ووتم: بلبانی ڕەشیدی پاشان یەك یەك هاتن و لەو شاخە دابەزین و تەپڵ و دەف لێدەدراو دۆڵ دەشت پڕبوویەوەو خەڵك و جوتیاری شارو گوند لە هەموو لاوە ڕایانکرد، من چاك ڕەنگی موسڵمانانم دەزانی، ئیتر کەتبەغا پرسیاری لێ کردم (ئەمە ڕەنگی کێیە) منیش هەرچی بهاتایە سەرماندا دەمووت، پاشان تەتەرەکان بەرەو شاخەکە چوون و خوای گەورەش ئەو موحەمەیدی بە مالیکە تورکە دەریاییەکان سەرخست وکەس.

لە تەتەرەکان ڕزگاری نەبوو، تا هەواڵ بباتەوە بۆملاوون[1]، بەلام هەموویان کوژران و تەنها ئەوانەی دیمەشق، یان حەلەب بوون هەواڵەکەیان پێبوو سەرچاوە عەرەبیە هاوچەرخەکان ئەوەش بۆ گێڕانەوەکەی سارمەدین لە بارەی وردەکاری جەنگەکەوە زیاد دەکەن ز دەڵێن: مەغۆلەکان لە سەرەتاوە بە سەرموسڵماندا سەرکەوتن و توانیان ڕیزی لای چەپیان تێکبشکێنن میسریەکان باریان تێکچوو تەواو ترس و لەرز دایگرتن و خەریکبوو توشی شکان دەبوون، ئەوکات سوڵتان قوتز کڵاوەکەی سەری فڕێ دایە سەر زەوی و بەو پەڕی دەنگیەوە هاواری کرد(هاوار بۆ ئیسلام)و خۆی سەرکردایەتی هێرشەکەی کردوبەوەش نمونەیەکی دلێری، کەم وێنەی نیشاندا و خێرا هێزە میسریەکان لە دەوری کۆبوونەوەو هەڵمەتێکی ڕاستگۆیانەیان بردە سەر مەغۆل و هاسەنگیان تێکدان بەرەوتەپۆلکەکانی چواردەوریان ڕاوەدوویان نان دوای ئەوەی کەتبەغانی

---

١ـ المقریزی: السلوك ج١ ص ٤٣١، أبو المحاسن ـ النجوم الزاهره ج٧ ص٧٩، ابو الفداو ج٣ ص ٢٣٤، عبدالله بن ایبك ـ كنزالدرر ج٨ ق ١ص ٣٤ـ ٤٣، إبن إیاس بدائع الزهور ج١ ص ٩٧ ئەبو شامەش لەو بارەیەوە دەڵێت:

غلب التتار على البلاد فجاءهم　　من مصر تركي يجود بنفسه
بالشام أهلكهم، وبدد شملهم　　ولكل شئ آفة من جنسه

سەرکردەیان بەکوژراوی لە مەیدانەکەداو کوڕەکەیشیان بە دیلی لەدەست مەمالیکەکاندا بە جێهێشت، مەغۆلەکان گەڕانەوە بۆ جاری دووەم لە بیسان خۆیان ڕێکخستەوەو لەگەڵ میسریەکاندا لە جەنگی دووەمدا پێکیانداداو و جەنگەکە تەواو سەخت و توندبوو سوڵتانە قوتز گەڕایەوەو بە دەنگێکی بەرزی وا کە زۆربەی سەربازگەکە دەبیست هاواری دەکرد(هاوار بۆ ئیسلام) سێ جار (خوایە قوتزی بەندەی خۆت بەسەر تەتاردا سەربخەیت) ئەوکات سەرکەوتن دای بەلای سوپایی مەمالیکانداو دوا جار مەمالیکەکان سەرکەوتن مەغۆلەکانیش بۆ یەکەمجار لەمێژوویاندا شکستیان خوارد ئەو کات سوڵتان قوتز لە ئەسپەکەی دابەزی سەری خستە سەر زەوی و ماچی کردو دوو ڕکاتی سوپاسگوزاری بۆ خوای گەورە کرد، ئینجا هەستاو سواربوویەوە تا سەرئەنجامی مەغۆلەکان ببینێت.[١]

ئەمەو هەروەها قەلشەندی (ج٧ص ٣٦٠) نامەیەکی لە سەر زمانی مەلیك موزەفەر قوتز بۆ مەلیك مەنسور نورەدینی سوڵتان و دەولەی ڕەسولی لە یەمەن هێناوە، کە تیایدا مژدەکی شکستی تەتاری پێ داوە، نامەکە پارچەیەکی ئەدەبیەکە وەسفی جەنگەکە دەکات و قازی موحیدنی کوڕی عەبدول ئەمیر دایڕشتووە، قەلقەشەندی دان بەوە دادەنێت، کە ئەوەی لە سەر زمانی هەندێ کەس وەرگرتووە، کە لە چەند کۆمەڵێك وەرگیراوەو لەوێوە لەبەری کردووە، ئێمەش پێمان باشبوو پاشۆیەك لە کۆتایی کتێبەکەدابنێین.

جەنگی عەین جالوت یەکەم ئەلقەی زنجیرەی جەنگەکانی نێوان تەتارە دەوڵەتی مەمالیك بوو، وەك ئەوەی دەربڕی ئەزموونێکی جەنگی نێوان دوو ئسلوب هونەری جەنگی سەدەکانی ناوەڕاست بێت.

لە ڕاستیدا ئەو جەنگە، کە بە شکستی مەغۆل بۆ یەکەمجار لە مێژوویاندا کۆتایی پێهات، ئەو گرێن بەرگریە جەنگیەی نەهێشت، کە نهێنی سەرکەوتنیان بوو هەر لە ڕۆژانی جەنگیزخاننەوە، ئیتر لای جیهان ئەو ئەفسانەیە نەم، کە مەغۆل

---

١ـ أبو شامة: الذيل على الروضتين ص٢٠٨.

گەلێکن ناشکێن[1]گرنگی گەورەی ئەم جەنگەش ئەوەیە سەرکەوتن بوو بۆ سوپای دەوڵەتێك، کە هێشتا لە دەرەوەی دامەزراندنایە و ئەو پیاوە جیاوازانە دەگرێتە بەر پایەکانی خۆی هۆکارێکی دامەزرێنەری بوو چونکە یەکپارچە بە چاوی گەورەی و سۆزەوە سەیری دەوڵەتەکەی مەملوکیان دەکرد، گێڕانەوەکانی مێژوونوسانیش لە بارەی ئەو هەڵمەتە کە ئەنجامە کتوپڕەکانی هەموو هیوای موسڵمانی تێپەڕاندبوو شایەتی گەورەیی میسرو دەوڵەتی مەمالیك دەدەن جا بۆ نمونە خەزرەجی دەگێڕێتەوە موزەفەر نورەدینی سوڵتانی بەنی ڕەسول لە یەمەن بە سوپایەکی گەورەوە لە ساڵی دوای جەنگە واتە: لە ساڵی ٦٥٩ك/ ۱۲٦۱ز دا حەجی کرد، لە حیجاز دا ناودارانی خۆی و ناودارانی سوڵتانی میسر هاتن، یەکێك لە سەرکردەکان پێی وت: دەی مەولای گەورەمان ئەوانەی خۆی پێش میسریەکان بخە؟. سوڵتانی یەمەنیش پێی ووت: پێت وایە ئەوانەی دوێنێ تەتاریان شکاند ئەمڕۆ ئەوانەی خۆم پێش ئەوان بخەم جا ئەم دەربڕینە جوانە بەڵگەی ئەوەیە، کە دەوڵەتی مەمالیك لە میسر سۆزو قەڵەمڕەوێکی لە جیهاندا و لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنە بەدەست هێناوە[2].

ئەبولفیداش لەو بارەیەوە دەڵێت: موسڵمانان بێشومار لەسەرئەو سەرکەوتنە گەورەیەدا سوپاسی خوای گەورەی کرد، چونکە دڵەکان لە سەرکەوتن بەسەر تەتەردا بێهیوابوو بوون، چونکە ئەوان دەستیان بەسەر زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا گرتبوو و ڕوویانبکرایەتە هەر هەرێمێك داگیریان دەکرد و بەرەو هەر سەربازگەیك بچونایە دەیانشکاند[3]

هەروەها ئەوەی پێویستە تێبینی بکرێت ئەوەیە، کە پێش سەرکەوتنی عەین جالوت سەرکەوتنێکی خراپ هەبوو، کە فەزڵی بۆ مەمالیکەکان نەبوو تیایدا، ئەویش ئەو بەرگریکاریە ئەیبویەیە، کە بەردەوام دژبە بەردەوام بوونی دەوڵەتی مەمالیك

---

۱- Bvowne: Altevary Histy ofpvsa.۱۱۱P.٦,٦

۲ ـ الخزرجي: العقوداللؤلؤية في تأريخ الدولة الرسولية ص٦٩.

۳ـ أبو الفداء: المختصر في أخبارالبشر ج۳ ص۲۱٤.

بوو و هەوڵیدا کورسی دەسەڵات لە دەست مەمالیکدا نەبێت، ئەمەیش لە بەردەم شاڵاوی مەغۆلیدا دارماو لاوازی سەرشۆڕی لای پاشایانی ئەیبویدا دەرکەوت لە کاتێکدا مەمالیکەکان تیایداخۆگری و توانای مانەوەیان نیشاندا.

لەگەڵ ئەوەی ناتوانین حوکم بدەین لەسەرەنجامی پرۆژەی فەتحکردنی میسر سەبارەت بە ئەوروپایی مەسیحی، کە هیواگەلێکی زۆری بەسەرکەوتنی مەغۆل بەسەر موسڵمانانداندا هەبوو،[1] ئەوا هەندێك لە مێژوونوسە ئەوروپیەکان لە دیاریکردنی گرنگی عەین جالوتدا بۆ ئەوەی بۆ ئەوە دەچن، کە تەنها میسروشام دەوڵەتی مەمالیکی ڕزگارنەکر، بەڵکوو جیهانی ئەوروپا و شارستانیەتی ئەورووپیش لەخراپەیەك ڕزگارکرد، کە هیچ پاشایەکی ئەوروپایی ئەوکات نەیدەتوانی ڕێی لێ بگرێت[2] دیاریشە ڕێگەی بیابانی ڕۆژئاوایی ئەو ڕێگە سروشتیەکە لای جەنگاوەران و فەتحوازانێك بە درێژایی سەردەمە جیاوازەکان لە باشوورەوە شاڵاویان دەبردە سەر جیهانی ئیسلامی ئەوەش کەمتر نیەوە لەوەی هۆلاکۆش بە سوپاکەیەوە بگەڕێتەوە بەرەوە چۆن هانیپاڵ وە موسای کوڕی نەسیرو متچوری دوای جەنگی دوو ئالا لە جەنگی دووەمی جیهانیدا، دەبینین عەین جالوت کاریگەری بەهێزی هەبوو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا زیاتر لەهموو ئەو جەنگانە، چونکە ئەو جەنگە جەنگێکی نێوان گەلانێکی پێگەیشتوی ژیاری نیە، بەڵکو جەنگێکە، کە لایەنێکی جەنگەکە مەغۆلەکان گەلێکی سەرەتاین بەرەبەری شاخاوی وێرانکەرو خوێن ڕێژن لە هەموو شوێنێکدا، جا سەرکەوتنی مەغۆل لەو جەنگەدا واتە لە ناو بردنی یەکجارەکی ژیاری ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی پێشکەوتو.

---

١ـ ئەوەی قەشەی شاری ونشتر وتی: کە هیوای وایە موسڵمانان و مەغۆل یەکتر لە ناو ببەن و ئەو کات مەسیحیەکان لەسەری جەستەی ئەوان کەنیسەکەیەکی یەکگرتوی کاسۆلیکی جیهانی دابمەزرێنێن، شایەتی ئەمەیە، بڕوانە: Cambrigamed. Histovy vol ٦٢٨,٦٤٢ivp

2– Brwn: Alitavay History OF parsia.p60

# بەشی شەشەم

## سوڵتان ڤاهیربیربیس ٦٥٨ــ ٦٧٦ك/ ١٢٦٠ـ١٢٧٧ز

## توندوتۆڵکردنی پایەکانی دەوڵەتی یەکەمی مەملوکی لە میسر و شام

دەوڵەتی یەکەمی مەملوکی زاڵبوو بەسەر خێڵایەتی ناو میسردا، هەروەك زاڵبوو بەسەر زۆربەی نەوەکانی بنەماڵەی ئەییوبی لە شامدا، پاشان توانای جەنگی خۆی بەسەرکەوتنی بەسەر مەغۆلەکاندا لە جەنگی عەین جالوت بۆ جیهان نیشان داو هەر لە دامەزرانیەوە لە میسر شام هێماو نیشانەکانی هەواداری خۆی بۆ خیلافەتی عەبباسی خستە ڕوو تا ئەوەی خەلیفەکان بە تەواوەتی دانیان بە دەسەڵاتی سوڵتانەکانیدا دەنا، ئەمەش سیفەتێکی شەریعیدا بە دەسەڵاتیان و پاسەوانیەکی بۆ دروستکرد، کە لە هەرکەسێك دەیپاراستن، کە بیەوێت دەسەڵاتیان لێ دابڕنێت، ئەمەش ئەو هۆکارانەی مانەوایان بوو، کە دەوڵەتی یەکەمی مەملوکی هەیبوون، کاتێك بیبرس بوو بەسوڵتانی میسر(٦٥٨ـ ٦٧٦ك/ ١٢٦٠ـ١٢٧٧ز) پاشان سوڵتانی نوێ چەند هۆکارێکی تری بۆ زیادکرد، کە تەنها فەرمانڕەوایەکی بەرچاوڕوونی لێهاتووی بەتوانی گورج وگۆڵ دەیتوانی ئەوە بکات، بەو پێناوانە بیبرس بنیادی ئەو پاڵپشتیانەی تەواو کرد، کە سوڵتانە مەملوکیەکانی دوای ئەو لە سەری بوون:

### ١ــ لە ناوبردنی ڕا پەڕینە ناخۆیەکان:

یەکەم شت کە بەرەوە ڕووی بیبرس بوویەوە هەر لەو کاتەوەی بوو بە سوڵتان، دوو ڕاپەڕینی ناوخۆی بوون لە دەوروبەری یەك کات و لەکۆتاییەکانی ساڵی(١٢٦٠ز/ ٦٥٨ك) دا یەکێکیان لە دیمەشق و ئەویتریش لە قاهیرەبوو، بیبریس وەك هێزی ناوخۆی و دەرەکی لە یەك کاتدا هەردووکیانی قۆستەوە.

شۆرشی یەکەم سەرچاوەکی نارەزایی دەبرپین بوو لە کوژانی قوتز و بێزاری کارەکەی بیبرس، کە بەبێ ڕاوێژکردن ئەنجامی دا لەکاتێدا پێویست بوو ڕاوێژ

بکات، میر عەلەمەدین سنجری حەلەبی، کە قوتز لە دیمەشق دایناوبوو ڕاپەڕی و لە نۆڤەمبەری ١٢٦٠ز / ذي الحجة‌ی ساڵی ٦٥٨ك دا وەك سوڵتانی دیمەشق بانگەوازی بۆ خۆی کرد نازنوی مەلیك موجاهیدی لەخۆی ناو دروشمی سوڵتانی هەڵگرت و لە سەر مینبەرەکانیە وتاری بۆ خوێندرایەوە بەناویەوە دراو لێدرا و کەوتە قایموقۆڵکردنی قەڵای دیمەشق وەك ئامادەسازی بۆ جەنگ بەوەیشەوە نەوستا، بەڵکو هەواڵی نارد بۆ میرحسامەدین لاجینی عەزیزی جێگری حەلەب و مەلیك مەنسوری ئەیبوی بەرپرسی حەماو مەلیك ئەشرەف موسای بەرپرسی حیمص تاجینە زێز گوێرایەڵیەوە و یارمەتی بدەن، بەڵام وادیارە لە ترسی بیبرس بەرپەرچی دواکەیان دایەوە بیبرسیش بڕیاریدا پێش هەرشتێك سوپایەك جیابکاتەوە بۆ لەناو بردنی ئەو شۆڕشە پێش ئەوەی تەشەنە بکات، سوپاش بەنوێنەری دیمەشق وە لە یەنایری ساڵی ١٢٦١ز / ١٦ سەفەری ٦٥٩ك دا گەڕایەوە بۆ قاهیرە پاش مانگێك لە ڕاگەیاندنی شۆڕشەکەی لە قەڵای شاخدا بەندکراوبیبرس جێگرایەتی دیمەشقی دایە دەست عەلائەدین بوندقداری ئوسادی، کە لەو کاتەوە کەوتە ژێرئالایەوە بەمەش سوڵتان بەخێرایی و گورجوگۆڵی یەکێك لە بزوتنەو جیاوخوازیەکانی ناو مێژووی دەسەڵاتی مەلوکی لە ناو برد، ئەمەش بەڵگەی ساغ و سەلامەتی دەوڵەتە مەملوکی وشیاو نەبوونی بوو بۆ مانەوەی.

شۆڕشی دووەمیش کەسێکی شیعی سەرکردەبوو، کە بە گۆرانی ناسرابوو[١]، دنیا نەویستی و خواپەرستی نیشاندەداو لە لوتکەی شاخی(المقطم)دابوو و خزمەتکارو رکابەرداریەکانیش[٢] لەگەڵ کۆمەڵێك لە سودانیەکاندا هەواداری بوون ئەویش

---

١ـ دەدرێتە پاڵ گۆران، کە گوندێکی ئیسفەراینە، ئیسفەراینیش شارێکی قایموقۆڵی سەر بە نەیسابوورە لە نیوەی ڕێی جورجاندا(یاقوت: العجم البلدان: ج١ ص ٢٤٦ــ ٢٤٧، ج٤ ص ٣١٩)

٢ـ رکابداری ئەوانە بوون، کە لە کاروانەکاندا غاشیەیان دەبردە بە ردەستی سوڵتان سەریەرکاب خانەبوون کارمەندێکی تایبەتی هەبوو، کە پێی دەوترا(مهتا رکاب خاناە) بڕوانە: القلقشندی: صبح الأعشی. ج٤ ص ٧ـ ١٢

بانگەوازی دەکردن و هانیدەدام بۆ هەڵگێڕانەوەی نیزامی دەسەڵاتی سوننە مەملوکی و گۆڕینی بۆ دەسەڵاتێکی شیعی و پارچە زەوی دەبڕیەوە بۆیان و پشکی بۆ دەنوسین لە ئەنجامی ئەم بانگەوازەیان پڕوپاگەندەو بانگەشەیەدا لە ساڵی (١٢٦٠ز/ کۆتایەکانی ساڵی ٦٥٨ك)دا شۆڕشێك کەوتەوە و شۆڕشگێڕان بەشەو شەقامەکانی قاهیرەیان دەبڕی و هاواریان دەکرد(یا آل علی) ئەی بنەماڵەی علی دووکانەکانی سیوفیەکانیان لە نێوان دوو کۆشکدا دەکردەوەو چی چەکی تێدابوو دەیانبردو کەوتنە تێکشکاندنی پەچەی سواری سەربازان و ئەسپەکانیان بردن، بیرس بۆی دەرکەوت بەوجۆرە چارەسەر ناکرێت، بۆیە هێندە سەربازی نارد، کە بتوانن شۆڕشگێران نەهێڵن و هەموو سەرکردەکانیان بگرن تائەوەی شۆڕشەکە دامرکایەوە، سوڵتان فرمانیکرد گۆرانی سەرکردەکانی تریشی لە باب زوەیلە لە خاچ بدرێن، بەو جۆرە بیبرس بەتاوەتی پاشماوەی ئەو بزووتنەوەی لە ناو برد، کە بەردەوام کاریدەکرد بۆ تێکشکاندنی سونیەتی میسر هەر لەسەردەمی سەلاحەدینەوە بەو بەڵگەی سەرچاوە عەرەبیەکان باسی هیچ بزووتنەوەیەکی هاوشێوە لە میسرو شامدا ناکەن بەدرێژایی سەردەمی یەکەم و دووەمی مەملوکیش، ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئاستی توانایی بیبس بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکە، ئەمە وایکرد لە دامرکاندنەوەیدا سەرکەوتوبێت و شیاوی ئەوەبێت وە پێناوێکی قایمۆقۆڵکردنی دەوڵەتی دەربڕدرێت.

## د ـ زیندوکردنەوەی خیلافەتی عەباسی لەقاهیرەو دەرەنجامەئاینی و مادییەکانی:

بیبریس تەنها بە لەناو بردنی ئەو بزووتنەو شیعە فەزڵی بەسەر سوونن نەبوو، بەڵکو ئەوە دەوڵەتی مەملوکی والێکرد، کە فەزڵی بەسەر جیهانی ئیسلامیدا هەبێت، ئەمەش بەڕوونی لەو دیاردەیەکرا دەردەکەوێت، کە پەیوەستە بەبووژاندنەوەی خیلافەتی داڕماوی سوننی عەباسی، کە لە ئەنجامی ئاوابونیدا لە بەغدا گرفتێکی گەورەی لێکەوتبویەوە، ئەویش ئەوبوو دوای ئەو کارەساتە

خیلافەت لەکوێ و بۆ کێ لە ئەندامانی بنەماڵەی عەباسی دەبێت،کە بەناو دەشت و دۆڵی عیراق و ڕۆژهەلاتی نزمدا بلاوەیان کردبوو؟

لە کتێبەکاندا هاتووە، کە سولتان بیبرس یەکەم کەس بووە بیری لە بووژاندنەوەی خیلافەتی عەباسی کرووە تا ئەو بێتوانایەی نەهێلێت، کە لەسەر دەستی هۆلاکۆ و سەربازەکانی لێی کەوتبوو، هەروەها بۆ ئەوەی لە بەردەم جیهانی ئیسلامیدا خۆی دروست بکات، هەروەك دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەی بکاتە دەوڵەتێکی شەرعی وا، کە پارێزگاری لێکردنی ببێت بە ئەرك واجب لە ڕاستیدا بیبرس یەکەم کەس نەبوو، کە بیری لەو پڕۆژەیە کردبێتەوە لەناو ئەو پاشاو سوڵتانانەی، کە یەك لە دوای یەك دەسەلاتی میسرو شامیان گرتبووە دەست، بەڵکو تەنها ئەوە بوو، کەئە توانی بە دەستی بهێنێت، بەڵگەش لەسەر ئەوە زۆرن، جا ئەحمەدی کوڕی تۆلۆن لە ساڵی٢٦٩ك/ ٨٨٢ز دا هەوڵیدا خەلیفە موعتەمەد بەرەو میسر ڕابکێشێت، کاتێك براکانی خەلیفەیان بێدەسەلات کردو جێگرایەتی یەکەی درا بە میر ئەحمەد مۆفەق ئیبن تۆلۆنیش نامەیەکی بۆ نوسی و تیایدا ووتی: ترسم بۆ ئەمیری باوەڕداران لەوەی خراپەیەك تووشی خۆی ومال و سامانی بێت، کە نەکەوێتو گەردنمەوە لە نان ئاو خەوی کردم منیش سەد هەزار کەسم لاکۆبوەتەوە و پێم باشە گەورەم ئەمیری باوەڕداران بێت بۆ میسر، چونکە دوای ئەو سوکایەتی پێکردن دەگاتە ئەو پەڕی عیزەت و شکۆمەندی و هیچ دەستێکی براکەی (موفەق) پێی ناگات، کە هەموو چرکەیەك لێی دەترسێت.[1]

بێگومان ئەحمەدی کوڕی تۆلۆن بەوە ویستویەتی پالپشتی ئەو دەولە نوێیەی بکات، کە لە میسروشامدا دایمەزراند و سەرانەی سالانە بۆ دارالخلافە نەنێرێت وێڕایی تێکشکاندنی ڕکەبەرەکانە لە بەغداد، بەلام پڕۆژەکەی ئیبن تۆلۆن سەری نەگرت و موفەق خەلیفەی برای لەموسلدا گرت و گێڕایەوە بۆ بەغداد.

هەروەها موحەمەد ئەخشید کاتێك لە ساڵی ٣٣٣ك/ ٩٤٤ز دا چوو بۆ شام بۆ فریاکەوتنی خەلیفە موعتقی لە ستمەی حەمدانیەکان لە حەلەب و خۆسەپێنی

---

١ــ عبدالله البلوي: سيرة أحمد بن طولون ص ٢٨١.

سەرکردە تورکەکان لە بەغداد هەمان هەوڵیدا، لە باکوری فوراتدا گەیشتە لای خەلیفەو لە ئەسپەکەی بە شمشێرو شمەکەکانیەوە وە شێوەی خزمەتگوزار دابەزی و چەند جارێك زەوی ماچکرد ئینجا چووەیە پێشەوەو دەستی ماچکردو داوای لێکرد لەگەڵیدا بچێت بۆ میسر، بەلاّم خەلیفە لە دواجاردا ڕازی نەبوو پایتەخت و پێگەی خۆی وخێزانەکەی بەجێبهێلێت، بۆیە بەرپەرچی ئەو داوایایەی دایەوەو ئەخشیدیش گەڕایەوە بۆ میسر لەکاتێدا خەلیفە گەڕایەوە بۆ بەغداد، بێگومان ئەخشید لە ڕاکێشانی خەلیفەی عەباسیدا بۆ میسر دەیویسیت ئەو دەوڵەتەی بە هێز بکات، کە میسر دایمەزراند[1].

هەروەها دەوترێت مەلیك ناسر یوسفی بەرپرسی حەلەب و دیمەشق لە سەرەتاکانی ساڵی ٦٥٨ك دا بیری کردۆتەوە لە زیندوکردنەوەی خیلافەتی عەبباسی لە ڕێگای عیسای کوڕی مەهنایشەوە دەیزانی میسری عەرەب لە دەوروبەری ڕۆژهەلاّت و باکوری سەرسنوری عێراق سەرکردەیەکی عەبباسی بەناوی ئەبولعەباس ئەحمەد دەیەوێت بەرەو دیمەشق بێت تا ئەوەی هەواڵی بۆ ناردبوو، بەلاّم ناسر بە هاتنی تەتەرەکان بەرەو ڕووبوویەوە، بۆیەدەستبەرداری ئەبولعەباس بوو، میری عەباسی بۆ جاری دووەم گەڕایەوە بۆ لای عیسای کوڕی مەهنا، پاشان سوڵتان قوتز لە ساڵی٦٥٨ك دابیری کردەوە لە گێڕانەوەی خیلافەت بۆ بەغداد، بەبەڵگەی ئەوەی دوای جەنگی عەینجالوت میر ئەبولعەباس ئەحمەدی بانگێشت کرد بۆ دیمەشق و بەیعەتی خیلافەتی پێدا بەمیر عیسای کوڕی مەهنای ووت: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ میسر بینێرە بۆ لای ئێمە تاپشت بەخوا بیگێڕنەوە، بەلاّم سوڵتان قوتز پێش ئەوەی ئامانجەکەی بەدیبهێنێت کوژراو ئەبولعەباسیش چوو بۆ سەر سنورە فوراتیەکەی لەگەڵ ئەو عەرەب و شوێنکەوتوانەی لەگەڵیدا بوو توانی چەند شارێکی ئەوێ بگرێ وەك عانەو حەدیسیەو ئەنبار و بەسەر دەستەیەککی سوپای تەتەرەکاندا سەربەکەوێت لەمانەوە دەبینین پاشایانی مسوڵمان و پێش بیبریس

---

١ـ محمد مصطفى زيادة: ملاحظات في التأريخ دولةالممالك مجلة كليةالأداب، جامعة القاهرة المجلد الرابع سنة ١٩٣٦

بیستویانە خیلافەتی عەبباسی ببوژێنەوە ئەو خواستەش بەردەوام بوو تا ئەوەی بیبریسی بوندوقداری دەسەلاتی میسری گرتە دەست و کەوتە دەرکردنی پرۆژەکە پەیرەو کردنی بۆیە ناردی بەدوای ئەبو لعاببباسدا کە هێشتا لەعیراقدا سەرقاڵی هەوڵی خۆی بوو ئەبو لعباسیش بەرەو قاهیرە چوو بەڵام ئەوب لعبباس بەختی نەیکرد چونکە یەکێکی تر لەنەوەکانی بەنەماڵەی عەباسی بەناوی ئەبولقاسم ئەحمەد زووتر گەیشتە لای بیبرس، بۆیە ئەبو لعباس پێی باشبوو بگەڕێتەوە بۆ شامەو چوو بۆ حەلەب و میسری ئەوێ کە دژ بە بیبرس ڕاپەڕیبوو ناوی ئەمسەرین ئەقوس بەلی عەزیزی بوو.[١] بەیعەتی پێدا و نازناوی حاکم بیئەمر یللاهی لێنا، پاشان حەوت سەد سواری تورکمانی خستە خزمەت، خەلیفەیش بەو سوارانەوە چوو بەروشاری عانە لەسەر سنووری عێراقی تاجارێکیتر لەگەڵ تەتەرەکاندا پێکدا بدات.

ئەبو لقاسم ئەحمەدیش کە بۆی ڕێکەوتبوو بگاتە قاهیرە، سوڵتان بیبرس لە یۆلیۆی ساڵی ١٢١٦ز/ ڕەجەبی ساڵی ٦٥٩ك) لەگەڵ زانایان و ناوداران و پیاو ماقوڵ و بانگبێژو نانەت جولەکەکان بەتەوراتەکەیانەوە مەسیحیەکانیش بە ئینجیلەکانیانەوە چوونە دەرەوەی پایەتەخت بۆ پێشوازی لێ کردنی، ئەو ڕۆژە سوڵتان لە ڕێزگرتنی خەلیفەدا زۆر چوو لەقەڵای شاخ دایبەزاند، پاش چەند ڕۆژێك لە ١٣ی ڕەجەبدا سوڵتان لە دیوانی ەورە لەقەڵادا کۆڕێکی گشتی بەری و دادوەرو زانایان و هەموو پیاوانی دەوڵەت و گەورە بازرگان و پیاو ماقوڵان تیایدا ئامادەبوون شەیخولئیسلام عیزەدینی کوڕی عەبدو سەلامیش لەوێ ئامادەبوو، هەموو لەخزمەت پێشەوای عەبباسیدا ئامادەبوون و سوڵتان وەك ڕێز لێگرتنی لەبەردەمیدا دانیشت، پاشان کۆمەڵێك لەو عەرەبو بەغدادیانەی لەگەڵ میسری عەباسدا لەبەغدادەوە هاتبوون بانگکرد ئەوانیش لەبەردەم ئەو کۆمەڵەدا شایەتیان دا کە ئەبو لقاسم ئەحمەد کوڕی خەلیفە ڤاهری ئەمیری باوەڕدارانە، هەروەك ئەودادوەرانەی لەوێ

---

١ ـ سەرکەئقەکەی ئەقوش بەرلی زۆری نەخایاند و سوپا میسریەکان توانیان لەساڵی ٦٦٠ك لەحەلەب دایمرکێننەوەو چوویە ژێب گوێڕایەڵی بیبرس، بەڵام بیبرس خێرا هەڵوێستی لەڕوویدا گۆڕاو لەساڵی ٦٦٠ك دا کوشتی، بڕوانە: (أبو الفداء: المختصر في أخبار البشر ج ٣ ص ٢١٧ـ ٢٢٣-٢٢٠).

بوون گوێبیستی بوون، ئەوکات دادوەری دادوەران تا جودینی کوڕی بیتولئەعەز وەرگرتنی شایەتیەکانی ڕاگەیاند بڕیاری ڕاستیتێ چونە سەر ڕەگەزی شەریفی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی دا ئینجا هەستاو بەیعەی خیلافەتی بە ئەبولقاسم دا، پاشان سولّتان بیبرس هەستاو بەیعەتی پێدا لەیەر ئیشکردن بە قورئان و سوننەت و فرمانکردن بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپەو جیهاد کردن لە ڕێی خوداوداو وەرگرتنی ماڵو سامانی خوابە حەقی خۆی و جێبەجێکردنی لە شوێنی پێویستی خۆیدا، پاشان دوای سولّتان شەیخ عیزەدینی کوڕی عەبدوسەلام[1] و هەموو ئەو سەرکردەوە دادوەرو فیقهناس و پیاوانەی دەوڵەت، کە ئامادەبوون بەیعەتیان پێداو نازناوی خەلیفە موستەنسیر بیلاهی لێنرا، کە نازناوی خەلیفە موستەنسیری برای بوو(١٢٢٦ ـ ١٢٤٢)ز کە خوێندنگەی موستەنسیریەی لەبەغداد بینات نا.[2] کاتێکیش بەیعەتدانەکە تەواو بوو، خەلیفە موستەنسیر وڵاتی ئیسلامی و ئەو ناوچانەیشی بۆی زیاد دەبن، و ئەوولاتانەی بێباوەڕان، کە لەسەر دەستی فەتح دەبن دایەوە دەس سولّتان بیبرس، پاشان هەموو ئەوانەی ئامادەبوون بەجیاوازی چینەکانیانەوە بەیعەتیان بەخەلیفەدا.

پاشان لەهەمان ڕۆژدا سولّتان بیبرس نامەی بۆ پاشایان و جێگیرانی هەموو ناوچەکان نووسی تا لەلایەن خۆیانەوە بەیعەت وەربگرن بۆ خەلیفە موستەنسیر بیهی عەبباسی لەسەر مینبەرەکان نزا بۆ ئەو بکرێت دواتر نزا بۆ سولّتان بکرێت و بەناوی هەردوکیانەوە دراو لێبدرێت.

لەگەڵ ئەوەی سولّتان بیبرس سوور بوو لەسەر ئەوەی ڕەگەزی خەلیفەی نوێ لە کۆڕی گشتیدا بچەسپێنن، بەڵام لەچەن دەربڕینێکی هەندێ لەمێژوونووسانە وە تێدەگەین، کە جۆرەگومانیك هەیە لە خەلیفەی نوێ لەسەر عەبباسیەکان بێت، ئەبو لفیدا لە مێژووەکەیدا لەژێر ناونیشانی (ذكر مبايعة شخص بالخلافة) (باسی

---

١ ـ لەچەند سەرچاوەیەکدا هاتووە کە یەکەم کەس کەبەیعەتی بە خەلیفە موستەنسیردا شێخ عیزەدینی کوڕی عەبدوسەلامە بوو، پاشان سولّتان بەیعەتی پێدا (السيوطي: حسن المحاضرة ص ٤٤، السبكي: ج ٥ ص ٨٤).

٢ ـ أبو شامة: الذيل على الروضتين ص ٢١٣، المقريزي، السلوك ج ١ ص ٤٥١.

بەیعەتدانی خیفەت بەکەسێك) دەیهێنێ کە لە ڕەجەبی ساڵی (٦٥٩ك دا. (کۆمەڵێك لەعەبەرەکان بەکەسێ:ی ڕەنگڕەشی ناسراو بە ئەحمەد وە هاتن بۆ میسر و بانگەشەی ئەوەیان کرد کوڕی پێشەوا (نصر بیلای کوڕی پێشەوا ناسرە، بەمە مامی موستەعسەم دەکات...)[1] هەروەها موفەزەلی کوڕی ئەبو لفەزائیل بەناوی (المستنصر الأسود) (موستەنسیری ڕەش) ناوی ئەوبو خەلیفە دەبات)[2] لەکاتێکدا ئەوبو شامە مێژوو نوسی هاوسەردەمەو لەساڵی ٦٦٥کۆچیدا مردووە بەدەربڕینێکی ئەو پەڕی گومان و گاڵتەجاریەوە دەڵێت: (لە نۆزدەی ڕەجەبدا لە خوێندنگەی عادلیە نامەیەك خوێندرایەوە، کە لە میسر و لەلایەن سوڵتان مەلیك زاهیر بیبرسەوە هاتبوو و ئەوەی لەخۆ دەگرت، کە ئەبو لقاسم ئەحمەدی کوڕی ڤاهیر موحەممەدی... سەرکردەی دوو ڕووەکان هاتووە بۆلایان).[3] وا دەر دوکەوێت ئەو گومانە دزەی کردبێتە ناو خەڵکی قاهیرو ناوچەکانی تر، بەو بەڵگەیەی ناز ناوی زراتینی یان زرابینی یان لە وستەنسیر دەنا کە نازناوێ:ی نامۆیەو ئەبولفیدا دەیداتە پاڵ چەمکی زربودە کە لە میسر بۆ کەسی ڕەش پێست بەکاردەهات.

سەبارەت بەڕەگەزی خەلیفەی نوێ هەرچۆنێك بێت بێگومان سوڵتان بیبرس پێویستیەکی تەواوی بەوە هەبوو دەسەڵاتی خۆی بەو جۆرە دیارە ئایینیە توندو تۆڵ بکات کە لەشێوەی زیندو کردنەوەی خیلافەتی عەبباسیدا خستیە ڕوو و چاوی داخست لەوەی سەبارەت بەخەلیفەو ڕەگەزیەوە دەوترێت. هەموو دەقەکان ئەو دەقانەی لەسەرچاوە هاو سەردەمەکانەوە هاتوون دەکەنە بەڵگەی ئەوەی سوڵتان بیبرس ئامادەبوو بەماڵ و سازی سوپایە هەموو جەنگی یارمەتی خیلافەت بدات تا

---

١ ـ أبو الفداء: المختصر في أخبار البشر ج ٤ ص ٨، تێبینی دەکرێت ئەو لفیداء لە ساڵی ٦٧٢ك لە دایکبووە واتە سیانزە ساڵ دوای هاتنی موستەنسیر بۆ قاهیرە، بۆیە گومانی لەو جۆرەی لە کەسە هاوسەردەمیەکانی و کەسەبەتەمەنەکان بیستووە.

٢ ـ إبن أبي الفضائل: النهج السدي ص ٥.

٣ ـ النسخة الخطية من كتاب (أبو شامة: الذيل على الروضتين، ورقة ٢٣٠) بمكتبة البلدية الأسكندرية و دار الكتب المصرية بالقاهرة) ئەو نوسخە چاپکراوەی عیزەت عەتاری حوسەینی لاپەڕە ٢١٣ دا چاپی کردووە وشەی شەمیری دوو ڕووەکانی گۆڕیوە بۆ ئەمیری باوەڕداران.

لەبەغداد بگێڕدێتەوەو دابمەزرێتەوە. بیبرس کەوتە ئامادەسازی سوپا بەهەموو شمەك و پێویستەکانی سوپاو چەك و سامان تا بەغداد لەدەست تەتەرەکان بیسێنتەوە و خیلافەتی بۆ بگێڕێتەوە. دەڵێن بڕی ئەو پارەی لەو پرۆژەیەدا بەخشی لەیەك ملیۆن دینار کەمتر نەبوو. بەڵگەش بۆ گرنگی دانی بیبرس بەخیلافەت و دامەزراندنی ئەوەیە، کە خۆی لەگەڵ خەلیفەدا چوو بۆ دیمەشق و لە ذي لقعدەی ساڵی ٦٥٩ك / ١٢٦١ز.دت گەیشتە ئەوێ و دەیویست چەندێکی تری سەربازی شام بۆ میسر زیاد بکات تا ئەوەی ژمارەی سوپای خەلیفە بوو بە دەهەزار سوار، بەڵام یەکێك لەسەر کردەکانی وسڵ گومانی سوڵالت دروستکردلەوکاتەی لە دیمەشق بوو و پێی ووت: ئەگەر خەلیفە لەبەغداد دەسەڵاتی بچەسپێت لەگەڵ تۆدا ڕکەبەری دەکات و لەمیسر دەرت دەکات) بۆیە ترس بیبرسی داگرت و هەڵوێستی خۆی لەخەلیفە گۆڕی و تەنها سێ سەد سواری بۆ ئامادەکرد وەك ئەوەی بیەوێت، بەرەو قورپەسەری ببات. خەلیفەش بەو ژمارەکەمەی سەربازەوە بەرەو عیراق چوو لەڕێگە دا چوار سەد سواری عەرەب لە عیراق لە خەفاجە و عەبادە دایتنە پاڵی، ئەو یەکەمجار پوناى بۆلای ئەوان بردبوو، هەروەك شەست مەملوکی موصڵیش دایانە پاڵی وسی سواری سەربازگە حەمایش هاتنە ریزەکانیانەوە و، خەلیفە موستەنسیریش بەو سوپاناهاوایەوە بەرەو سەر سنوری عێراقی چوو، لەوێ لەشوێنێك لەسەر ڕووباری فورات، کە بە مەشهەد[1] ی عەلی یان مەقامی عەلی ناسراوە لەلیوای دەیلەمی ئێستا، موستەنسیر یەرەو ڕووی ئەبو لعەبباسی ئەحمەدی ڕەبەری حاکم بیئەمر یللاه) خیلافەتی عەبباسی، لەوبارەیەوە ئەبوو شامە دەڵێت: حاکم سەری دانەنواند بۆ موستەنسیر بەهۆی ئەوەی، کە لەو بچووکترەو ئەو گەورەترە (واتە موستەنسیر) بەوە ڕێککەوتن و سوپاس بۆخوا ناکۆکی نەما).[2] پاشا پێکەوە چوون بۆ شاری عانە پاشان حەدیثە[1] بەرەو شاری

---

١ ـ مەشهەد عەلی شارێکە لەسەر ڕووباری فورات لەپاڵ شاری عانە لەلیوای دەیەم کە پێچەوانەی شاری ئەجەفەکە مەزارگەی ئیمامی عەلی کوڕی ئەوبوو تالیبی لێیە.

٢ ـ أبو شامة: الذيل على الروضتين ص ٢١٥.

(میت) دەرچوون، کاتێك خەلیفە گەیشتە میت خەڵکەکەی دەرگایان لێ داخست، ئەویش گەمارۆی دا تا لە کۆتایی ژیلحەجەی ساڵی ٦٥٩ك/ ئۆکتۆبەری ١٢٦١ز)دا فەتحیکرد و دواتر لەوێوە بەڕێکەوت و لەنزیك ئەنبار سەنگەریگرت. لێرەدا سوپاکانی تەتار بە سەرکردایەتی قورابغا و بەهادر لە ٢ موحەرەمی ساڵی ٦٦٠کۆچی لەگەڵ سوپاکانی خەلیفەدا پێککەیشتن و جەنگێکی ناهاوتا لەنێوان هەردوولا ڕوویدا و کۆتاییەکەی بەوەهات کە تەتەرەکان دایان بەسەر سەربازگەی عەببایەکاندا و زۆربەیان لێ کوشتن و تەنها ئەمیر ئەبو لعەبباس و چەند سەرکردەیەکی تر بەنزیکەی شەنجا سوارەوە ڕزگاریان بوو. خەلیفە ئەبولقاسمیش هەواڵی نەما دەڵێن لەجەنگەکەدا کوژراوە، دەشڵێن بەبریندار لەگەڵ دەستەیەك لەعەرەبەکاندا ڕزگاری بووەو لای ئەوان مردووە.

هەرچۆنێك بێت، ئەو ڕووداوانە دەرفەتی بۆ سەرکردە ئەبولعاببیاس ڕەخساند و سوڵتان بیبرس هەواڵی بۆناردو تا بێت بۆ قاهیرە و ئەویش لەمارسی ساڵی ١٢٦٢ز/ ١٧ ڕەبیعوثانی ساڵ ٦٦٠ك / دا گەیشتە قاهیرە و بیبرس ئاهەنگی بۆ گێڕاو لە (البرج الكبير) لەقەلای (الجبل) دایبەزاند وەك چۆن بۆ موستنسیر بیلاە وای کرد، هەموو سەرچاوەکانی ئەوە دەڵێن، کە بیبرس جۆرە گۆڕانێکی نواند بەرامبەر بەخیلافەتی عەبباسی، کە پوختەکەی ئەوەبوو دەبێت خیلافەتی عەبباسی لەمیسردا بێت و دەوڵەتی مەملوکی سود لە بوونی لەقاهیرەدا وەربگرێت و بەدوور بێت لەمەترسی دمەزراندنی لەبەغداد کە لەقاهیرەوە دوورە، ئەویش بەڵگەیە لەسەر ئەو گۆڕانە ئەوەیە، کە کۆمەڵێك لەبەغدادیەکان کە مەملوکی خەلیفە موستەعسام بوون و بەسەکردایەتی میر سەیفەدین سەلاری[٢] پێشڕەو یان لەدەست تەتارەکان

---

١ ـ چەند شوێنێك هەرەکە ئەوناوەیەان هەیە، حەدیسەی موسڵ لەسەر ڕووباری دیجلە هەیە، حەدیسە ی فورات لە دووری چەند فەرسەخێکی ئەنبار هەیە کەمەبەست پێی ئەمەیە، حەدیسەیەکی تر هەیە لە دیمەشق (یاقوت: معجم البلدان ج١ ص ٢١٢.

٢ ـ بنەڕەتی ئەم مەملوکە لە وڵاتی قیشاقەو خەلیفە زاهیری عەبباس کڕی، پاشان چوویە خزمەت موسەعسەم و پەی بەرزبوویەوە تا بوو بە والی واسیت و کوفە حیللە پاش ئەوەی

ڕایانکرد بۆ حیجاز پاش گەیشتنی ئەبو لعەبباس ئەحمەد بۆ قاهیرە بەتەنها مانگێك گەیشتە قاهیرە، چونیشیان بۆ میسر لەسەر داواو هەوڵی بیبرس بوو، هەروەك کەمێك دوای ئەوان کۆمەڵێك لە گەورەکانی خێڵەکانی عەبادەو خەفاجە لەعەرەبەکان عێراق چوونە ئەوێ.[1] بیبرس دوای ئەوە هەوڵیدا بەیعەتی خیلافەت بە ئەبولعەبباس بدات، بۆیە لە ٨ی موحەڕەمی ساڵی ٦٦١ك. دا کۆڕێکی گشتی لەهەیوانی گەورەی قەڵای شاخدا بۆ بەسترا وەك چۆن پێشتر بۆ موسنسیر کرا، ئەبو لعەبباس هات و پاش ئەوەی ڕەگەزی لای تاجودینی کوڕی بیتولئەعەزی دادوەری دادوەران چەسپا، ڕەگەزەکەی بۆ خەڵك خوێندرایەوە و نازناوی حاکم بیئەمر یلاهی لێنرا و سوڵتانیش بەیعەتی پێ دا لەسەر قورئان سونەتی پێغەمبەرەکەی ئیش بکات کاتێك بەیعەت پێدانەکە تەواو بوو، خەلیفە ڕوویکردە سوڵتان و کاروباری خەڵك وڵاتی پێسپارد و نازناوی(قەسیمونەمیرلموئمنین)ی لێنا[2] و خەڵکیش بە جیاوازی چینەکانیانەوە بەیعەتیان بەخەلیفەی نوێ دەدا و لەسەر مینبەرەکانی وتاری دەخوێندرایەوە.

بەوجۆرە بۆ جاری دووەم خیلافەتی عەبباسی لەقاهیرە زیندووکرایەوە، بەڵام بیبرس بیری نەکردەوە لەوەی ئەم خەیفەی دووەمە ئامادەسازی پێ بکات بۆ گێڕانەوەی بەغداد و دامەزراندنی خیلافەتی عەبباسی لەبەغداد، بەڵکوو بڕیاریدا

---

بەغداد کەوتە دەست هۆلاکۆ، پەنای بر بۆ حیجاز، پاشان لەسەر داوای بیبرس چوو بۆ میسر و خۆی و هاو دەمە بەغدادیەکانی لەنیوەی ڕەجەبی ساڵی ٦٦٠ کۆچیدا چوونە ناوی بیبرس ڕێزی لێیان گرت و میرایەتی پەنجایی لەشام و نیوەی شاری نابلوسی دایە دەس میر سەلار پاشان بوو بەرپرسی تەپڵخانە لەمیسر (المقریزي: السلول ج١ ص ٤٦٨).

١ ـ بنکەی ئەو هۆزانە لەهیت و ئەنبار

٢ ـ بیبرس یەکەم کەس بوو بەیەکەم کەس دادەنرێ کە خیلافەت ئەو نازناوەی پێ دابێت چونکە پاشایانی پێشو ی موسڵمانان نازناوێکیان وەردەگرت کە پلەو پایەی لەو نازناوە کەمتر بوو وەك مەولاو ئەمیر موئمنین یان خادم ئەمیر موئمنین ئەگەر زۆر نازناوەکەی گەورە بکرایە نازناوی وەلید ئەمیر موئمنین پێ دەدرا پاشان ساحیب و ئەمیر موئمنین پاشان خەلیفە ئەمیر موئمنین کە ئەمە بەرزترین نازناوی پاشاایانی ئەیوبیەکان بوو نازناوە بیبرسیش قەیوم ئەمیر موئمنین بوو کە زۆر لە نازناوانە بەرزتر بووە (السیوطي: حسن المحاضرة ج ٢ ص ٦٦).

لەقاهیرەدا بێت لەنزیك خۆی و لەبەرچاوی خۆیدا بێت، سولتان بەمەندەویست دەسەلاتێکی ئایینی یاسیایی لەپاڵ دەسەلاتەکەی خۆی لەپایەتەختەکەیدا هەبێت، بەلکوو دەیویست خیلافەت بەلگەیەك بێت بۆ دەولەتی مەملوکی لەبەشەکانیو ئەو پاراستنە ڕۆحیەی کە پێویستی بوو. بەلگەش بۆ هەموو ئەمانە ئەوەیە کە سولتان ئەمجارەیان فرمانی نەکرد تا لەسەر دراو ناوی خەلیفە بنووسن وەك ئەوەی پێشتر بۆ مونتەسری کردو لە بورجێکی قەلاکەدا داینیشاندو تەنها نزای ناو وتاری بۆ هێشتەوە لەسەر ئەم بنەمایە خیلافەتی عەباسی تەنها دەستکەوتێکی ساختەی لە زیندوو کردنەوەیدا بەدەست خست و لەو کاتەوە خەلیفەکان لەبارێکی سەر شۆڕیدا بوون لەبازنە بەرتەسکەکاندا ئیشیان دەکرد و لە ئاهەنگەکانی دەسەلات و جێگریەتیدا ئامادە بوون و کۆڕەکانی سولتانیان بۆ وەفد و بالیۆزەکان دەڕازاندەوە خیلافەت زۆر بەکەمی دەستی وەردەدایە کاروباری دەولەتی مەملوکی سولتانە مەملوکیەکانیش هیچ ڕۆژێك لیان دلنیا نەبوون، بەلکو خەلیفەکانیان بەدیلی دەهێشتەوە لەچەند بینایەکدا لەبورجەکانی قەلایاندا (مانظر الکبش)دا تایبەت بۆ ئەوانیان بنیاتنابوون ئەوانیش کەسودیان لەزیندووکردنەوەی بەینی سولتانە مەملوکیەکان بینی بوو کەلە قاهیرە پایتەختیان بوو لەو کاتەوە سولتانە مەملوکیەکان فەتحی عوسمانی لەسالی ٥١٧ زدا پایەکی بەسەر بەرزیان بەسەر پاشایانی جیهانی ئیسلامی بۆ خۆیان دەسەپاند و ئامادە نەبوون نازناوی سولتانیان لێ بنێن چونکە تەنها ئەوان مافی ئەوەیان هەبوو بەو پێیەی پارێزەری خیلافەت بوون و بەیعەتیان پێ درا بوو لەوبارەیەوە ئیبن شاهین الظاهری[1] دەلێت

١ ـ ئیبن شاهین زبدە کشف الممالیك ٨٩ تێبینی دەکرێت چەمکی سولتان سەرەتا لەنێوەندەکانی ئاسیا دەرکەوتوەو غەزنەوی و سەلجوقیەکان چەند تورکێکی تر وەك هێمایەك بۆ دەسەلاتی کاتی بەککار هێناوە پاشان دوای ئەوە گوزرایەوە بۆ میسر ڕۆژانی ئەیوبیەکاندا جێ سەر سوڕمان ئەوەیە کە صلاح الدین لەگەل سەرکەوتنە گەورەو دیارەکانیدا نازناوی سولتانی وەرنەگرتووە بەپێ ی ئەو بەلگەنامانەی کە لەبەر دەستماندان هەرچەندە وادیارە لسەر زمانی خەلکی ئەو نازناوەی لێ نراوە نازناوی سولتان الاسلام والمسلمین لا نراوە پاش مردنی صلاح الدین بەکارهێنانی ئەو ناوە لەنیو جێگرەکانیدا بلاو بیەوە تا ئەوەی هەموو

نازناوی سوڵتان تەنها لەبەر پرسی میسر دەنگدرا تا خوا سەری بخات چونکە ئەو ئێستا بالاترین و شەرەفمەندترینی پاشایانە بۆ پلەی گەورەی یەکەمین و کۆتایەکان لە ئەمیری باوەڕدارانیشەوە شەرەفمەند بووە بەوەی شێوە شەرعی بەپێ ی مەزهەبی چوار پێشەواکە دەسەلاتی داوەتە دەست[١]

قاهیرەیش لە ئەنجامی ئەمەدا ناوبانگێکی ئایینی و زانستی بەرفراوانی هەبوو و بوویەمەڵبەندی خیلافەتی عەباسی، لەوبارەیەوە جەلالەدینی سیوتی(ج٢می٦٦)دەڵێت: (ئیمان و زانست لەگەڵ خیلافەتدان لەهەر کوێدا بێت، جا کاتێك میسر بوو بە دارولخیلافە شان و شکۆی پەیدا کرد و دروشمەکانی ئیسلام

---

سەرکردەکانی ئەیوبی بنەماڵەی ئەیبوبی گرتەوە تا ئەووەی سوڵتانە مەمولوکیەکا ئەو ناز ناوەیان لەسەر خۆیان کورتکردەوە بۆ ئەوان جگە لەخۆیان بروانە

١ - مەبەستی ئیبن شاهین بەچوار پێشەواکە داد وەرانی چوار مەزهەبی سوننەیە لەسەر دەمی فاتیمی داد وەری لەمیسر لەسەر مەزهەبی ئیسماعیلی تا وەزیر ئەبو عەلی ئەحمەدی کوڕی ئەفزەل لە کۆتایەکانی سەر دەمی فاتمیدا دادوەری لەدەسەلات دانا هەریەکە بەمەزهەبی خۆی حوکمی دەکرد دادوەری شافعی دادوەری مالیکی دادوەری ئیسماعیلی و دادوەری ئیمامی بەم هەوڵەی ویستی سنور بۆ قەئەم ڕەوی مەزهەبی ئیسماعیلی دابنێت لەسەردەمی ئەیوبیشدا تەنها دادوەری شافعی مایەوەو بەو جۆرە بەردەوام بوو تا سوڵتان زاهیر بیبریس هات گۆڕانێکی ڕیشەیی لەنیزامیدادوەریدا لەساڵی ٦٦٣ کۆچی و ١٢٦٥ی ز ئەنجام داو ئەییویست دادوەری شافعی بەتەنها هەموو دادوەری بەدەست بهێنێت چونکە ئەمە تورە کردن و کەنار خستنی مەزهەبەکانی تری لێ کەوتەوە بۆیە دادوەر دادوەی خستە دەست چوار دادوەر کە هەریەکەو سەربەمەزهەبێکە چوار مەزهەبەکە بوون مۆەتیشی پێ دان تا لەبەشەکانی ولاتدا نوێنەر بۆخۆیان دابنێن بەمەرجێك د

اد وەرانی شاعی سەرپەرشتی هەتتیوان و ئاوقاف و کاروبارەکانی بەیتولمالی لەدەستدا بمێنێتەوە بەو جۆرە داد وەرانی شافعی پلەی لەانی تر بەرزتر بوو پاشان حنەفی ئینجا مالکی دوا جار حەنبەلی دەهات لەسەر دەمی سوڵتان ناسر محمدی کوڕی قلاوند مماالیکی دوای شافعی دەهات و حەنەفی کەوتە دوای مالیکی السبکي طبقات الشافعي ج ٥ ص ١٣٢ / ١٣٦، النجوم الزاهرة ج ٧ ص ١٢١، ابن شاهين زبدة كشف الممالیك ص ٩٢، المقريزي السلوك ج ١ ص ٥٣٩ / ٥٤٠، سعيد عاشور دولة الممالیك البحرية ص ١٥٢، محمد المناوي الوزارة والوزراء في عصر الفاتمي ص ١٦٩، المقريزي الخطط ص ٢٠٦، رحلة ابن بطوطة ج ١ ص ٢٢٥.

تیایدا زۆر بوون و بوو بە نشینگەی زانایان و جێنیازی پیاوانی خاوەن فەزڵ).
وێڕای ناوبانگی ئایینی و زانستی قاهیرە، لێرەدا ناوبانگیە بازرگانیەکەیشی هەبوو کە وای لە هۆلاکۆ کرد بوو لە نامەیەکیدا ناوی بنێت(کروان سرای) بەهۆی ئەوەی خیلافەت چوویە ئەویّ بوو بە مەڵبەندێك بۆ بازرگانیەکی فراوانی چالاك وێڕای چالاکیە کۆنەکەی خۆی، خەلیفەی عەباسی دووەم ئەبولعەبباس ئەحمەدیش لە گومانی هەندیّ لە مێژوو نووسان لە ڕەگەز و ڕەچەڵەکی ڕزگاری نەبوو وەك چۆن پێشتر گومانیان هەبوو لە ڕەچەڵەکی خەلیفە موستەنسیر، جا لە مێژووی ئەبولفیدا لە ساڵی ٦٦١ ك.دا دەستەواژەیەك لە بارەی خەلیفە حاکم هاتووە کە گومان دەبەخشێت و دەڵێت: (لە کۆتاییەکانی ذیلحیجەی ئەو ساڵەدا سوڵتان مەلیك زاهر کۆڕێکی گشتی بەست وکەسێکی هێنا کە لە ساڵی ٦٥٩ ك.دا لە نەوەی بەنی عەباس بوو و بە ئەحمەدی ناو دەبرا و هاتبوو بۆ میسر، پاش چەسپانی ڕەچەڵەکی بەیعەتی خیلافەتی پێدا و نازناوی ئەو ئەحمەدی نا حاکم بیئەریللائەمیرولموئمینین).

باس و خواسی خیلافەتی عەبباسی بە بەیعەتپێدانی حاکم بیئەمریللا لە ساڵی ٦٦١ ك /١٢٦٣ ز.دا کۆتایی پیّ نەهات و سیّ ساڵ لەو ڕوداووە تێنەپەڕی تا دوو کەس هاتن بۆ لای سوڵتان بیبرس کاتێك لەساڵی٦٦٤ ك/١٢٦٦ ز. لە دیمەشق بوو و یەکێکیان بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە موبارەکی کوڕی خەلیفە موستەعسەمە، دەیویست بەوە بڵێت کە ئەو لە حاکم بیئەمریللا لە خیلافەت شیاوترە، دووەمیش_کە ڕەش پێستێك بوو_ دەیوت کە لە نەوەی خەلیفەکانە، سوڵتان بۆی دەرکەوت کە هەردووکیان درۆ دەکەن، بۆیە هەردووکیانی برد بۆ میسر، بارەکە لەوەدا نەوەستا، بەڵکوو لە هەمان ساڵدا (٦٦٤ ك) عەلی کوڕی خەلیفە موستەعسەم کە لای تەتارەکان دیل بوو هات بۆ لای سوڵتان.

مێژوو نووسان قسەیەکی وا لەسەر ئەو ڕووداوانە ناکەن، ئەمەیش ئەوەمان پیّ دەڵێت ئەو گومانانەی لەوکاتەدا لەسەر ڕەچەڵەکی ئەو دوو خەلیفەیە هەبوو، ئەوەیان خستبووە دەروونی هەندیّ کەسەوە کە دەتوانن ڕۆڵی موستەنسیر و حاکم

ببینن یان لەوانەیە سولّتان بیبرس و ویستبێتی لەپشت ئەو کەسانەوە بە هەڕەشەی لابردن و بەیعەتدان بە خەلیفەیەکی تر هەژموونی خۆی بەسەر خەلیفە حاکمدا زاڵ بکات هەرکات خەلیفە بیەوێت دەستوەرداتە کاروباری دەوڵەتەوە یان پێدەچێت ویستبێتی منداڵانی بنەماڵەی عەبباسی لە میسر کۆ بکاتەوە _ئەگەر ڕاست بێت ئەندامانی بنەماڵی عەباسی بن_تا خۆی دوور بگرێت لە مەترسی پەنابردنی هەندێك لەوانە بۆ لای پاشایانی تری موسوڵمانان و ئەوانیش بیان کەن بە خەلیفە، وەك چۆن ئەقوش برلی لە حەلەب پێشتر ئەوەی لەگەڵ خەلیفە حاکمدا ئەنجامدا.

ئەوەی جێی گرنگییە ئەوەیە کە بیبرس سەرکەوتوو بوو لە دامەزراندنەوەی خیلافەتی عەبباسی لە قاهیرەدا، بەوەیش ئەوەی دایە پاڵ کۆمەڵە هۆکارە یاریدەدەرەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی مەملوکی، ئەمە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چەند دەوڵەت و کەسایەتیەکی تر هەوڵیان داوە دوای نەمانی خیلافەتی عەبباسی لە بەغداد لە ساڵی ١٢٥٨ ز.دا خیلافەت بە میرات بگرن، مەبەستمان بەوەیش خیلافەتی حەفسیە لە تونس.

حەفسیەکان لقێك بوون لە موەحیدەکان و دەدرێنەوە پاڵ شێخ ئەبو حەفص یەحیای کوڕی عومەری هنتانی شێخی هۆزی هنتانەکە تیرەیەکی مەسمودە بوون کە دەوڵەتی موەحیدەکان لەسەر شانی ئەوان ڕاوەستا بوو، ئەو شێخە حەفسیە لەو کەسانە بوو کە بانگەوازیان بۆ مەهدی کوڕی تومرت دەکرد و لەو گەورە کەسانە بوو کە پاڵپشتی سولّتانی موەحیدی بوون لە مەغریب و ئەندەلوسدا، ئەو پەیوەندیە بە هاوسەرگیری عەبدولواحیدی کوڕی و کچی خەلیفە مەنسوری موەحیدی بەهێزتر بوو لەساڵی ٦٠١ك/١٢٠٦ز.دا بوو بە فەرمانڕەوای وڵاتی تونس، کاتێك موەحیدین لە ئەندەلووس لەبەردەم سوپا خاچپەرستیە هاوپەیمانەکاندا لە جەنگی(العقاب) ساڵی ٦٠٩ك/١٢١٢ز شکستیان خوارد و قەڵەمڕەویان لە مەغریب و ئەندەلوس دوای ئەو کارەساتە داڕما، میر ئەبو زەکەریای کوڕی عەبدولواحیدی حەفسی لە ساڵی ٦٣٦ك/١٢٢٩ز.دا سەربەخۆیی خۆی بە فەرمانڕەوایی ئەفریقیا لە

خیلافەتی بەنی عەبدولموئمینین لە مەراکیش ڕاگەیاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا تەنها نازناوی ئەمیری لەخۆی نا تا ئاستێك سەرکۆنەی ئەو شاعیرەی کرد بە ئەمیرولموئمینین ناوی برد.[1] ئەو دەستەڵاتە حەفسیە هێندەی نەبرد لەسەردەمی ئەبووعەبدوڵلا موحەممەدی کوڕیدا بوو بە خیلافەت و نازناوی موستەنسیر بیللاە ئەمیرولموئمینینی لە خۆی نا.[2] (٦٤٧-٦٧٥ك/١٢٤٩_١٢٧٧ز)، حەفسیەکان لە ڕاگەیاندنی خیلافەتی نوێیاندا پشتیان بەست بە بنەڕەتە پێویستە شەرعیەکان لەویارەوە، وەك بنەڕەتی عەرەبی و ڕەچەڵەکی پێغەمبەرایەتی لەپاڵ نزیکییان لە موەحیدەکان، ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە لە نەوەی خەلیفە ئەبوو حەفس عومەری کوڕی خەتابن، وەك دەیزانین عومەر لە خانەدانەکانی قورەیش بوو باڵوێزی قورەیش لە جاهیلیدا لەدەست ئەو بوو، پێغەمبەر (ﷺ) حەفسەی کچی عومەری بە هاوسەر گرت.

جا حەفسیەکان بەوپێیەی بنەڕەتیان قورەیشیە و سەر بە نەوەی پێغەمبەرن و لە موەحیدەکان نزیکن، بۆیە شەرعیەتی پێویستیان بە خۆیان دەدا تا خیلافەتی داڕماوی موەحیدین بە میرات بگرن، ئەوان سوور بوون لەسەر شانازی کردن بەو بنەڕەتەیان و باسکردنی لە هەموو بۆنەیەکدا، ئەمەیش بەڕوونی لە وتەی نووسەر و شاعیرەکانیاندا بەدیدەکەین کە ناوی عومەری و فاروقیان لێ دەنان وەك ئیبن خەلدون لە قەسیدەیەکدا وەسفیان دەکات و دەڵێت:

قوم ابوحفص اب لهم و ما ادراک والفاروق جد اول

---

١ ـ ابن ابی دینار:المونس فی اخبار افریقیة و تونس ص١١٨، محمد الباجی المسعودی: الخلاصة النقیة فی امراء افریقیة. ص٦١

٢ ـ لێرەدا ناکۆکیەك هەیە لەسەر مێژووی ڕاگەیاندنی خیلافەتی سوننی حەفسی لە تونس:زەرکەشی لە (تاریخ الدولتین الموحدة و الحفصیة)، ص ٣٦دا دەڵێت لە ٢٤ی ذیلحجەی ٦٥٠ك.١٣٥٣ز.دا بووە، لەکاتێکدا محمد الرعینی القیروانی ناسراو بە ئیبن ئەبی دینار بە ساڵی ٦٥٧ك/١٢٥٩زدا دەڵێت دوای ڕووخانی خیلافەتی بەغداد بەدەستی مەغۆل. وادیارە ڕاکەی زەرکەشی ڕاستتر بێت بەپێی بەرفراوانی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی حەفسی و بەیعەتپێدانی خەڵکی مەغریب و ئەندەلوس لە دەسەڵاتی ئەویش لەپێش ڕووخانی خیلافەتی عەبباسیدا.

خیلافەتی حەفسی لە بارێکی سیاسیدا ڕاگەیەنرا و چەند ساڵێکی کەم لە ڕاگەیاندنی تێنەپەڕی تا خیلافەتی عەبباسی لە بەغداد لەسەر دەستی مەغۆل ڕوخێنرا و کۆتا خەلیفەیان (موستەعسەم بیللا لە ساڵی ٦٥٦ ك/١٢٥٨ز) دا کوژرا. بە دوای ئەوەدا میر ئیدریسی شەریفی مەککە و خەڵکی حیجاز بەیعەتی خۆیان نارد بۆ خیلافەتی خەلیفە موستەنسیر بیللاهی حەفسی و بە میراتگرەوەی خیلافەتی دارماوی عەبباسیان لە قەڵەم دا.

بێگومان ئەو بەیعەتپێدانە پایەی خیلافەتی حەفسی توندوتۆڵ کرد، چونکە بنەڕەتێکی شەرعی پێدا کە ئەویش سەرپەرشتیکردنی حیجاز بوو (بنەڕەتی عەرەب و موسوڵمانان و پێگە و مەڵبەندی دوو حەرەمی پیرۆز)، لەوبارەوە ماکس ڤان برشمی ڕۆژهەڵاتناسی سویسری دەڵێت: حەفسیەکان لە کاتێکدا خیلافەتی موەحیدینیان بە میراتگرت کە لەگەڵیشیدا بە ڕووخانی بەغداد شتێك لە شان و شکۆی خیلافەتی عەبباسیشیان بە دەست هێنا).

میسر هەستی کرد بە مەترسی ئەو ئامانجانەی خیلافەتی نوێ کە دەکەوتە سنوری ڕۆژئاوایەوە، چونکە سیاسەتی میسر هەمیشە دەیویست لەبەر چەند هۆکارێکی ئایینی و سیاسی و ئابووری دەستەڵاتی خۆی بەسەر حیجازدا بڵاوبکاتەوە کە گرنگترینیان دەستگرتن بوو بەسەر دەریای سوور و بازرگانی ئەوێدا، جا هەموو ئەو فەرمانڕەوایانەی میسریان لە دەستدا بوو وەك تولۆنی و ئەخشیدی و فاتیمیەکان سوور بوون لەسەر بڵاوکردنەوەی دەستەڵاتی خۆیان بەسەر حیجازدا، پاشان ئەییوبیەکان لەسەر هەمان سیاسەتی حیجازی چوون تا ئەوەی نازناوی (خودا مولحەرەمەین) یان لە خۆیان نابوو ئەو نازناوەیش دوای ئەوان بۆ مەمالیك و عوسمانیەکان مایەوە.

سوڵتان هەزار بیبریس لەسەر هەمان ڕێگە چوو و چالاکیەکی گەورەی تێدا نیشان دا، ئەو پێی وابوو سیاسەتی دەوڵەتی حەفسی دژ بە سیاسەتی تەقلیدی میسرە بەرامبەر بە حیجاز، بۆیە هەوڵیدا خیلافەتی عەبباسی لە قاهیرە و لە ساڵی٦٥٩ ك/١٢٦١ز.دا زیندوو بکاتەوە، لەمەوە دەیویست مەککە و مەدینە

لەدەست قەڵەمڕەوی حەفسیەکان بسێنێت و بەناوی خیلافەتی عەبباسیەوە دەستەڵاتی خۆی بەسەر حیجاز و دەریای سووردا درێژ بکاتەوە.[١]

ئەوەی هۆکاری لاکردنەوە بوو بەلای ئەو بوارەدا ئەوەیە کە ئەو نازناوی خەلیفەی عەبباسی یەکەم لە قاهیرە گرتیەبەر کە موستەنسیر بیللا بوو، هەمان ئەو نازناوە بوو کە خەلیفەی حەفسی لە تونس لە خۆی نابوو، من پێم وانیە لێکچوونی ئەم دوو نازناوە تەنها ڕێکوپێك یان ئەندێشەیەك بووبێت هێندەی پێم وایە کە جۆرێك لە ڕکەبەری بێت، بۆ پاڵپشتی ئەمەیش هەندێك لە سەرکردە چاو لە دەستەڵاتەکان ئەو ڕکەبەریەی نێوان خیلافەتی قاهیرە و خیلافەتی توونسیان قۆستەوە بۆ بەدیهێنانی نیازە شەخسیەکانی خۆیان، جا بۆ نمونە ئیبن خەلدون دەگێڕێتەوە کە لە ساڵی ٦٦٣ ك/١٢٦٥ز.دا والی تەنجەکە بە ئیبن ئەمیر ناسرابوو ڕاپەڕی و وتاری خوێندەوە بۆ خەلیفەی حەفسی بەرپرسی ئەفریقیا، پاشان وتاری خوێندەوە بۆ خەلیفەی عەبباسی لە قاهیرە، پاشان وتاری بۆ خۆی خوێندەوە و دواجار لەساڵی٦٦٥ ك/١٢٦ز.داکوژرا.

هەرچۆنێك بێت، گرنگ ئەوەیە سوڵتان بیبرس کەوتە پەیڕەوکردنی سیاسەتی حیجازی بە کرداری و یەکەم جار چەند چاکسازیەکی لە حەرەمی پیرۆزی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەنجامدا و بەرگی نارد بۆ کەعبە خێر و بەخشش و زەیت و بۆن و شمەکی تری نارد بۆ ئەویٚ، دواتر بیبریس لە ساڵی ٦٦٧ ك/١٢٦٩ز.دا فەرزی حەجی بەجێگەیاند و لە خوا ترسی و ڕێزێکی بیٚ کۆتای نیشاندا،بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا نیاز و بەرژەوەندیە سیاسیەکانی خۆی لەبیر نەکرد و پشتیوانان حەفسیەکانی لابرد و وتاری لە حیجازدا بۆ خەلیفەی عەبباسی و دواتر بۆ سوڵتانی میسر خوێندەوە، هەروەك میر شەمسەدین مەروانی وەك نوێنەری خۆی لەپاڵ شەریفی مەککەدا دانا، کورتەی قسە ئەوەیە کە قەڵەمڕەوی سوڵتانی میسر لە زەویەکانی حیجازدا بەهێز بوو و وتار و درا و و ناردنی بەرگی ساڵانە بۆ کەعبە هێمای ئەو قەڵەمڕەوە بوو هەموو ئەمانەیش کاری بیبریس بوو کە لەناو کۆمەڵە لایەنەکانی پاڵپشتی ناوخۆیی و دەرەکی دەوڵەتی مەملوکیدا بوو.

---

١ـ wieti précis de I,historie degypte to me itp٢٥٠.

ئەمە و بیبریس بە گرینگیدان بە دوو حەرەمی پیرۆزەوە نەوەستا، بەڵکوو لەساڵی ١٢٦١ ز.دا فەرمانیکرد بە ناردنی پیشەساز و پیشەگەران بۆ نۆژەنکردنەوەی (قبە الصخرە) لە قودس و مزگەوتی ئیبراهیم خەلیلی (علیه السلام)[1] نویێ کردەوە و وائیقتاعی سەرکردەکانی بۆ وەقص دەرهێنا، هەروەك لەساڵی ١٢٦١ ز.دا فەرمانییکرد تا بونیادێك عەین جالوتدا دروستبکرێت کە ناسرا بە (مشهد النصر) وەك هەمیشە مانەوەی یا دەوری ئەو سەرکەوتنە گەورەی کە موسوڵمانان لەوێ بەدییان هێنا.

بیبریس بەوەیشەوە نەوەستا، بەڵکوو کەوتە دامەزراندن و بنیادنانی مزگەت و خوێندنگە، جا لە ڕەبیعولئاخیری ساڵی٦٦٠ك/١٢٦١ز.دا دەستیکرد بە بنیادنانی خوێندنگە ناودارەکەی خۆی لەسەر شوێنەواری یەکێك لە قیتاعەکانی کۆشکی گەورەی فاتیمی و لەساڵی ٦٦٢ ك.دا بنیادنانەکەی تەواو بوو.[2] لەگەڵ ئەوەی ئەو خوێندنگە لەسەردەمی خودی مقریزیدا (ت ٨٤٥ /١٤٤٣) ویران بوو، بەڵام بەشی زۆری تا ساڵی ١٨٧٤ ز.دا مایەوە کاتێك لەوساڵەدا شەقامی نێوان مەیدانی بەیتولمەقدیس بۆ بازاری مزگەرای بەرامبەر بە مەزارگەی سوڵتان قلاون بەوێدا تێپەڕی و بڕی، منارەکەی ئەو خوێندنگەیش لەساڵی١٨٨٢ دا داڕما و ئەمڕۆ تەنها ڕووبەری ١١/٥ مەتری لێماوەتەوە.[3]

بیبریس خۆی لە زانایان و پیاوانی ئاینی نزیك کردەوە و لێی دەگێڕنەوە کە چوار جار سەردانی ئەسکەندەریەی کردووە و لە هەموو سەردانێکیدا جێدەستێکی بەجێ هێشتووە کە بەڵگەیە لەسەر گرنگیدانی پێ وەك توندوتۆڵکردنی شورەکانی و بەهێزکردنی کەشتیگەلی و پاککردنەوەی کەنداوەکەی لەو لمەی کە داپۆشیبوو و سەردانکردنی گەورە شۆفیان لە زاناکانیان وەك شێخ قەباری و شێخ شاطبی،بەو پێناوانە و چەندێکی تریش بیبرس سەرکردایەتی جیهانی ئیسلامی لە ڕووی شەرعی

١ ـ ابن خلدون:العبر ج٧ ص١٩٦

٢ ـ المقریزی: السلوك ج١ص٥٠٢-٥٧٩

٣ ـ Creswell: the madrasa of baibars, op. cit.p.١٣١

و عورفیشەوە گرتە دەست و سەرکردە موسوڵمانەکان دەهاتنە قاهیرە و دیمەشق بۆ چوونە خزمەتی و نیشاندانی گوێڕایەڵی و شوێنکەوتەییان بۆ بیبرس، ئەمە زامنی دامەزراندنی دەوڵەتی مەمالیك بوو لەسەر چەند بنەڕەتێکی چەسپاو.

## ٣-دەرباز بوون لە ڕەگەزە نەیارە ئەییوبیەکان:[١]

دوای ئەوە تاکە کێشەیەك کە بەرەو ڕووی بیبرس دەبوویەوە و هەڕەشەی لە دەوڵەتی مەمالیك دەکرد، بریتیبوو لە پاشماوەی ئەییوبیەکان وێڕای ئەوەی مەنسوری بەرپرسی حەما و ئەشرەف موسای بەرپرسی حیمس هەواداری خۆیان بۆ

---

١ ـ ناوی شێخ ئەبولقاسم موحەممەدی کوڕی مەنسوری مالیکی ئەسکەندەرانی ناسراو بە قبارییە لەبەر پیشەی گوڕ هەڵکەنی ئەو ناوەی لێنراوە، هەروەها قبار بە یاریدەری ماسیگرش دەوترێت(السلوك ج١ص٤٤٩) قەباری لە شێخ حەسەنی شازەلی دامەزرێنەری دەستەی شاژەلی زانستی وەرگرت و لە کێڵگەیەکی بچووك دا ئیشی دەکرد و لەوماوەی لە ماڵەوە بوو خەڵکی دەدواند دەڵێن کاتێك سوڵتان بیرس سەردانی کردووە نەیتوانیوە بیبیستێت و لە کێڵگەکەدا توانیویەتی بیدوێنێت، شێخیش ئامۆژگاری کرد تا شورەکانی ئەسکەندەریە توند و تۆڵ بکات، قباری لە دەوروبەری ئەسکەندەریە لەساڵی ٦٦٢ك/١٢٦٤ز.دا مرد و ئەو ناوچەی ئەوی تێدا دەژیا تا ئێستایش بەناوی ئەوەوەیە ابوشامە(الذیل علی الروضتین ص٢٣١"المقریزي:السلك ج١ص٥٢٣: المندوبي:ابوالعباس المرسی و مسجدە ص،٢).

١٠-شێخی دنیانەویست ئەبو عەبدوڵڵا موحەممەدی کوڕی سولەیمانی مەعافری شاتیبی ئەسکەندەریە کە لە بنەڕەتدا خەڵکی شاری شاتیبە یە لە ڕۆژهەڵات ئەندەلوس، پاشان کۆچی کردووە بۆ ئەسکەندەریە و لەڕۆژانی سوڵتان زاهر بیبرسدا لەوێ ژیاوە، ناسرابوو بە پەرەستش و لەخواترسی، لە ئەسکەندەریە لەساڵی ٦٧٢ك/١٢٧٣ز.دا مرد و لەوێیش بەخاك سپێردرا و گۆڕەکەی لەنزیك بینای کارگێڕی زانکۆی ئەسکەندەریەیە لەو ناوچەی کە بەناوی ئەوەوە ناسراوە، ئەمە شێخ ئەبولقاسم رعینی شاتیبی نیە کە لەڕۆژانی سەلاحەدینی ئەیوبی لە قاهیرە دەژیا و وەك مامۆستا لە خوێندنگەی فازلیە دانرا و چەندین کتێبی لەبواری تەفسیری قورئان و حەوت ئێوە خوێندنەوەکەیدا هەیە، بەتایبەت ئەو قەسیدە بەناوبانگەی کە لەبواری خوێندنەوەکانی قورئاندا هەیەتی و بە شاتیبی ناسراوە و ١٧٣ دێڕە، لە قاهیرە لەساڵی٥٩٠ك. مرد و بەخاك سپێردرا.(ابن خلکان: وفیات الاعیان ج٣ص٢٣٤: المقریزی: نفخ الطیب ج١ ص٢٢٩"السندوبي: ابوالعباس المرسی ص١٢٨.

بیبرس ڕاگەیاندبوو، مەلیك موغیث عومەری کوڕی عادلی کوڕی کامیلی بەرپرسی قەڵای کەرك[١] ڕۆژێك لەڕۆژان لە دژایەتی سوڵتانەکانی مالیك نەوەستابوو هەر لەسەردەمی ئەیبەکی تورکومانیەوە، چونکە پێی وابوو ئەو لەوان شیاوترە بۆ دەستەڵاتداری میسر و شام، جا کاتێك بیبرس هاتە سەر دەستەڵات بڕیاریدا موغیث نەهێڵێت[٢] و هەڵمەتێکی پێویستی ئامادە کرد بۆ بەدیهێنانی ئەو پڕۆژەیە، بەڵام موغیث نامەیەکی نارد بۆ خەلیفە حاکم بیئەمریللا لە قاهیرە و داوای لێکرد سکاڵای بۆ بکات، خەلیفەیش نامەی نووسی بۆ بیبرس و سکاڵای بۆ کرد و ئەویش سکاڵاکەی وەرگرت و لەسەر موغیث و کەرکیش ڕاوەستا،[٣] بەڵام وادیار بوو موغیث لەسەر نیازی پێشووی خۆی بوو بەرامبەر بە مەمالیك و دەستەڵاتەکەیان،بۆیە بە نهێنی نامەی بۆ هۆلاکۆ نووسی و هانی دەدا تا شام داگیر بکات و داوای لێ کرد تا وەك پاشایەکی سەربە ئەو دایبمەزرێنێت،[٤]بەڵام بیبرس بەم نامە گۆڕینەوەی نێوان موغیث و هۆلاکۆی زانی، و دەیشێلێن شتی وانەبووە، بەڵکوو بیبری لەبەر نیازی دەروونی خۆی بۆ دەرباز بوون لە یەکێك لە میراتگرە شەرعیەکانی دەستەڵاتی ئەییوبی و نەیاری دەستەڵاتی بیبرس ئەم چیرۆکەی دروستکردووە.[٥] هەرچۆنێك

---

١-یاقوت(معجم البلدان ج٤ص٢٦٢)دەگێڕێتەوە کە سێ شوێن هەن کە بە کەرك ناسراون:یەکەم گوندێکی باشووری لوبنانە، دووەم قەڵایەکی پتەوە لە بەلقا لە نێوەندی شاخی نێوان دەریای قلزم(سوور)و بەیتولمەقدیسدا کە مەبەستمان ئەمەیانە، ئەبولفیداو(المختصر فی اخبار البشر ج٣ ص٢٦٦)ئەم دوژمنکاریە دەگێڕێتەوە بۆ ناخۆشیەك لە موغیپەوە بەرامبەر بە سێیەمیش گەندێکی نزیك لە بەعلەبەگە.

٢ - ژنی بیبرس لە کەرك ئەنجامیداوە .

٣- ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ص٤٠٠ .

٤- Blachet:op.cit.p.٢.b٢.

٥ ـ شێخی دنیانەویست ئەبو عەبدوڵلا موحەممەدی کوڕی سولەیمانی مەعافری شاتیبی ئەسکەندەریە کە لە بنەڕەتدا خەڵکی شاری شاتیبە یە لە ڕۆژهەڵات ئەندەلوس، پاشان کۆچی کردووە بۆ ئەسکەندەریە و لەڕۆژانی سوڵتان زاهر بیبرسدا لەوێ ژیاوە، ناسرابوو بە پەرەستش و لەخواترسی، لە ئەسکەندەریە لەساڵی ٦٧٢ك/١٢٧٣ز.دا مرد و لەوێیش بەخاك سپێردرا و گۆڕەکەی لەنزیك بینای کارگێڕی زانکۆی ئەسکەندەریەیە لەو ناوچەی کە بەناوی ئەوەوە ناسراوە، ئەمە شێخ ئەبولقاسم رعینی شاتیبی نیە کە لەڕۆژانی سەلاحەدینی ئەیوبی لە قاهیرە

بێت بیبرس پشتی بەست بە سیاسەت و نامەیەکی بۆ عومەر نووسی و تیایدا جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی کە ئەو لەسەر بەڵێنی خۆیەتی.

بیبری پێی وابوو خاچپەرستان کار دەکەن بۆ هاندانی پاشایانی ئەورووپا بۆ کارێکی وەك ئەوەی لویسی نۆیەمی پاشای فەرەنسا لە کۆتا رۆژەکانی ئەییوبیەکاندا پێی هەستا، ئەو دوو مەترسیەش دەبنە هۆی بەرەو لەناوبردنی دەوڵەتی مەملوکی، بۆیە هەوڵیدا هاوپەیمان لەگەڵ دەوڵەتە ئەورووپیەکان و ئەوانی تریشدا ببەستێت وەك ئامادەسازی بۆ ئەو مەترسیە تێکئاڵاوە.

بۆیە لەگەڵ میخائیلی هەشتەم بالیولوج ئیمپراتۆری دەوڵەتی بیزەنتی لەسالی ١٢٦٢ ز/٦٦٠ ك.دا هاوپەیمانی بەست و لەسەر داوای خۆی بەتریکێکی ملکانی بۆ نارد تا لەدەوڵەتەکەیدا سەرپەرشتی ملکانیەکان بکات،[1] لەگەڵ ئەو بەتریکەدا کەناوی رەشید کەمال بوو میرنارسەدین ئەقوش مەسعودی و چەند ئوسقوفێك هەبوون، کاتێك گەیشتنە قوستەنتینیە ئیمپراتۆر پێشوازی لێکردن و رێزی گرتن و میر ئەقوشی برد بۆ ئەو مزگەوتەی پایتەختەکەی کە نۆژەنی کردبوویەوە تا موسوڵمانە بازرگان و پیشەساز و نیشتەجێ و گەشتیارەکانی ناو وڵاتەکەی نوێژی تێدا بکات، کاتێك بیبرس زانی ئیمپراتۆری بێزەنتی ئەو مزگەوتەی نوێ کردۆتەوە، فرمانیکرد تا بە فەرش و زێرپۆش و بوخورد و عود و گوڵاو رازاوە وبۆن خۆش بکرێت.[2]

---

دەژیا و وەك مامۆستا لە خوێندنگەی فازلیە دانرا و چەندین کتێبی لەبواری تەفسیری قورئان و حەوت ئێوە خوێندنەوەکەیدا هەیە، بەتایبەت ئەو قەسیدە بەناوبانگەی کە لەبواری خوێندنەوەکانی قورئاندا هەیەتی و بە شاتیبی ناسراوە و ١٧٣ دێرە، لە قاهیرە لەسالی٥٩٠ك. مرد و بەخاك سپێردرا.(ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٣ص٢٣٤: المقريزى: نفخ الطيب ج١ ص٢٢٩"السندوبى: ابوالعباس المرسى ص١٢٨.

١ ـ ئەم ناوە لەو مەسیحیە عەرەبانە نرا کە دایانە پاڵ کڵێسای بێزەنتی و مەزهەبی رەسمی ئیمپراتۆریان گرتەبەر،بڕوانە: basilikai ملکانی وشەیەکی سریانیە کە لە عەرەبیدا ملکی بەرامبەریەتی و لە یۆنانیشدا encyclopaedia oncise cinizationp.٢٦١

٢ ـ مەسارمەی کوڕی عەبدولمەلیك لەسالی ٩٦/٧١٤ کۆچیدا ئەو مزگەوتەی لەسەر دەمی خیلافەتی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیکدا بنیادنا لەسەر رێککوتنی بێوان بیزەنتە و موسوڵمانان

هەروەها سولتان بیبرس لەگەڵ ئیمپراتۆری دەوڵەتی غەربی و پاشای سقلیه و ناپۆلی منفردی کوڕی فردریکی دووەم هونشتاوفن هاوپەیمانی بەست، و لەسەرەتاکانی دەستەلاتیدا لەساڵی ٦٥٩ ك/١٢٦١ ز. دا دیاریەکی بۆ نارد کە کۆمەڵێك زەڕافە و ژمارەیەك دیلی تەتەری عەین جالوتی بە ئەسپ و شەکە تەتەریەکانەوە بۆ نارد، ئیمپراتۆریش بە دیاریەکە سەرسام بوو و ڕێزی نێردراوەکانی گرت، مێژوونووسی گەورەی ئومەوی جەمالەدینی کوڕی واصلاە ناوباڵوێزی میسریدا بوو کە کۆمەڵە هەواڵێکی ئەو باڵوێزەمان لە کتێبەکەیدا (مفرج الکروب فی اخبار بنی ایوب) پێی دەڵێت و باس دەکات کە:(من وەك نێردراوی سولتان ئەعزەم مەلیك زاهر رزکنەدین بیبرس–ڕەحمەتی خوای لێ بێت_لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٥٩ دا چووم بۆلای منفرید و لەوێ بە ڕێزداری لە شارێکی ئبنولیه[1]، کە پێی دەوترا برلت لای دانیشتم و کۆبوونەوەم لەگەڵ بەست و دەبینم زۆر تایبەتمەندە و زانستە عەقڵیەکانی پێ خۆشە و دەنووسراوی ناو کتێبەکەی ئوقلیدسی لە ئەندازیاریدا لەبەرکردبوو، لە نزیك ئەو شارەی من لێی دابەزیبووم شارێك هەبوو کە ناسرابوو بە (لوجارە) و خەڵکەکەی هەمووی موسوڵمان بوون و خەڵکی دوورگەی صقلیه بوون و وتاری هەینی تێدا دەخوێنرایەوە و دروشمەکانی ئیسلامی تێدا ئەنجام دەدرا و لەسەردەمی باوکیدا کە ئیمپراتۆر بوو هەروا بوو بوو،[2] ئەو کەوتە دامەزراندنی یانەیەکی زانست لەوێ تا هەموو جۆرەکانی زانستە

---

کە دەیوت مزگەوتێك لە قوستەنتینیە دروستبکرێت.خاچپەرستەکان لەکاتی شاڵاوبردنیان بۆسەر قوستەنتینیە وێرانیان کرد، دەڵێن سەلاحەدین هەوڵیداوە بنیادی بنێتەوە، بەڵام بیزەنتەکان بە داواکەی ڕازی نەبوون (ابن واصل: مفرج الکروب ج٢ص٤٠٢" العینی: عقدالجمان ورقة٤٨١).

١ ـ مەبەستی پێی هەرێمی ئەپۆلیایە لە باشووری ئیتالیا.

٢ ـ مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە فردریکی دووەم زۆربەی موسوڵمانانی دوورگەی سقلیەی گواستەوە بۆ شاری لوجارە لە ئەبولیا لە باشووری ئیتالیاله ساڵی ١٢٤٩ ز. دا. ئەمەیش لەبەر چەند پێکدادانێکی توندی نێوان موسوڵمان و مەسیحیەکانی چقلیەدا بوو، بۆیە ئیمپراتۆر لەگەڵ خۆیدا بردنی بۆ شاری لوجارە و لەوێ زۆربەی کات)ی خۆی بەسەر دەنارد و لێیان دڵنیا بوو. (ماتینوماریو مورینۆ: الموسلمون فی صقلیة ص٢٥

نەزەریەکانی تێدا بخوێنرێت، زۆربەی ئەو نزیکانە کە کاروبارەکانیان لەدەست بوو موسڵمان و لەسەر بازگەکەیدا بانگ دەدرا و نوێژ دەکرا و صەفدیش لەباسی ژیانی ئیبن واصل دا دەڵێت کە منفرد لە کۆڕەکەیدا بە جەمالەدینی وتووە: (ئەی دادوەر من هیچ پرسیارێکم لە فیقهو عەرەبیدا نیە تا لێت بکەم، پاشان سی (٣٠) پرسیاری لێکرد لە بواری بینینەکاندا، ئیتر ئەو شەوەی بە وەڵام و پرسیار بردە سەر و دواجار ئنبروردای بەڕوویدا و وتی:(ئائەمە قەشەی موسوڵمانان) چونکە دادوەر لەو گەشتەیدا هیچ کتێبێکی پێ نەبوو، بەڵکوو لەوەی کە دەیزانی وەڵامی دەدایەوە).

هەروەها ئیبن واصل لەو ماوەی لە ئیتاڵیا بوو نامەیەکی لە مەنتیقدا نووسی و ناوی نا (الرساله الانبروريه)و پێشکەشی کرد بە منفرد.

سەرچاوە هاوسەردەمە ئیسپانیەکان دەگێڕنەوە کە ئەلفۆنسۆی دەیەمی پاشای قشتاڵە کە بە (عالم[1]) ناسرابوو دیاریەکی نارد بۆ سوڵتان بیبرس بوندوقداری ئەسپی ڕەسەنی عەرەبی بوون، ئەمەیش لەساڵی٦٥٩ ك/١٢٦١ ز.دا بوو، بیبرسیش دیاریەکی هاوشێوەی نارد کە زەڕافەیەکیشی تێدا بوو لەگەڵ فیلێك و تیمساحێکی مۆمیا کراو کە تا ئەمڕۆیش بە دەروازەی دەرگای ڕۆژهەڵاتی لکتدارائی ئیشبیلیەوەیە، گێڕاوەکە دەڵێت کە سوڵتان بیبرس داوای کچی ئەلفۆنسۆی دەیەمی پاشای ئیسپانی کردووە، بەڵام داواکەی نەهاتوەتە دی.

هەوڵەکانی بیبرس تەنها لەسەر پاشایانی ئەورووپا نەبوو، بەڵکوو لەگەڵ خانی هۆزی زێرینیشدا [2]یان مەغۆلی قبشاقدا کە ناوی بەرەکە خان بوو و یەکەم کەس بوو لەنەوەکانی جەنگیزخان کە موسوڵمان بوو بوو هاوپەیمانی بەست، وڵاتەکەی خان

---

١ ـ بە عالم یان حەکیم ناودەبرێت چونکە سەرپەرشتی نوسینەوەی (الحولية التاريخية الكبرى)ی لە مێژووی ئیسپانیادا کردووە و بۆ نوسینی پشتی بەستووە بە کۆمەڵە زانایەکی موسوڵمان و جولوکە و مەسیحی، ئەوانیش پشتیان بەستووە بە ژمارەیەکی زۆری سەرچاوە عەرەبی و بیزەنتی و لاتینیەکان و هەموو حەولیەکانی پێشووی ئیسپانیا. هەروەها لەسەردەمی ئەم پاشایەدا کە بە خۆشەویستی بۆ زانست و زالیان ناسرا بوو بزوتنەوەی وەرگێڕان لە تلیتلە چالاك بوو

٢ ـ دەڵێن ئەم ناوانە دەکەڕێتەوە بۆ ڕەنگی خێوەتەکانیان.

لە تورکستان لە ڕۆژهەڵاتەوە تا باکووری دەریای ڕەش لە ڕۆژئاواوە درێژ دەبوویەوە و ناسرا بوو بە وڵاتی قبستاق یان قفجاق و شاری (صرای) لە باکووری ڕۆژئاوای دەریای قەزوین پایتەختی بوو.

سوڵتان بیبری لەگەڵ گەورەی ئەو دەوڵەتە ئیسلامیە مەغۆلە بەرەکەخاندا هاوپەیمانی بەست و دەستەی نێردراو و دیاری لە نێواندا ئاڵوگۆڕ دەکرا (١٢٦١-١٢٦٣ ز) هەروەك كچی بەرەکە خانیشی بە هاوسەر گرت و فەرمانی کرد تا لەسەر مینبەرەکانی قودس و قاهیرە و مەککە و مەدینە نزای بۆ بکرێت.[١] بێگومان ئەو هاوپەیمانیە بە سروشتی خۆی دژ بە دوژمنی هاوبەشی هەردووکیان بوو کە دەوڵەتی ئیلخانەکانی فارس بوو کە هۆلاکۆ و کوڕەکانی فەرمانڕەواییان دەکرد و فارس و عێراقی دەگرتەوە و تەبریز یان مەراغە پایتەختی بوو، مقریزی دەگێڕنەوە کە بیبرسبەرەکەخانی هان دەدا تا لەگەڵ هۆلاکۆ بجەنگێت و لەسەر ئەوەیش ئارەزووی بۆ دروست دەکرد.

بیبرس بەمە دەستبەردار نەبوو، بەڵکوو لەساڵی ٦٦٠ ك/١٢٦٢ز.دا هاوپەیمانی بەست لەگەڵ عیزەدین کەیکاوسی کوڕی کەیخەسرەو سوڵتانی سەلجوقیەکانی ڕۆمدا و بەڵێنی پێدا دژ بە روکنەدینقلج ئەرسەلانی برای و دژ بە هۆلاکۆ و چاوچنۆکیەکانی لە ئاسیای بچووکدا یارمەتی بدات، بیبرس وەك ئامادەسازی بۆ پاڵپشتی سوڵتان عیزەدین دژ بە روکنەدینی برای و دژ بە مەغۆل سەربازەکانی خۆی نارد بۆ دیمەشق و حەلەب.[٢]

دیارە ئەو هاوپەیمانێتیانەی بەستران و ئەو باڵوێزانەی لەنێوان سوڵتانی مەملوکی ومیسر و نێوان پاشایانی دەوڵەتانی چواردەوری لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا ئاڵوگۆڕ دەکران، دەوڵەتی مەمالیکەکانی بەرەو جۆرە ئاسایشێك برد کە لە ڕووی مەغۆل و خاچپەرستاندا هەڕەشەی لێ دەکرا، هەرچەندە دیارە سەردەمی بیبرس

---

١ ـ ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ص٤٠٩"مفضل بن ابى الفضائل: النهج السديد ص٤٥٤-٤٦٢.

٢ ـ المقريزى ك السلوك ج٢ص ٤٦٥، ٤٨٠ ، ٥٠١-٥٠٣-٥١٢-

کە لە شالاوی خاچپەرستی بۆ سەر میسر بەدووره لەبەرئەوەیە کە دەوڵەتە ئەورووپیەکان سەرقاڵ بوون بە کاروبار و گرفتی خۆیان لە ڕۆژئاوادا، هەروەك کەمی شالاوی مەغۆلی لەسەردەمەکەیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارە بێدەنگیەی کاتەی مەغۆل دوای گێژەڵوکەی جەنگیزخان و هۆلاکۆ لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا بەلایەنی کەمەوە.

## ٥- قایموقۆڵکردنی ناوچەکانی دەوروبەر و سەرسنوورەکان و گرینگیدان بە پۆستە:

ئەوەی لەبەردەم دەوڵەتی مەملوکیدا مابوو بۆ پاڵپشتکردنی هێز و مانەوەی بریتیبوو لە دڵنیاکردنی سنوورەکانی دژ بە شالاوی دەرەك و ڕێکخستنی سوپاکانی و بەهێزکردنی کەشتیگەلەکەی، چونکە مەڵبەندی سەرکردایەتی لە جیهانی ئیسلامیدا ئەوەی دەیویست بۆ هێرش بردن بێت یان بەرگریکردن، بۆیە بیبرس لەو بوارەوە گرنگترین کارێك بوو پێی هەستا کە دەوڵەت پێویستی پێی بوو بۆ دامەزراندن لەسەر بنەڕەتێکی پتەو، یەکەم کار ئەوە بوو کە سوڵتان لەساڵی ١٢٦١ ز/٦٥٩ ك.دا خێڵە عەرەبیەکانی بەسەرباز گرت، ئەو خێڵانە لەسەر سنووری فوراتی بوون وەك عەرەبی خەفاجە و هانی دان تا دژ بە هۆلاکۆ بجەنگن دوای ئەوە بە دیاری و پارە و سامان ڕازی کردن. دەوترێت ئەو عەرەبانە بە چاکترین شێوە کاری خۆیان ئەنجامدا تا ئەوەی هەڵمەتەکانیان گەیشتە دەرگای شاری بەغداد.

بیبرس بەوەیشەوە نەوەستا، بەڵکوو لەساڵی ١٢٦٢ ز/٦٦٠ ك.دا فەرمانی بە نوێنەرانی لەحەلەبدا کرد تا ئەو دار و قامیشانە بسوتێنن کە هۆلاکۆ فێر بوو بوو لە نزیکی ئەوانەوە لە کاتی هێرش بردنی بۆ سەر شام سەنگەری دەگرت، بۆ ئەمەیش بەنهێنی ئامادەسازی بۆکراوە و هەموویان سووتێنران کە بە درێژایی دە ڕۆژ ڕێگە دەبوون لە ئامەدەوە بۆ خلاط، بەمە بیبرس ڕێگەکانی بەرەو شامی لە هۆلاکۆ و سەربازەکانی بڕی.[1] عومەری وقلقشەندی باسی شێوەی ئەو سووتاندنەمان بۆ

---

١ ـ ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٤٠٦

دەکات و دەڵێت:(تەتەرەکان فێربووبوون ئالفیان بۆ ئاژەڵەکانیان دانێن نەدەکرد، بەڵکوو ئەوەی لە زەوی دەڕوا سوودیان لێوەردەگرت بۆ ئاژەڵەکانیان، کاتێك زەویەکی بەپیتیان دەدی دەیانگرتەبەر، کاتێکیش ڕوتەڵ بوایە خۆیان لێ بەدوور دەگرت، زەوی ئەو وڵاتە بە پیت بوو و بەشی ئەسپ و ئاژەڵی ئەوانی دەکرد ئەگەر بەرەو وڵاتەکان بهاتنایە، جا ئەگەر بیانسووتاندایە نیازی ئەوانیان لاواز دەکرد، بەمەیش لە هێرش و هەڵمەت بردنە سەر سنوورەکان بەدوور دەبوین، ڕێگەی سووتاندنەکەیشیان ئەوە بوو کە پیاویان بۆ ئامادە دەکرد و ڕێوی کێوی و سەگی ڕاویان هێنا و لە ئەشکەوتەکانی شاخەکان و نێو دۆڵەکاندا بۆسەیان دەگرت و هەرکات ڕۆژێکی ڕەشەبایی بوایە ئاگریان دەنا لە گوێی ڕێویەکان، ئەوانیش لەتاو ئەوەدا ڕایان دەکرد و سەگەکانیش بەدوایاندا دەچوون و وایان دەزانی ڕاوە، بەمە چی زەوی بوو دەیانسووتاند و ڕەشەبایش لەو ئاگرەی دەبرد بۆ دەوروبەرەکەی، وێڕای ئەو ئاگرەی پیاوەکان لە شەوە تاریکەکاندا یان لە دەمەو ئێوارانی تەنگژاویدا دەیاننا سیەوە).[١]

پاشان بیبرس لەساڵی ١٢٦٣ ز.دا فەرمانیکرد تا ئەوقەلاًیانە چاك بکەنەوە کە مەغۆلەکان لە حیمسەوە تا مۆران وێرانیان کردبوون، شمەك و خەزێنەیشی بۆ نارد، بەمەیش هێڵێکی توندوتۆڵی لە ڕۆژهەلاًتی ئوردونەوە تا ڕووباری عاصی دامەزراند وێڕای ئەوبورجە چاودێرانەی کە بە درێژایی دەوروبەری ناوچە خاچپەرستیەکاندا دایمەزراندن تا ڕێگەکان لە دەستدرێژی فرەنجەکان بپارێزن.[٢]

هەروەها بیبرس گرینگیدا بەو زنجیرە پێگە ڕووناکیانەی کە بەشەکانی دەوڵەتی بەپایتەختەوە دەپاراستەوە، ئەمەیش بریتی بوو لەو بورجانەی بۆ چاودێری دانرابوون و پاسەوان و سەنگەرنشینان بە شەو و ڕۆژ سەنگەریان تێدا دەگرت کاتێك دوژمنیان ببینیایە لە وشکانیەوە بەرەو ڕوویان دێت وەك مەغۆل یان لە دەریاوە وەك خاچپەرستان، لە لوتکەی ئەو پێگە ڕووناکیانەوە ئاگریان هەڵدەکرد

١ ـ العمری: التعریف ص٢٠١، القلقشندی: صبح الاعشی ج١٤ ص٤٠١

٢ ـ Wiet: precisoe lhistoire diegypte IIp-٢٥

ئەگەر شەو بوایە، ئەگەریش ڕۆژ بوایە دووکەڵیان دەنایەوە خەڵکیان ئاگادار دەکردەوە تائەو ئاماژانە لە پێگەیەکەوە بۆ پێگەیەکی تر دەگەیشتنە پایتەخت. ئەمە وەك زەنگی بێدارکردنەوەی ئەمڕۆمان وایە: زۆرجار ئەو کەسانە بەچەند ڕێ و شوێنێك یان جووڵەیەکی دیاری کراو ئەو کارەیان دەکرد بۆ هەوڵ دان لەبارەی باری دوژمن یان ژمارە یان ڕەگەز یان هەرشتێکی تری دوژمنەوە، هەرچەندە بەداخەوە سەرچاوەکان باسی شێوەی ناردنی ئەو ئاماژەیان بۆ نەکردووین.

ئەو وەسفەی کە مەقدیسی (ق ٤ ه) و عومەری (سەردەمی ٨ کۆچی) لەبارەی ڕۆڵی ئەو پێگە ڕوناکیانەوە هێناویانە لە بەرگریکاری دژ بە مەغۆل و خاچپەرستاندا، بیرۆکەیەکمان پێبدەن لەبارەی گرنگی ئەو پێگانە لە بەرگریکاری ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، مەقدیسی دەڵێت: (کفر سەلام کە گوندێکی قیساریە بوو زۆر گەورە و لەبار بوو، مزگەوتێکی نایابی تێدا بوو، ئەو ناوچە چەند سەنگەرێکی لەسەر دەریا هەبوو، کە لەوێوە بڕیار دەردەچوو و کەشتیەکانی ڕۆم بە دیلی موسوڵمانانەوە دەهاتن و سێ دیلی موسوڵمانانیان بە سەد دینار دەفرۆشت، لەهەرسەنگەرێکدا دەستەیەك هەبوون کە زمانی ئەوانیان دەزانی و سەرقاڵی نامەکاری دبنەبوون و جۆرەکانی خواردنیان بۆ ئامادە دەکردن، کاتێك کەشتیەکانی ئەوانیان دەبینی ئاگریان دەکردەوە و ئەگەر شەو بوایە، ئەگەریش ڕۆژ بوایە دووکەڵیان دەنایەوە، لەهەر ناوچەدا و چەند پێگەیەکی ڕووناکی هەبوون کە کەسانێکی تێدا بوون و لە یەکێکەوە بۆ پێگەیەکەوە دەچوو، ئیتر لە کاتێکی کەمدا هەواڵ دەگەیشتە هەمووی و تەپڵ لێدەدرا و خەڵکی بە چەك و هێزەوە بەرەو ئەو سەنگەرە دەچوون)[2]

عومەریش بەم جۆرە وەسفی پێگە ڕووناکیەکانی بەرەی ڕۆژهەڵای بەرامبەر بە مەغۆل دەکات:

(پێگە ڕووناکیەکان چەند شوێنێکی بەرز نیشاندانی ئاگرن بە شەو و دووکەڵ بە ڕۆژ) ئەمەیش چونکە وڵاتی ئێران کە بەدەست هۆلاکۆی تەتاری بوو و ئەوانیش

---

٢ ـ المقدسی: احسن التقاسیم فی معرفة الاقالیم ص١٧٧، نشرذی خوية (١٩٠٦)

لەگەڵیاندا شەڕیان بوو، بۆیە لە بەرزایی شاخەکانەوە چەند پێگەیەکیان دانابوو و بەشەو ئاگریان تێدا دەکردەوە و بە ڕۆژیش دووکەڵیان دەنایەوە تا ئەگەر تەتارەکان بەرەو وڵات بێن تا لەگەڵیدا بجەنگن یان شاڵاوی ببەنە سەر هۆشیاری بدەن بە بزووتنەوەی تەتار، جارجارەیش لەسەر چەند بینایەکی بەرزی دیار[١] لەوپەڕی سەرسنورە ئیسلامیەکاندا وەك بیرە و ڕەمبە تا دەگەیشتە لای سوڵتان لەقەڵای شاخ، تا ئەوەی لە فورات بوو ئەگەر لە فورات بوایە شەو پێی دەگەیشت و بە پێچەوانەیشەوە، کاتێك لەوێوە ئاگر یان دووکەڵ هەڵدەکرا بۆ ڕووباری جیاجیای دیدی دوژمن و هەوڵ لێدانی دەزانرا، یان لەبارەی ژمارەوە یان شتی تر، لەهەموو پێگەیەکدا[٢] دیدەوان و پاسەوان دادەنرا بۆ بینینی پێش و پاشی سوپایان..

بیبرس بەوەیشەوە نەوەستا،بەڵکوو لەساڵی ١٢٦٤ ز.دا فەرمانیکرد بە نوێکردنەوەی بینای ئەو قەڵایانەی کە لەسەر سنووری فورات بوون بە تلیبەت قەڵای بیرەکە ئامێری جەنگ و چەکی لە میسر و شامەوە بۆ نارد و هەرچیەکی بۆ نارد کە خەڵك لە کاتی گەمارۆدا بۆ ماوەی دە ساڵ پێویستیان پێ دەبوو تا بەردەوام درکی ژێر پێی مەغۆل بن.

لە میسریشدا سوڵتان فەرمانیکرد تا لای دمیاتئاوە ڕێژگەی نیل ببڕن و بەرد گەلێکی خستە ناوی تا ڕێگە نەدات کەشتی خاچپەرستان تێبپەڕێتەوە و سەرلەنوێ چەرمەسەری دمیات ڕوویداتەوە، هەروەك چەند بورجێکی دامەزراند بۆ چاودێری لە ڕەشید، شورەکانی ئەسکەندەریەیشی نۆژەن کردەوە و ئەو پێگە ڕووناکیەیشی بنیادنایەوە کە لەوێ هەبوو.

بیرس بەو ئامادەسازیە بەرگریکاریانەوە نەوەستا، چونکە باری جەنگی وای دەخواست خێرایی هەبێت لە گەیاندنی هەواڵ و فرمانەکاندا، بۆیە نیزامێك بۆ پۆستە[٣] دانا کە هەموو بەشەکانی وڵاتی بە دەستەوە بە تۆڕێکی هێڵی وشکانی و

---

١ ـ عومەری و قلقشندی ناوی ئەو شوێنانەیان هێناوە، بڕوانە (لندن ١٩٠٦)

٢ ـ العمری: هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە، القلقشندی: هەمان سەرچاوە ص٣٩٨

٣ ـ پۆستە نیزامێکی پەیوەست بە ئاسایشی دەوڵەتە وەك دەزگای هەواڵگری ئەمڕۆ، کاری ئەم بریتییە لە هەواڵگری لەسەر کاربەدەستان و دوژمنانی وڵات و گەیاندنی هەر

ئاسمانی پۆستەوە، مەڵبەندی ئەو تۆڕە قەڵای شاخ بوو لە قاهیرە و لەوێوە هەموو لقەکانی هێڵەکان دەکەوتنەوە ڕێوڕەسمە سوڵتانیەکان دەردەچوون بۆ بەشەکانی وڵات و لەوێیشەوە نامە لە فەرمانڕەواکانەوە دەهاتن و نووسینی والیەکانی ناوچەکان و جێگرەکان بەخێرایی و وردەکاریەوە دەهاتن،[١] تا ئەوەی پۆستە لە دیمەشقەوە بۆ قاهیرە و بە پێچەوانەوە لە سێ ڕۆژدا دەگەیشت [٢]، ئەمە دوای ئەوە هات کە بیبری پارەیەکی زۆری بەخشی لە ڕێگەی ڕێکخستنیدا، بیبرس هەموو شتێکی بۆ مەڵبەندەکانی پۆستە دابین کرد کە کارمەندانی پۆستە پێویستیان پێی بوو لە خۆراك بۆ خۆیان و ئالف بۆ ئاژەڵان، هەروەك دابینکردنی ئاو و بوونی گوندێکی لە نزیکدا لەبەرچاو گرت تا پێی دڵنیا بن و تیایدا بحەسێنەوە، لەهەر مەڵبەندێکیشدا کۆمەڵە ئەسپێکی دانابوو کە تەنها دەبوو بە بڕیارێکی سوڵتانی سواری ببن، پۆستەچیەکان کەسانی لێهاتوو و زیر و بە توانای گەیەنەری زمانەوانی نامەیان لەکاتی پێویستدا لەنێو خزمەتگوزارانی سوڵتاندا هەڵدەبژارد، ئەوانە پلە و پاییەیەکی بەرێزیان هەبوو و بەرپرسی دیوانی دارشتن سەرپەرشتی کارگێڕی پۆستەی دەکرد و پاراستنی لەوحەی پۆستەی،[٣] لە دیواندا پێ

---

ڕووداوێکی هەرێمەکانی وڵات بە پایتەخت، بەمجۆرە پۆستەی دەوڵەت نەوەك پۆستەی جەماوەر وەك پۆستەی ئەمڕۆ. دەڵێن وشەی (بەرید) لە بنەڕەتدا لاتینییە (بێزەنتی) پاشان ئەو نیزامە لەسەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا لە ڕۆمەوە لە شامدا گوازرایەوە بۆ ناو دەوڵەتی ئیسلامی و دەستەواژەی (برید) لەیەکەم ئاژەڵێك نرا کە ئەرکێکی ڕەسمی پەیڕەو دەکرد، پاشان لەخودی کەسەکە دەنرا، لە هیندیش بە(ملك البريد) ناو دەبرا بەقسەی ئیبن بەتوتە، لە مەغریب و ئەندەلوس پێی دەوترا(رقاص)، بێگومان کارگێڕی پۆستە بەوەی کە تۆمار و لیستی ناوی وێستگەکان و ماوەکانی تێدا بوو، ماددەیەکی دەوڵەمەندی بە گەشتیار و جوگرافیناسە موسڵمانەکان دەدرا

١ ـ لە قەڵای شاخەوە چوار ڕێگە پۆستە دەکەوتەوە کە یەکێکیان بەرەو باشوور بۆ قۆمس دەچوو بە ئاراستەی بە ئاراستەی وڵاتی نوبە، ئەوی تریش بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ عیذان و تیشکەکانی سەر دەریای سوور، سێیەمیش بەرەو ڕۆژئاوا بۆ ئەسکەندەریە و بەرقسە.بڕوانە: القلقشندی: صبح الاعشی ج١٤ص٣٧٢-٣٨٣).

٢ ـ دائرة المعارف الاسلامية: مادة بيبرس الاول.

٣ ـ ئەو لەوحانە لە زیو بوون لە ڕوویەکی هەر لەوحەیەکدا دەنوسرا(لااله الا الله محمد رسول الله ارسله بالهدى ودين الحق ليظهره على دين كله ولو كره المشركون —ضرب بالقاهرة

سپێردرابوو، جا کاتێك پۆستەچیەك دەچوو بۆ بەریدێك، لەوحێکی لەوە پێدەدا تا لەڕۆشتنیدا بیکاتە ملی.

بارەکە لە پۆستەی وشکانیدا نەوەستا، بەڵکوو دەتوانین ناوی پۆستەی ئاسمانیش لەوە بنێین کە مەبەستمان پێی کۆتری نامەبەرەکە لەباری خێراییدا بەکار دەهات، ئەو کۆترانە چەند بورجێکی تایبەتیان لە قەڵا و مەڵبەند گەلێکی دیاریکراودا هەبوو لەهەموو بەشەکانی وڵاتدا وەك مەڵبەندەکانی پۆستەی وشکانی، بەڵام لەڕێی نێوانیاندا دوورترن، جا ئەگەر کۆترەکە لە مەڵبەندێکا داببەزیبا، کەسانی ناو بورجەکە ئەو نامەی بەباڵی کۆترەکەوە بوو دەیانبەست بەباڵی کۆترێکی تر تا بیگەیەنێت بەو شوێنەی تر، بەوجۆرە دەچوو، پوختاری و جەختکردنەوە گرنگترین تایبەتمەندی ئەو نامانە بوو کە کۆتری نامەبەر دەیگواستەوە، تیایدا بسم الله الرحمن الرحیم و پێشەکی و نازناوی زۆر دەهات و تەنها مێژوو و کات و بابەتی خوازراو بەشێوەیەکی پوخت هەبووە.[1] ئەو هێڵەی لەو نامانەدا بەکار دەهات ناسرابوو بە(الغبار)، چونکە وورد و بچووك و ڕوون بوو، بۆیە هەندێ جار قەبارەی نامەکە لە پەنجەیەك درێژتر نەدەبوو.

لەمەی پێشووەوە دەبینین ئەو نیزامە و وردەکارییەی بێبرس داینا بۆ پۆستە، جەنگ بوو بۆ وەستان لەهەر شێك، کە لە بەشەکانی وڵاتدایە، تا بێداری لێ وەربگرن و ئامادە بن بۆ کاتی پێویستی و کتوپڕ.

---

المحروسة) لەلایەکی ترەوە (عزلمولانا السلطان... سلطان الاسلام والمسلمین) بڕوانە: القلقشندی: صبح الاعشی ج١٤ص٣٧١).

١ ـ القلقشندی: صبح الاعشی ١٤ص٣٨٩-٣١٤. کە گرنگترین بەشی کەشتیگەلە، چەند کەشتیەکی گەورە ی جەنگین کە بورج و قەڵایان لەسەر بوو بۆ بەرگریکردن و هێرشبردن ئەو بورجانە لە چەند چینێك پێکدەهاتن و لەچینی سەسەوەیدا سەربازانی تیروکەوان بەدەست دەوەستان، لەچینی خوارەوەی دەریاوانان هەبوون، کۆگای خواردن و خەزنکردنی ئاویشی لەخۆدەگرت.

## ٦- بەهێز کردنی کەشتیگەل و سوپا:

هەوڵە جەنگیەکانی بیبرس لەو سنوورەدا نەوەستان، بەڵکوو هەوڵیدا هێزێکی دەریایی دابمەزرێنێت، کە لە ڕێگرتن لەو دوژمنانەی بەکاری بهێنێت کە لەبەرەی دەریاوە شاڵاو دێننە سەر وڵاتەکەی، لەڕاستیدا بیبرس دامەزرێنەری کەشتیگەلی مەمالیکە، مقریزی ئاماژە دەدات بە زۆری کەشتیگەلی سوڵتان بیبرس لە دەریای نیل و گرنگیدانی بە ڕۆڵی پیشەسازی کەشتی کە لە فستات (میسر)و دوورگەی رەوەز و ئەسکەندەریە و دمامیت بوو تا ئاستێك خۆی سەرپەرشتی بنیادنانی (شەوانی)[1] دەکرد و بە ئامێر ئامادەی دەکرد و لە دەریادا بەکاری دەهێنا،[2] مقریزی لەوبارەیەوە گێڕانەوەیەکی جوان دێنێت کە بەڵگەیە لەسەر ئاستی گرینگیدانی بیبرس بە کەشتیگەل، ئەویش ئەوەیە کە نێردراوانی پاشای قوبرس

لەساڵی٦٨٠ ك.دا هاتن بۆلای سوڵتان بیبرس بۆ سکاڵاکردن لە بەرپرسی عەککا، سەیریانکرد لەنێو دار و تەختەدا

سەرقاڵی پیشەسازی کەشتیە و لەگەڵ پیشەساز و سەرکردەکاندا کاری دەکرد، ئەوانیش بەوەی کە بینیان ترسان.[3]

بیبرس سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو تەختانە دابین بکات کە بۆکەشتیسازی دەشێن، بۆیە ڕێی لە خەڵك گرت کە کڕین و فرۆشیان پێ بکەن، لە قسەی مێژوونووسانی وەك ئەسعەدی کوڕی مەتاتی (کۆچکردووی ١٣٠٩ ز) و عوسمانی کوڕی ئیبراهیمی نابلسی(کۆچکردووی ١٢٥٨ ز) و مقریزی (کۆچکردووی ١٤٤٢ ز) بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو دارستانەی ئەکاسیا کە تەختەکەی بۆ دروسکردنی کەشتی بەکار دەهات و بەزۆری لە باشوری دەلتا و سەعیدی میسر و نیمچە دوورگەی سینا هەبوو لە سەردەمی فاتیمی و ئەیوبیەکاندا[4] بەرەبەرە لە

---

١ ـ المقریزی: الخطط ج٢ ص١٨٠، ٢٩٧)

٢ ـ شەوانی: کۆکراوەی شینی یان شونی یان شنە یە.

٣ ـ المقریزی: الخطط ج١ص٦٠١

٤ ـ الاسعد بن مماتی: القوانین و الدواوین ص ٣٤٥-٣٤٨.

کۆتاییەکانی سەردەمی ئەییوبیدا کەمی دەکرد و گەورە و بچووك بۆ پێویستی شمەکە پێویستیەکانیان خەڵکی دەیانبڕین و لەماڵەکانیاندا بەزۆری دەیانسووتاندن[1] بەجۆرێك لەسەدەی سیازدەی زایندا تا ئەوەی لە دەوری قاهیرە لە مەتەریە و قلیوب و جیزەدا بەتەواوەتی نەما، پاشان لە سەعید لە بهنساویە و ئەشمونین و ئەسیوت و ئەخمیم و قوص نەما لە کۆتایەکانی سەدەی چواردەی زایندا و بوو بە زەویەکی کشتوکاڵی، پاشان مقریزی لەسەدەی پازدەی زایندا دێت و بەمجۆرە پاڵپشتی دەکات (هەمووی نەما و دەستگیرا بەسەر ئەو درەختانەدا و هیچی لێ نەمایەوە).[2]

لێرەوە دەبینین میسر کاتێك زاهر بیبرس لە نیوەی دووەمی سەدەی سیازدەدا فەرمانڕەوایی دەکرد، هیچی لێ نەمابوویەوە جگە لە چەند پاشماوەیەکی کەناری دارستانی ئەسیکا لە دەوری شاری سویس لە بیابانی سینادا[3] کە بەگشتی بەشی پێویستی دەوڵەتی نەدەکرد، ئەویش پشتگیری ئەمە دەکات ئەوەیە کە بیبرس دار و تەختەی ناوچەی صاڵحی، قۆرخکرد بۆ دروستکردنی کەشتی و ڕێگرتنی خەڵك لە کڕین و فرۆشتنی .

هەروەك ناچار بوو درەختێك لەدوورگەی ڕەوخە ببڕێت بۆ بەکارهێنانی تەختەکەی لە دروستکردنی کەشتیگەلی نوێدا لەجیاتی ئەو کەشتیگەلەی بە ڕێی کردبوو بۆ دوورگەی قوبرس، لەوێ لە کەناراوەکانیدا لەساڵی ١٢٧١ ز.دا تێکشکا بوو.

ئەو دەستەواژەی کە بیبرس لە نامەکەیدا ناردی بۆ پاشای قوبرس و تیایدا دەڵێت: (ئێوە ئەسپەکانتان کەشتین و کەشتیەکانی ئێمەیش ئەسپن)[4] بەڵگەی

---

١ – عثمان بن ابراهيم النابلسى: كتاب لمع القوانين المخصة فى دواوين اديار المصرية، ص٤٥–٦٠منشور فى مجلة الدراسات الشرقية بدمشق، العدد١٦ سنة ١٩٥٨–١٩٦٠ .

٢ ـ المقريزى: الخطط ج١ ص١١٠، ج٢ ١٩٤.

٣ ـ سعيدي شور: مدينة السديس منذ الفتح العربى الى بداية العصر الحديث ص٧٧(الفصل الثانى من كتاب تاريخ السديس سلسلة بلادنا)(القاهرة ١٩٦٦).

٤ ـ المقريزي: السلوك ج١ ص٥٩٤ حاشية ٥" عبد المنعم ماجد" نظم دولة سلاطين المماليك رسومهم فى مصر ص١٩١

دەستەوسانی کەشتیگەلی مەملوکیە لە نەبوونی تەختە، هەرچۆنێك بێت بیبرس هەوڵیدا بە هاوردەکردنی تەختە و ئاسن لە ئاسیای بچووك[1] و ئیالیاوە ئەو دەستەوسانیە قەرەبوو بکاتەوە و توانی کەشتیگەلێکی پەنجا کەشتی ئامادە بکات.[2]

گرنگیدانی بیبری بە بەهێزکردنی سوپاکەی کەمترنەبوو لە گرنگیدانی بە کاروبارە جەنگیەکانی پێشتر، بۆیە مەمالیکی زۆری لە ڕەگەزی خۆی(قفجاق) کڕی[3] بە قسەی قلقشندی ئەگەر هاوڕەگەز بوونایە، لەسەردەمی بیبرسدا حەزیکرد قفجاقەکان زیاد بکات تا ئەوەی میسر پڕبوو لەوان و ئەوانی گرتەوەو سەرکردەکانی سوپاکەی لەوان بوون و گەورەکانی خاکەکەیشی لەوان بوون، ئیسلام سوپای هەڵوێستی ئەوانی دەکرد لەپاراستنی ئاییندا چونکە ئەوان دڵسۆزانە لە پێناو خوادا جیهادیان دەکرد).[4]

قلقشندی دەگێڕێتەوە کە زۆربەی ئەو مەمالیکانە لە قبشاقەکان بوون کە مەبەست پێی هۆزی زێڕینە، مقریزی دەگێڕێتەوە کە ئەوانە بەتایبەت لە وڵاتی تورکستانەوە دەهاتن، دەتوانین بە ئاسانی ئەو دوو گێڕانەوەیە پێکەوە بگونجێنن چونکە هۆزی زێڕین دەستیانگرتبوو بەسەر بەشێکی تورکستاندا کە ئەویش

---

١ـ بەتوتە (ق ١٤ م) دەکێڕێتەوە کە شاری (علایا) لەسەر کەناراوی ئەنادۆل تەختەی زۆر بوو و لەوێوە دەبرا بۆ ئەسکەندەریە و دمیاط (رحلة ابن بطوطة ج٣ ص٢٥٧) هەروەها ئیبن ئیاس دەکێڕێتەوە کە وا باو بوو کۆمەڵێك لە سەرکردە و سەربازەکان بە کۆمەڵە کەشتیەکەوە دەچوون بۆ شوێنێك کە ناسرا بوو بە جون یان (الجون) بۆ ئامادە کردنی تەختە، ڕای زیاتر وایە مەبەست بە (جون) شاری بیری تورکیە لەسەر کەناراوی ئەنادۆڵ (ئاسیای بچووك) بڕوانە: ابن ایاس: ضفات لم تنشر فی بدائع الزهور ص٣٧ حاشت، بدائع الزهور ج٢ ص ـ ١٨٢

٢ ـ المقریزی:السلوك ج١ ص٤٤٧

٣ ـ دیارە بیبرسی لە وڵاتی قفجاق یان قبشاق لەدایك بووە لەساڵی ١٢٢٣ز/ ٦٢٥ك. دا و بەشێك لەژیانی سەرەتای خۆی لەوێ بەسەر بردووە تا ئەوەی لە ئەنجامی هەڵمەتێکی مەغۆلدا بۆ سەر ئەو وڵاتە لە ساڵی ١٢٤٢ز/٦٤٠ك.دا فرۆشراوە بە بازرگانێکی کۆیلە. بڕوانە (دائرة المعارف الاسلامیة، مادة بیبرس الاول).

٤ ـ القلقشندی: صبح الاعشی ج٤ص٤٥٨

باکووری خوارزم و زەوی دەشتی باکوور بوو، بۆیە قلقشندی پێی دەڵێت (مملکة توران خوارزم و القبشاق)[١] ئەگەر بگەینە ئەوەی ئەو مەمالیکانە لە بنەڕەتێکی تورکستانین، لە ڕاستیدا ئەوان لە وڵاتی قبشاق لە باشووری فلجاوە هاتوون بۆ میسر.

هەرچۆنێك بێت، ئەوا پەیوەندی باشی نێوان بیبری و بەرەکەخان ئاسانکاری کرد بۆ بەدەستهێنانی ئەو مەمالیکە قفحاقانە تا کەسانی تر، بەڵام بەدەستهێنانیان ئەوەی دەخواست کە بگەنە کەناراوەکانی دەریای ڕەش بە ئاسانی، بیبرس بەهۆی باڵوێز و دیاریەکانیەوە زانی لە ئیمپراتۆری بیزەنتی میخائیل بالیولوجەوە ڕەزامەندی بەدەستبخات بۆ تێپەڕینی دوو کەشتی میسری پڕ بە مەمالیك لەڕێگەی بسفۆڕەوە بۆ دەریای ڕەش کە لە یەك ساڵدا هەبوو یەکجار بێن و بچن.[٢]

پاشای وڵاتی قفجاق چاکترین وڵات بوو بەدەستهێنانی ژمارەیەکی زۆری مەمالیك، چونکە گەلانی ئەو ناوچە سەرەتایی و کۆچەر بوون و کۆچی زستانە و هاوینەیان هەبوو لەبەر کەمی لەوەڕگا و سەختی کەش و هەوا وبەدەست بەرتەنگی ژیان و کەم خۆراکەوە دەیانناڵاند.

ئاسایی بوو هەندێ کەس کور و کچی خۆیان بفرۆشن یان بۆ نەهێشتنی برسێتیان بیانگۆڕنەوە بە خۆراك، وێڕای ئەوەیش ئەو قفجاقانە شاڵاویان دەبردە سەر شەرکەس و ڕووس و مەجەر و لانە دراوسێکانیان و چەندیان بتوانیایە لێیان بەدیل دەگرتن تا لەبازاڕی کۆیلەی سپیدا بیانفرۆشن، پاشان شاری صرای[٣] نکەی

---

١ ـ القلقشندی:صبح الاعشی ج٤ ص٤٦٩

heyd ; histoire de commerce du lerant au loyen ـ ٢ agetome ll.p.٥٥٦

٣ ـــ سرای دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای دەریای قەزوین و لەسەردەمی بەرەکەخاندا دروستکرا، سەرچاوە ئیسلامیەکان وا وەسفی دەکەنکە شارێکی گەورەیە و بازاڕ و حەام و مزگەوتی هەیە و چەند دەستەیەکی جیاوازی خەڵکی تێدابوو وەك ڕووس و مەغۆل و ڕۆم و شەرکەس، هەردەستەیەکەیان لە لەلایەکەوە بوون، بازرگانە نامۆکانی خەڵکی عێراق و میسر و شام و ناوچەکانی تر لە شوێنێکی تایبەتدا دەژیان کە بە شوورە چواردەور درابوو تا ماڵ و

دەستەڵاتیان بوو بەپێگەیەکی گەورەی بازرگانان و کۆیلەی تورك و شەرکەسی و مەجەر و لان، ئەمەیش چەند نهێنیەکی زۆری ئەو ڕەگەزانەن کە چینی مەملوکی لە میسردا لێ پێکدەهات، لەو ڕەگەزانەوە کە ڕەگەزی قفجاقی تێدا زۆر بوو، بیبرس ڕیزەکانی سوپاکەی خۆی پڕکرد تائەوەی گەیشتنە چل هەزار سوار، مێژوو نووسان لەوبارەیەوە پێمان دەڵێن کە کۆمەڵێك لە مەغۆلی قفجاق لەسەردەمی بیبرسدا بە پەنا خوازیەوە هاتن بۆ میسر و چوونە ناو سوپاکەیەوە، ئەو کۆمەڵانەیش ناسران بە (وافیدی) و (وتەری موستەئمەنە)، لەسەرەتادا لەساڵی ١٢٦ ز.دا (کۆتاییەکانی ساڵی٦٦٠ك) دووسەد سوار دایانە پاڵ میسر، پاشان لەساڵی ١٢٦٣ز.دا هاتن بۆ میسر.

بیبرسیش پێشوازی لەو سەربازانە کرد و بەرگی کردە بەریان و ڕێزی گرتن و لە کۆمەڵە بینایەکدا داینان کە بەتایبەت بۆ ئەوان دروستکرا بوو لەنزیك (اللوق) لە دەرەوەی شاری قاهیرە لەوکاتەدا، پاشان گەورەکانیانی کرد بەسەرکردە و ئەوانی تریشی لەناو دەریایی و مەمالیکەکانی خۆیدا دانا ئەو تەتارانە لەناو خۆیاندا ڕێکخستن و نەریتی خۆیان هێنا کە کاریگەریەکی گەورەیان هەبوو لە ڕێکخستنە مەملوکیەکاندا بە بەڵگەی وتەکەی مقریزی:

(پاشان لە ڕۆژانی مەلیك زاهر بیبرسدا وافیری زۆر بوون و خاکی میسر و شام پڕبوو لەدەستەی مەغۆلەکان و نەریت و ڕێ وشوێنەکانیان بڵاوبوونەوە).[1] لەسەر ئەو بنەڕەتە سوپای مەمالیك لە چەند دەستەیەکی نامۆیان پێکدەهات کە

---

سامان و شمەکیان پارێزراو بێت. کاتێك ئیسلام لەو بەرانەدا بڵاوبوویەوە ئەو شارە بوو بە جێ نیازی زانیان و ئەدیبانی وەك قوتبەدینی ڕازی و سەعدەدینی تەفتازانی و کەسانی تر، بڕوانە: الرمزی، تلفیق الاخبار ج١ ص٤١١-٤١٣" القلقشندی ج٤ ص٤٥٧).

١ ــ المقریزی: الخطط ج٢ ص٢٢١، بولیاك بۆ ئەمە نمونەیەك دێنێتەوە و دەڵێت(مەمالیك ڕێبازی سەرەکی ئیقتاعییان لە ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی وەرگرت، دواتر یاسا ئیقتاعییەکانیان لەڕێی دادوەران و بەپێی یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی نەبوو، بەڵکوو لەڕێگەی پەردەدار و لەسەر بنەمای یاساکانی جەنگیزخان بوو، بڕوانە poliak;some notes on the feudal system of the mamlouks,j,r,a,s,١٩٣٧p.٩٧

سەرکردەیەکیان سەرکردایەتی دەکردن کە بە ئەتابەگی عەسکەر ناسرابوو، وەك پێشتریش وتمان ئەتابەگ بەواتای میسری بە باوك دێت، دواتر واتای سەرکردەی سوپای دەدا بەو دەربڕینەی کە ئەو باوکی سەربازگەیە، چونکە ئەو واتا لەگەڵ ئەو مۆرکەی دەوڵەتی مەمالیکدا دەگونجێت کە بە پلەی یەکەم پشتی دەبەست بە پەیوەندی نێوان مامۆستا و مەمالیکەکەی، ئەو دەستە و تاقمانەیش کە سوپای لێ پێکدەهات بەمجۆرە بوون:

' مەمالیکی سوڵتانی: ئەمە بریتیبوون لە مەمالیکەکانی سوڵتانە پێشووەکان، پاشان مەمالیکەکانی ئەو سوڵتانەی کە بۆ خۆی دەیهێنان، بۆیە بەناوی ئەجلاب و جەلبابە ناسرابوون، لەوانەیش دەستەی خاسکی یان ئەحداث کە تایبەتمەندیان لە مەمالیکی سوڵتانی ئەوە بوو کە ئەندامەکانی هەر لەتەمەنی بچووکیەوە دەهێنرانە خزمەت سوڵتان، ئەویش ئەوەبوو کە پەروەردە و ئازادکردنیانی لەخۆ دەگرت، مەمالیکە سوڵتانیەکان لەهەموو سەربازانی تر شان وشکۆیان زیاتر بوو و لە سوڵتان زیاتر نزیك بوون و زەویان زیاتر بوو و سەرکردەکانیش لەوانەوە فەرمانیان وەرگرت، جوندولعەلقە: ئەمانە پیشەگەرانی سەربازان بوون لەنەوەکانی مەمالیك کە ناسرابوون بە(ئەولادوناس) (کوڕانی خەڵك) ئەمانە لەسەر ئەو پارە ئازاد بوون و مەمالیك نەبوون و زۆرینەی سوپا بوون لەکاتی جەنگدا و کاتی ئاشتیدا پیشەگەر و پیشەساز بوون، هەموو چل کەسێك موقەدەمێکیان هەبوو کە دەستەڵاتی بەسەریاندا نەبوو مەگەر تەنها لەوکاتەی کە سوپا دەچوو بۆ جەنگ ئەوان زیاتر لە یەدەگی سوپا دەچوون، بەتێپەڕبونی کات زۆربەی جوندولعەلقە بوون بە خەڵکی میسر، هەروەها جوندولعەلقە لە شامیش هەبوون کە خەڵکی شامیان لەدەست دەگرت و جێگیرایەتی ناوچەکانیان بەسەردا دابەش دەکرا.

مەمالیکی سەرکردەکان: ئەمانە لە مەمالیکی سوڵتانی دەچوون، بەڵام ڕاستەوخۆ سەربە سەرکردەکانیان بوون و ئەو یەکە جەنگیانەیان لێ پێکدەهات کە سەرکردەکان لەگەڵ سوڵتاندا لە کاتی چوونیدا بۆ جەنگ لەگەڵ خۆیاندا دەیانبردن.

بەوجۆرە بیبرس سەرنووسەر و پایتەختە مەملوکیەکانی دەوروبەری دەوڵەتی قایموقۆڵ دەکرد و سوپاو دەستەکانی سوپای ڕێکدەخست و گرنگی بەکەشتیگەل و پۆستە دەدا کە لە گرنگترین پاڵپشتە پێویستیەکانی بنیادنانی دەوڵەتی مەملوکی بوو لەسەر چەند بنەمایەکی جێگیر، بەڵگەی ئەوەیش ئەوەیە کە بیبری بەهۆی ئەو سوپا و کەشتیگەل و قایموقۆڵیانەوە توانی ئەو ڕۆڵە بگێڕێت کە ئەویش ئەرکەکەی سەلاحەدینی ئەییوبی بوو لە جهادی دژ بە خاچپەرستان و هاوپەیمانان لە شام و نەوبە بوو وێڕای جیهادی دژ بە مەغۆل.

## ٧- هەوڵەکانی بیبرس لە لێدانی مەترسی خاچپەرستیدا:

## یەکەم: میرنشینە خاچپەرستیەکانی شام

پێشتر باسی سەقامگیری مەلیك لویسی نۆیەممان لە فەلەستیندا کرد کە هاودەم بوو لەگەڵ ڕۆژانی یەکەمی دامەزراندنی دەوڵەتی مەمالیکدا کاتێك ئەییوبیەکان بەتوندی داوای کورسی دەستەڵاتی میسریان دەکرد و لەگەڵ مەمالیکەکاندا لە جەنگدا بوون، لویسی نۆیەم بەلێزانی خۆی توانی ئەو ململانێیە لە بەرژەوەندی خۆیدا بقۆزێتەوە و ئارامسێکی خۆیەوە شکستی مەنسورە چاك بکاتەوە بەهۆی ئەو سیاسەتە نەرەمەوە لویسی نۆیەم توانی ژمارەیەکی زۆری دیلەکانی سوپاکەی ئازاد بکات و چی ماڵ و سامانی قیدیە هەیە لەکۆڵی خۆی بکاتەوە وێڕای بەدەستهێنانی بەڵێنی سوڵتان ئەیبەك بەوەی ئەگەر دژبە ئەییوبیەکان بداتە پاڵی ئەوا بەیتولمەقدیسی دەداتە دەست، پاشان خەلیفەی عەبباسی دەستی وەردایە بارەکەو ململانێی نێوان هەردوولای یەکلاکردەوە و هیوای خاچپەرستە داگیرکەرەکانی نەهێشت و لویسی نۆیەمیش ناچاربوو بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی و بەبێ هیوایی لەساڵی١٢٥٤ز.دا پاش سەرنەکەوتنی لە گۆڕینی باری سیاسی فەلەستین و پاڵپشتی مەڵبەندی خاچپەرستان تیایدا بەرەو وڵاتی خۆی ملی نا، هەرچەندە توانی بەمانەوەی لەوێ گیانی مەعنەوی نێوان خاچپەرستان لە شامدا بەرزبکاتەوە دوای ئەوەی ڕێگەکانی فریاد ڕەسی سەربازی ئەوروپایان لێ دابڕابوو،

ماوەی دوای کۆچکردنی لویسی نۆیەم تا کاتی دەستەڵاتداری بیبرس بەسەر میسرو شامدا لە (١٢٥٤-١٢٦٠ ز) ماوەی ئارامش و ئاشتی نێوان خاچپەرستان و موسوڵمانانە بەهۆی سەرقاڵبوونی هەریەکەیان بەو گرفتە ناوخۆیانەی خۆیانەوە کە لەبەشەکانی پێشتردا قسەمان لەسەر کرد.

ئەو بارە هێندەی نەبرد کە لەسەردەمی بیبرس و جێگیرەکانیدا بەتەواوەتی گۆڕا، دەبینین سیاسەتی میسری بەرامبەر خاچپەرستان لە شامدا مۆرکی توندوتیژی و ڕقی لەخۆ دەگرت و هۆکاری ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خاچپەرستان دژ بەمەمالیکەکان یارمەتی مەغۆلەکانیان دەدا و وەك ڕێنمونیکەری سوپا شاڵاوبەرەکانیان بۆ سەر زەویە شامیەکان کاریان دەکرد. پێگەی جوگرافیشیان لە شام یارمەتی ئەوەی دەدات چونکە دەرفەتی پێدان تا ئاگاداری جموجۆڵی سوپای میسری و شامیەکان بن و وتیان بە مەغۆلەکان کە ئاسانکاری بۆکردن تا زۆربەی جار نەخشە و پلانەکانی موسوڵمانەکان تێکبشکێنن، بارەکە بەوەیشەوە نەوەستا، بەڵکوو ئێمە چەند میرنشینێکی خاچپەرستی دەبینین کە دەرفەتیان بە کۆمەڵە سەربازگەیەکی مەغۆلی دەدا تا لەبواری هاریکاری سەربازی یان بەرگری هاوبەشی دژ بە موسوڵماناندا بێنە ناو خاکیانەوە بەڵام هێندەی نەبرد کە ئەو سەربازگە مەغۆلیانە زۆرەی جار خواستی خۆیان بەسەر خاچپەرستان و خواستی خانی مەغۆلی لە تەبریز یان مەراغە یان بەغداد بەبەریاندا زاڵبوو.

هەرچۆنێك بێت، ئەو بزووتنەوە فێڵبازانەی خاچپەرستان لە شامدا بێ گومان هۆکاری حەقیقی ئەو سیاسەتە توندە بوون کە بیبرس و ئەوانەی دواتری بەرامبەر بە خاچپەرستان نیشانیان دا، چونکە لایان سەخت بوو لەبەرژەوەندی مەغۆلدا چاویان لە قرەنجەکاندا بێت، بۆیە بڕیاریاندا لە شام دەریان بکەن.

جەنگی نێوان بیبرس و خاچپەرستان لە شێوەی چەند دەستەو یەخەبوونێکی ناوچەییدا دەستیپێکرد، لە قسەکەی مقریزیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بیبرس خۆی لەساڵی١٢٦٣ز.دا چووە بۆ شام و بزاوتەکانی ئەوکاتیشی بەڵگەی ئەوەن کە بیبرس بەناو هێزەکانیدا گەڕاوە و بەشێوەیەکی ستراتیژی تایبەت دابەشی دەکردن

کاتێکیش میرنشینە خاچپەرستیەکان وەفدیان نارد بۆلای و داوای ئاشتی و ئاگربەستیان لێکرد، بەتوندی و بەوپەڕی ڕقیەوە وەڵامی دانەوە کە ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە کە بڕیاری داوە لەگەڵیاندا بجەنگێت.

لەسەرەتاکانی ساڵی١٢٦٥ز.دا بیبرس چویە ناو چەند چالاکیەکی جەنگی بەرفراوانەوە دژبە میرنشینە خاچپەرستیەکانی کەناراو وە دەستیگرت بەسەر شاری قیساریە و دواتر شاری ئەرسوف لە باشووریدا، لەساڵی دواتریشدا١٢٦٦ز.دا بیبرس هێرشی بردەسەر بنکەیەك مەترسیداری ستراتیژ خاچپەرستی لە شامدا کە قەڵای (صفد) بوو کە بنکەی سوارەکانی داویە بوو، پاش جەنگێکی قورس بیبرس توانی دەستیبەسەردا بگرێت، دەڵێن بیبرس پاش ئەوەی بەڵێنی دڵنیایی بە(صفد) داوە دەستیگرتووە بەسەریدا، پاشان بەڵێنەکەی هەڵوەشاندەوەتەوە و فەرمانی دەرکردووە لەبەر چەند هۆکارێکی ناڕوون پارێزەرەکانی بکوژن، ئەمە وای لە سەرچاوە خاچپەرستیەکان کردووە تا تۆمەتباری بکەن بە ناپاکی، لێرەدا هیچ دەرفەتێکی حوکمدان لەبارەی ناپاکیەوە لەگەڵ کەسانێکی وەك خاچپەرستاندا نییە کە ناپاکی بەدرێژایی مێژوویان کاریان بووە، هێندەبەسە چەند لاپەڕەیەکی مێژوویان هەڵبدەینەوە تا چەندین نمونە لەو بوارەدا ببینین.

هەرچۆنێك بێت، کە قەڵای صفد کەوتەدەست موسوڵمانان گورزەرێکی کوشندەی خاچپەرستان کرد و دەروونی خاچپەرستانی تا ئاستێکی زۆر تێکشکاند بەبەڵگەی ئەوەی چەند هێزێك خاچپەرستی بەپەلە ئاگربەستێکیان لەگەڵ سوڵتان بەست لەسەر بنەمای نیوە بە نیوەی لەسەر داهاتی وڵاتیان، جوانترین وێنەیش ئاگربەستی نێوان سوڵتان بیبرس و نێوان شاژنە بیروت ئەزابیلای کچی مەلیك جۆنی دووە ئیبلین بوو کە سەرچاوە ئیسلامیەکان بە(دەبونە) ناویان هێناوە کە ئەمەیش وەرگێڕاوی وشەی بنەماڵەی فەرمانڕەوای ناو بەیروتە (dlbehin).

ئیزابیلا دوای مردنی باوکی لەساڵی ١٢٦ز.دا چوویە سەر کورسی دەستەڵاتی بەیروت و شاخەکانی لوبنان بەوپێیەی کچی گەورەی بوو، ئەو شاژنە بەمنداڵی شووی کرد بە شای منداڵ هێوی دووەمی پاشای قوبرس کە پێش بەستنی

هاوسەرگیری نێوانیان مرد، هێوی سێیەمیش کەوەسی قوبروس بوو هەوڵیدا وەك میراتگرێکی دەستەڵاتی قوبرس بیقۆزێتەوە بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە خاچپەرستەکانی خۆی لە ڕۆژهەڵاتدا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، چونکە شاژنە ئیزابیلا لەساڵی٦٦٧ ك/١٢٦٨ز.دا ئاگربەستێکی دەساڵەی لەگەڵ سوڵتان بیبرسدا بەستبوو و هەرکات بچوایە بۆ قوبرس دەچوو بۆلای سوڵتان بیبرس و دەستەڵاتەکەی خۆی لەوماوەیەدا دەدایە دەست هێوی سێیەم.[1]

قلقشندی دەقی ئەو ئاگربەستەی هێناوە و بەگشتی بەسوودە، چونکە سنووری دەستەڵاتی بەیروت و دەوروبەری لەوکاتەدا دەستنیشان دەکات، تێبینی دەکرێت زۆربەی ناوی شارەکان و زیندوێتیان تا ئەمڕۆیش ماون ئەمەیش دەقی ئەو پەیمانانەیە:

(ئاگربەستی پیرۆزی نێوان سوڵتان مەلیك زاهر روکنەدین بیبرس و نێوان شاژنی شکۆداری بەڕێز فلانەی کچی فلان و فەرمانڕەوای بەیروت و هەموو شاخەکانی و شارەکانی بۆ ماوەی دە ساڵی ڕەبەق، یەکەم ڕۆژی لە پێنج شەممە شەشی ڕەمەزانی ساڵی شەست و حەوتدایە لەسەر بەیروت و ناوچەکانی سەر بە بەیروت کە

---

١ ـ ئەو شاژنە لەساڵی ١٢٧٢ ز/٦٧٠ ك.دا شووی کرد بە پیاوێکی ئینگلیزی ناسراو بە هاموی غەریب کەسەر بە میری ئینکلیزی ئیدواردی یەکەمی پاشای ئینکلیز بوو لە دواتردا، بەڵام هێندەی نەبرد ئەو بیاوە مرد و لەبەر متمانە نەبوونی بە نیازەکانی هێوی سێمی باشای قوبرس کەمێك بێش مردنی وەسیەتی کرد تا زنەکەی و بەیروتی ناوجەی دەستەڵاتی بخاتە ژێر جاودێری سوڵان بیبرس، کاتێك هیوی سێیەم بەمەی زانی هەنکاوێکی دلێرانەی نا بۆ ڕوخاندنی شاژن و بە شوودانی بەو کەسەی کە هێو نیازیەتی، بەڵام بیبرس ناڕەزایی لە ڕوودا نواند و هەڕەشەی کرد کە بێویستە وەسیەتەکە هامو جێبەجێ بکرێتو خێرا ئیزابیلا بکێڕێتەوە بۆ بەیروت، هێویش ناچار بوو ئەوە بکات و ئیزابیلایش باسەوانی مەمالیکی بۆ خۆی دانا و دوای مردنی بیبریسیش ژیا و دووجار شووی کرد و دواتریش لەساڵی ١٢٧٢ ز.دا مرد و فەرمانڕەوایی بەیروتی بەجێهێشت بۆ ئەشیفای خوشکی و بەیروتیش بەردەوام لە دەست بنەماڵی ئیلیسندا بوو تا لەدواجاردا لە دوای ڕووخانی عەککا لەساڵی ١٢٨١ ز.دا بە یەکجارەکی ڕووخا و کەوتە دەست سوڵتان ئەشرەفی خەلیلی کوڕی قلاوون.

لەڕۆژانی مەلیك عادل ئەبوبەکری کوڕی ئەییوب و ڕۆژانی مەلیك موعەزەم عیسای کوڕی و ڕۆژانی کوڕی مەلیك ناسر سەلاحەدینی یوسفی کوڕی عەزیزدا بەوجۆرە کاری پێدەکرا و بنەمای جێگیری سەردەمیان بوو تا کۆتایی ڕۆژانی زاهری بەپێی ئاگربەستی زاهری، ئەمەیش شاری بەیروت دەگرێتەوە لەگەڵ ناوچەکانی سەربە ئەوێدا سنووری جوبەیل لە باکوورەوە بۆ سنووری صیدا لە باشوورەوە کە ئەم ناوچانە دەگرێتەوە: جونیە بەسنوریەوە، عصفوریە بەسنوریەوە، رواوق بەسنوریەوە، سن فیل بەسنوریەوە، ریع و شویف بەسنوریەوە، ئەنتلیاس بەسنوریەوە، جەدیدە بەسنوریەوە، حەسوس بەسنوریەوە،بیشیریە بەسنوریەوە، دکوانە و بورج کراجار بەسنوریەوە و قوینە و نەسرانیە و خلدا بەسنوریانەوە، ناعمە بەسنوریەوە و ڕەئسولفەقیە و وەتانی ناسراو بە شاری بەیروت و چی کەس و هاولاتی و بازرگان وخەڵکی ئەو ناچانەیە ئەوانەی دێن و دەچن لە هەموو ڕەگەزێکەوە کە دێن و دەچن بۆ ولاتی سوڵتان بیبرس کە بریتیە لە:

(حمیرە و ناوچە و قەڵا و شارەکانی و چی تایبەتە بەوێوەن شانشینی ئەنتاکیەو قەڵا و شارەکانی، جبلە و لازقیە و قەڵا و شارەکانیان، حیمسی پاسەوانکراو و قەڵا و شارەکانی و ئەوەی تایبەتە بەوێوە، شانشینی ڕەحبیە و ئەو قەڵا و شارانەی تایبەتن بەوێوە، شانشینی دیمەشقی و ئەو شار و قەڵا و هاوولاتیانەی سەربەون، شانشینی شەقیفیە و ئەو شار و قەڵاو هاوولاتیانەی سەربەون، شانشینی قودس و ئەوەی تایبەتە پێی شانشینی حەلەب و ئەوەی تایبەتە پێوەی، شانشینی کەرکی و شەوبەکی و ئەو شار و قەڵا و هاوولاتیانەی تایبەتن پێوەی، شانشینی نابلوسی و شانشینی سەرفەدی و شانشینی ناوچەی میسر بەهەموو سەرسنوور و قەڵا و ناوچەو شار و کەناراو و وشکانی و هاوولاتی و ناوچانەی تایبەت بەوەو دانیشتوانی هەموو ئەو ناوچانەی ناویان هات و ئەو ناوچانەی تری سوڵتان و وولاتەکەی کە ناویان نەهاتووە و دواتر خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو نوێنەر و کەسانی قەتحیان دەکات، دەچنە ناو ئەم ئاگربەستە پیرۆزەوە کە لە ناوچەکانیدا ڕێکخراوە و هەموو ئەوانەی لەم وڵاتەوە دێن و دەچن پارێزراو و دڵنیا کراو دەبن لە ماڵ و

گیان و شمەکیان لە شازنە فلان و کەسەکانی و هەموو ئەوانەی لە دەستەڵات و گوێڕایەڵی ئەودان لە وشکانی و دەریادا و بەشەو و ڕۆژ و بە وڵاخ و بەلەمیانەوە، هەروەها هاوڵاتیان شازنە فلان و کەسەکانی لەماڵ و گیان و شمەکی خۆیان دڵنیا و پارێزراو دەبن لە سوڵتان و هەموو نوێنەر و کەسەکانی و ئەوانەی لەژێر دەستەڵات و گوێڕایەڵی ئەودان، بەشەو و ڕۆژ و لەوشکانی و دەریادا لە جبلله و لازقیه و هەموو ناوچەکانی وڵاتی سوڵتان و بەلەم و کەشتیەکانی سوڵتان.

نابێت گومرگێك لەسەر ئەو بازرگانانەی نێوانیانیان دابنرێت کە دێن و دەچن جگە لەوەی کە هەیە و تەنها ئەوە دەبێت کە بەردەوام هەبووە و بنەماکانیش لە هەردوولاوە چەسپاون و ئەگەر لایەکیان ماڵێکی نەما یان شتێکی برا و کەوتە بەردەستی ئەوی تر، ئەوا دەگێردرێتەوە، ئەگەر نەبوو نرخەکەی دەدرێتەوە، ئەگەریش نادیار بوو وا چل ڕۆژ ماوەی بۆ دادەنرێت، ئەگەر دۆزرایەوە دەگێردرێتەوە، ئەگەرنا والی ئەو ویلایەتەی کە قسەی لەسەر کراوە سوێند دەخوات، ئەگەر ئامادە نەبوو، ئەوا سکاڵاکەر سوێند دەخوات و داواکەی وەردەگرێت، ئەگەر یەکێك لەنێو ئەو دوولایەنەدا بەهەڵە یان دەست ئەنقەست کوژرا، دەبێت لەبەرامبەر ئەوەدا لە بکوژ وەربگیرێتەوە، سوارە بە سوارە و پیادە بە پیادە و جوتیار بە جوتیار، ئەگەر یەکێك لای یەکێکیانەوە ڕایکرد بۆ لای ئەویتر بە سامانی جگە لە خۆیەوە (واتە دزی و جەردەیی) لەلایەن هەر دوولاوە دەبێت سامانەکە و کەسەکەیش بگێردرێتەوە و بیانوویش نەهێنرێتەوە.

ئەگەر فەرەنجیەك لە بەیروتەوە بچێت بۆ وڵاتی سوڵتان ئەوا لەو ئاگربەستەدایە، ئەگەر گەڕایەوە بۆ جگە لەوێ ئەوا لەو ئاگربەستەدا نیە.

شازنە فلان هیچ کەس لە فرەنجیەکان بە جیاوازییانەوە لەخۆ ناگرێت کە بەرەو وڵاتی دەچن لە بەیروت و ناوچەکانیەوە، ڕێ لەوەیش دەگیرێت و هەموو کەسێکی خراپ کە دزە بکات دەگێردرێتەوە وڵات لە هەردوولاوە لە دەست تاوانبار و خراپەکاران پارێزراو دەبێت.

بەوجۆرە ئاگربەستی سوڵتان بەسترا و بڕیاردرا کار بەم ئاگربەستە بکرێت و بە بەڵێنەکەی پەیوەست و وەفادار بن لەلایەن هەردوولاوە تا کۆتا ماوەی و تێپەڕبوونی کات هیچکات هەڵیناوەشێنێتەوە و مەرجەکانی ناگۆڕێت و بە مەرگی هیچکامیش هەڵ ناوەشێتەوە.

لەکاتی هەڵوەشاندنەوەی ئاگربەستەکەدا بازرگانەکانی هەردوولا بۆ ماوەی چل ڕۆژ دڵنیا و پارێزراو دەبن و ڕێگە لە کەسیان ناگیرێت تا بگێڕدرێتەوە بۆ ناوچەی خۆیان، بەمە ئاگربەستە پیرۆزە هێڵی پیرۆز بە بەڵگە دەگرێتەوە تیایدا و خوایش پشت و پەنایە لە مێژووی ئەوەندەدا.[1]

لەساڵی١٢٦٨ز./٦٦٦ک.دا بیبرس دەستیگرت بەسەر شاری یافای باشووردا، پاشان لە هەمان ساڵدا گورزێکی کوشندەی ئاڕاستەی گرنگترین میرنشینی خاچپەرستی کرد کە ئەویش ئەنتاکیە و لەوپەڕی باکوورەوە، مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە بەسێ دەستە هێرشی بردۆتە سەر: یەکێکیان بەرەو بەندەری سویدیە تا پەیوەندی نێوان ئەنتاکیە و دەریا بپچڕێت لەترسی کەشتیگەلی دوژمن، دووەمیش ڕێڕەوەکانی نێوان قلیقلە و شامی دەگرت تا ڕێ نەدات فریاگوزاری لە ئەرمینیای بچووکەوە بگات، سێیەمیش هێزی سەرەکی بوو بەسەرکردایەتی بیبرس خۆی کە هێرشی بردە سەر شارەکە و لەساڵی١٢٦٨ز.دا دەستی بەسەردا گرت، لە وتەکەی نوەیریەوە تێدەگەین بیبرس پێش ئەوەی پێشڕەوی بە هێزەکانی بکات بەرەو میرنشینی ئەنتاکیە،وای نیشان داوە دەیەوێت بەرەو تەرابلوس بڕوات و گەمارۆی تەرابلوسیشی دا، بۆیە بەرپرسی ئەنتاکیە (بوهمندی شەشەم) بە کەشتیگەلەکانیەوە چوو تا ڕزگاری بکات.

ئەوکات بیبرس چادر و شمەکەکانی خۆی لە تەرابلوس بەجێهێشت و وای نیشاندا کە ترساوە و شکستی خواردووە و یەکسەر بەرەو ئەنتاکیە چوو و بەو شێوەی پێشتر باسمانکرد دەستی بەسەردا گرت، لەکاتێکدا خەڵکی تەرابلوس دەیانوت:(زاهر بیبرس لە ئێمە ترسا).[2]

---

١ ـ القلقشندی:صبح الاعشی ص٣٩-٤٢

٢ ـ النویری: الالمام بماجرت به الاحکام المقضیة فی وقعة الاسکندریة، ورقة ١٦٩

لەم دەقانەوە تێدەگەین کە بیبرس هەوڵی نەداوە لەکاتی هێرش بردنە سەر ئەنتاکیە کەشتیگەلەکەی خۆی بەکار بهێنێت، بەڵکوو لەو کارەیدا پشتی بەهێزی وشکانی بەستووە، بە بەڵگەی ئەوەی هەوڵیدا یەکەمجار کەشتیگەلی ئەنتاکیە لە جەنگەکە دوور بخاتەوە، بەمەش شارەکەی بۆ گیرا.[١]

هەرچۆنێك بێت، ڕووخانی میرنشینی ئەنتاکیە لە ڕاستیدا کارەساتێکی گەورەی بوو بۆ هێزەکانی خاچپەرستیەکان، چونکە بەپێی پێگە جوگرافیەکەی پاڵپشتێکی بەهێزی دەوڵەتی خاچپەرستی بوو هەر لە سەرەتاکانی جەنگی خاچپەرستەکانەوە، سەرچاوەکانیش ئاماژە بەو نامەیە دەکەن کە بیبرس نوسیویەتی بۆ بوهمندی شەشەمی بەرپرسی ئەنتاکیە کە ئەوکات لە میرنشینی دووەمی خۆی لە تەرابلوسی لە باشووری ئەنتاکیەوە بوو.

ئەو نامەیە پڕبوو لە دەستەواژەی گاڵتە و سووکایەتی پێکردن، گرنگ لامان ئەوەیە کە باری خاچپەرستان تا چەند گەیشتوەتە لاوازی تا ئەوەی بیبرس توانی دەستەواژە و دەربڕینی لەوجۆرە ئاڕاستەی بەرپرسی گەورەترین میرنشینی خاچپەرستی شامی ئەو کاتە بکات.

دوای ئەوە بیبرس لەساڵی١٢٧٠ز/٦٦٩ك.دا هێرشی بردە سەر میرنشینی تەرابلوس و دەستیگرت بەسەر ئەو دەروازانەی بەچواردەوری شارەکەدا بوون کە گرنگترینیان قەڵای کوردان و قەڵای عەکار بوون، ئیتر بەمە دەیتوانی گەمارۆی خودی شاری تەرابلوس بدات، بەڵام هەواڵی گەشتنی هەڵمەتی هەشتەمی خاچپەرستی لە فەڕنساوە بە سەرکردایەتی لویسی نۆیەم گەشت. ئەمە تەرابلوسی لەو سەرنجامە ڕزگار کرد، چونکە سوڵتان بیبرس خێرا بەشوێن پێی خۆیدا گەڕایەوە بۆ میسر، چونکە لەوە دەترسا پاشای فەڕنسا جارێکی تر چیرۆکی

---

١ ــ بیبرس لە ئەنتاکیە دەستکەوتێکی زۆری دەستکەوت تا ئەوەی دەڵێن ب تاسپارە لەنێوان سەربازاندا دابەشکرا، هەروەك زۆری دیلەکان گەیشتە ئەوەی هەرکەس دیلێکی هەبوو و بچووکەکەیان بە دوانزە درهەم دەفرۆشرا و کەنیزەکێکیش بە پێنج درهەم دەفرۆشرا، السلوك ج١ ص ١٤٧.

مەنسووره دووباره بکاتەوه، بۆیه گرنگی بەوه دەدا بەشوێن هەواڵی ئەو هەڵمەتـەدا بڕوات و باری ئامادەسازی له بەندەر و سەرسنووره میسریەکاندا ڕاگەیاند.

پاشـای فەڕەنـسایش دەیویـست ئاڕاسـتەی ئەوهەڵمەتـە خاچپەرستیانە بـەرەو پێگە ئیسلامیەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بێت، بـەڵام شـارل دی ئـەنجۆی بـرای کـە پاشای دوورگەی سقلیه بوو ویستی ئـەو هەڵمەتـە بـۆ پاڵپـشتی دەسـتەڵاتی خـۆی بـەکار بهێنێت بـەوەی دەست بەسـەر ناوچـەی تونـسدا بگرێت کـە ئـەوکات لـەژێر دەسـتی حەفـسیەکاندا بـوو، سەرچـاوه فەڕەنـسیەکانیش هۆکـاری ئـەو هەڵمەتـە دەگێڕنەوه بۆ هۆکارێکی تۆڵە سەندنی شەخسی جا ئەبولقاسمی رعینـی قـەیرەوانی ناسراو بە ئیبن ئەبی دینار دەڵێت:(هۆکاری هەڵمەتی فرەنسیس بـۆ تـونس ئەوەیـە کە دەگێڕنەوه ڕۆژێك لـەلای خەلیفـە موستەنـسیر بیلاهـی حەفـسی نـاوی هـاتووه، ئـەویش وتویـەتی ئـەوه ئـەو کەسـەیە کـە ئەوانـە گرتیـان و بەریانـدا (مەبەسـتی مەمالیکەکان بوو) ئەمەش گەیشتەوه دەم فرەنسیس(واتـە لویـسی نۆیـەم) ئـەویش ڕقی هەڵگرت و بڕیاریدا هەڵمەت بباتە سـەر تـونس)[1] لەڕاستیدا ئـەو گێڕانەوەیـە — ئەگـەر ڕاسـت بێـت— پێناچێت تـەنها هۆکـاری ڕاسـتەوخۆ بێـت، بـەڵکوو هۆکـاری سەرەکی دەگەڕێتەوه بۆ گرنگی هەڵکەوتەی تونس سەبارەت بـە سـقلیە کـە شـارلی برای لویس فـەرمانڕوایی دەکـرد هێنـده بەسـە لـەوبارەوە بـیر لـەوە بکەینـەوە کـە هەڵمەتی موسوڵمانان بۆ سقلیه لەسەردەمی ئەغلەبیەکان لـە تـونس و سەردەسـتی دادوەری قەیرەوان ئەسەدی کـوڕی فـورات لەسـاڵی٢١٢ ك/٨٢٧ ز.دا بـووه، هـەموو ئەمانە ڕاڤەی مەترسی پێگـەی تـونس لەسـەر سـقلیە دەکـەون، بۆیـە شـارل تـوانی لویسی برای ڕازی بکات تا هەڵمەتەکە بەرەو تونس بگۆڕدرێت.

کەشتیە فەڕەنـسیەکان کـە گەیـشتنە کـەناراوی تـونس، لویـسی نۆیـەم تووشـی تایەکی توند بوو و بەوهۆیەوه مرد و شارلی بـرای سـەرکردایەتی هەڵمەتەکـەی گرتـە دەست و بەپێی خواستەکانی هەنگاوی دەنا تا ئەوەی مۆرکـە خاچپەرستیەکەی لێ دارنـی، دواجـار چـەند دانوسـانێکی لەگـەڵ خەلیفـە موستەنـسیربیلاهی حەفـسی

---

[1] - ص ١٢٩.

ئەنجامدا و تیایدا خەلیفە بڕیاریدا بەرامبەر بە پاشەکشەی فەڕەنسیەکان بڕێك پارە بدات، بەوجۆرە هەڵمەتەکەی بیٚ هیوا و بەو ئەنجامە بچووکەوە گەڕایەوە و زۆربەی بەشدار بووانی تووڕە کرد.

سوڵتان بیبریسیش دوای ئەوەی لە ئەنجامەکانی ئەو هەڵمەتە خاچپەرستیە دڵنیا بوو، میسری بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆیە سەرلەنویٚ لێدانی خاچپەرستان لە تەرابلوس، لەساڵی ١٢٧١ ز.دا بوو کە تیایدا بوهمند هەواڵی خواستی ئاشتی و ڕێککەوتنی بۆ سوڵتان بیبرس نارد، ئەمە لەکاتێکدا هەواڵی هاتنی هەڵمەتێکی خاچپەرستی ئینگلیزی بەسەرکردایەتی میر ئیدوارد بۆ عککا هات، بۆیە بیبرس ناچار بوو داواکەی بوهمند قبوولٚ بکات و ڕێککەوتنێکی دەساڵەی لەگەڵدا ببەستێت.[1] ئەوەی جێی حەزی بیستنە لەوبارەیەوە هاتووەکە لەکاتی دانوستانەکەی نێوان نوێنەرانی بیبرس و بوهمندی شەشەمدا بیبرس خۆی لە نێو ئەندامانی وەفدەکەیدا شاردبوویەوە و لەبەرگی خزمەتگوزارێکدا بوو تا بەئازادی بەنێو قەڵاکانی تەرابلوسدا بگەڕێت و لایەنەکانی هێز و لاوازی بزانێت وەك ئاسانکاری بۆ فەتحکردنی لە دواتردا. ئەو دلێریەی بیبرس هەیبوو وایکرد هەوڵێکی تری دلێرانە بدات، کەمێك پێش ئەوەش لەساڵی١٢٧٠ ز.دا کەشتیگەلێکی نارد بۆ هێرشبردنە سەر دوورگەی قوبرس کە شا هێوی سێیەم لوزجینای فەرمانڕوایی دەکرد کە بە خواستە خاچپەرستیەکانی ناو شام و دوژمنایەتی توندی بۆ دەوڵەتی مەملوکی ناسرا بوو، بەڵام زۆربەی کەشتیگەلەکە لەوپەڕی پەژارەوە لە کەناراوی دوورگەکەدا بە هۆی گەردەلولێکی توندەوە تێکشکا.

---

١ ـ ئیدواردی یەکەم پاشای دواتری ئینگلتەرا بوو، کە بەهێزێکی بچووکی دەهەزار جەنگاوەریەوە بە هیوای هاریکاری لەگەڵ خانی مەغۆلی فارس ئوبغای کوڕی هۆلاکۆ بەرەو شام هات تا هێرش بباتە سەر شام و میسر، بەڵام ئەو پرۆژەیە ئەنجامێکی وای بەدی نەهێنا، چونکە ئەبغا سەرقاڵیجەنگی مەغۆلەکانی تورکستان بوو و خودی ئیدواردیدیش لەلایەن حەشیشەوە کە بە خەنجەرێك لێی دا، بەڵام نەی کوشت، ناچار دوای بەستنی ئاگربەستێك لەگەڵ بیبرس بۆ ماوەی دە ساڵ بەرەو وڵاتی خۆی گەڕایەوە.

وێڕای ئەوەی پاشای قوبرس هەوڵیدا شکستی ئەو هەڵمەتە بکاتە سەرکەوتنێکی گەورەی خاچپەرستی، بەڵام بەڕوونی دەبینین کە ئەو شکستە کاری نەکردۆتە سەر بیبرس بەرامبەر بە خاچپەرستان هەروەك گیانی مەعنەوی خاچپەرستانی شامی بەرزکردۆتەوە بە بەڵگەی ئەوەی ئەوان سوور بوون لەسەر دانوستان لەگەڵ بیبرس تا ئاشتی و ڕێککەوتنی لەنێوان بیبرس و میرنشینە خاچپەرستیەکاندا بەسترا، مەرجەکانی ڕێککەوتنەکە بەڵگەی ئەوەن کە هەردوولا پێویستیان بەو ئاگربەست بووە، چونکە هەرکامیان مەرجیان دانا کە مردنی هەرکامیان ڕێککەوتنی نێوانیان لادەبات، بارەکە بەوجۆرە بەردەوام بوو تا مردنی بیبرس لەساڵی ١٢٧٧ ز.

## دووەم: ئەرمینیای بچووك.

بە ئەرمینیای بچووك ناسراوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەرمینیای کۆندا جیا بکرێتەوە، ئەرمینیای کۆن دەکەوتە ناوچەی شاخاوی باشووری قەوقاز و دەریای ڕەش، واتە نێوان دەریای ڕەش و وڵاتی فارس و عێراق لە ڕۆژهەڵاتەوە و وڵاتی ڕۆم لە ڕۆژئاواوە، ئەو ناوچە لەبەر بوونی ڕێی بازرگانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا قازانجێکی زۆری دەستکەو، بەڵام دواتر ئەو ڕێگەیە لەسەدەی دەی زاینیدا بەرەو باشوور گوازرایەوە و بە حەلەب و ئەنتاکیە لە باشووری شامدا تێدەپەڕی، ئەمەش لەبەر سەختی ڕێی کۆن کە بە شاخەکانی ئەرمینیادا بەرەو دەریای ڕەش تێدەپەڕی.

بێگومان ئەو گۆڕانە نوێیە، گرنگی ئابووری لەدەست ئەرمینیا سەندەوە و بەرەبەرە ڕووی لە لاوازی کرد تا ئەوەی دەوڵەتی بیزەنتی لەسەدەی یازدەهەمدا دەستی بەسەردا گرت.

بەڵام ئەرمەنەکان کە ڕەگەزێکی ئابووری خەباتکار بوون، خۆیان نەدایە دەست ئەو بارە و وڵاتی خۆیان بەجێهێشت و لەگەڵ گواستنەوەی ڕێگەی بازرگانی لە شوێنێکدا ئەوانیش بەرەو باشوور چوون لەلایەکی تریشەوە فشاری کۆچی سەلجوقیەکان و مەغۆلەکان هەبوو، ئەوان لە باشووری ئەنادۆڵ و قلیقلە واتە لەناوچەی نێوان ڕەها لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ئەنتە لە ڕۆژئاواوە نیشتەجێبوون لەوێ لە

باشووری ئاسیای بچووکدا شانشینی ئەرمینیای بچووکی ناسراو یان لەسەردەمی جەنگی خاچپەرستی و مەمالیکدا دامەزراندو شاری سیسانی کرد بەپایتەختی خۆیان.

ئەو شانشینیە مەسیحیە ڕۆڵێکی مەترسیداری دژ بە دەوڵەتی مەملوکیەکان لە میسر و شام بینی، چونکە بە هاریکاری میرنشینە خاچپەرستیەکانی شامەوە نەوەستا، بەڵکوو لەگەڵ مەغۆلەکانی فارسدا هاوپەیمانی بەست و هۆلاکۆ و ئەبغای کوڕیشی هاندەدا تا هێرش بکەنە سەر شام و میسر، ئەمە لەپاڵ ئەو گەمارۆ ئابووریەی بەڕێگری ناردنی تەختە و ئاسن لە ئاسیای بچووکەوە بۆ میسر لەسەر دەوڵەتی مەمالیکەکان دانابوو.

سوڵتان بیبرس ناچار بوو لەگەڵ شانشینی ئەرمینیای بچووك هەمان سیاسەتی توند و تیژی بگرێتە بەر کە لەگەڵ میرنشینە خاچپەرستیەکانی شامدا گرتیەبەر و لەساڵی ١٢٦٦ ز.دا هەڵمەتێکی تەمێکردنی بەسەرکردایەتی میر قلاوون بۆ نارد و هەڵمەتی بردەسەر شارە سەرەکیەکانی وەك سیس و ئەنتە و تەرسوس و مسیسە و تیایدا بۆ ماوەی بیست ڕۆژ خراپە و کوشت و بڕیان نایەوە و دواتر بە دەستکەوتێکی زۆرەوە و گرتنی ژمارەیەکی زۆری دیلەوە گەڕانەوە، لەنێو دیلەکانیشدا کوڕی هەیسومی یەکەمی پاشای ئەرمینیا بوو، ئەویش ناچار بوو بۆ ئازادکردنی کوڕەکەی چەند ڕێگەیەکی گرنگی ستراتیژی بداتە دەست مەمالیکەکان کە بەسەر ڕێگەکانی پەیوەندی نێوان ئەرمینیا و هاوپەیمانە مەغۆلەکانی دوورگەی باکووری عێراق لەلایەك و خاچپەرستانی ئەنتاکیە لەلایەکی ترەوە زاڵبوو، هەروەك ئەو پاشایە بەڵێنی دا سەرانەیەکی ساڵانە بداتە سوڵتانی میسر و شام بەرامبەر بەوەی ئاشتی لەگەڵ ببەستێت، دوای ئەوە ئەرمینیای بچووك هێزی دیاریکراو و کاریگەری لاوازی لە ڕێکردەی ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا هەبوو تا ئەوەی لەسەردەمی سوڵتان ناسر موحەممەدی کوڕی قلاووندا بزووتنەوەیەکی تری سەرکەشی نواند و بە ملکەچیکردنی و داننانی بە دەستەڵاتداری سوڵتانی میسر و شام کۆتایی پێهات.[1]

---

١ ـ المقریزی: السلوك ج١ ص٥٥٢ " سعید عاشور: المرجع السابف، ج٢ ص١١٤٨، تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەرمینیا لە ئێستادا بۆ دوو ناوچەدا بەشبووە: ناوچەی ڕووسی بەناوی

## سێیەم: شانشینی نۆبە

شانشینێکی مەسیحی بوو لەبەرزاییەکانی نیلدا کە ملکەچی سوڵتانی میسر بووو سەرانەی ساڵانەی ناسراو بە (بقط)[1] ی دەدا، ئەمە هەر لەو ڕێککەوتنەوە کە سەرکردە عەبدوڵلای کوڕی ئەبو سەرح لەساڵی ٦٥٠ز.دا لەگەڵیدا بەستبوو، بەڵام ئەو شوێنکەوتەیە زۆربەی جار تەنها بەناو بوو، چونکە ئەو دەوڵەتە زۆرجار سەرکەشی و سەرانەنەدانی دەگرتەبەر و شاڵاوی دەبردەسەر زەویەکانی باشووری میسر، سیاسەتی میسریش لەکاتی جەنگە خاچپەرستیەکاندا بەشێوەیەکی تایبەت گرنگی دا بە دانانی ئەو شانشینە مەسیحیە، کاتێك کاروانەکانی حاجی و بازرگانان لە ڕێگەی نیلەوە ب شاری قوص بەرەو باشوور دەچوون و لەوێشەوە بۆ عیذاب و جدە لە دەریای سوور لەجیاتی ڕێگەی سویس- عەقەبە لە سینائدا کە بەهۆی جموجۆڵی خاچپەرستی لەسەر کەناراوەکانی شام و فەلەستین و دامەزراندنی میرنشینە خاچپەرستەکانەوە پڕ مەترسی بوو.[2]

سەلاحەدینی ئەیوبی لەوە دەترسا پەیوەندییەك هەبێت لەنێوان شاڵاوی نۆبیەکان بۆسەر ئەسوان و وڵاتی صەعید و نێوان شاڵاوی خاچپەرستان بۆسەر کەناراوەکانی دەریای قلزم(سوور) تا گەیشتە عیذاب و ڕۆچوویە ناو( قوص) بۆیە سەلاحەدین تورانشاهی برای بە هەڵمەتێکی تەمێ کاریەوە نارد و ڕۆچوویە وڵاتی نۆبە تا دنقلە چوو، پاشان بەشێکی لە قەڵای(ئیبریم)[3] سەقامگیر بوو تا کاروانەکانی

---

کۆماری ئەرمینیای سۆسیالیستی، ناوجەیەکی تورکی لەچەند ویلایەتێك کە گرنکترینیان ویلایەتی ئەرزرۆمە.

١ ــ ئەم وشەیە یان لە وشەی کۆنی میسری (باق) وەرگیراوە بەواتای کۆیلە، یان لە وشەی لاتینی (pactu)- بەواتای ڕێککەوتن یان پەیمان، یان عەرەبی ئەسڵە بە واتای پارچە یان دەستە ، الکاشف: مصر فی فجر الاسلام، ص١٥.

٢ ــ مصطفی مسعد: الاسلام و النوبة فی العصور االوسطی،ص ١٤٢

٣ ــ لە سەرچاوە کۆنەکانیشدا پێی دەوترا (مریس) (unbatai ) شارێکی کۆنە لەسەر بەرەی ڕۆژهەڵاتی نیل لەناوچەی ناوبەی میسری کە لەسەردەمی ڕۆمانیدا پێی دەوتر

حاجیەکان و بازرگانان لەو ناوچانەی میسری باشووردا بپارێزن.

لەکاتی دامەزراندنی دەوڵەتی مەمالیکدا دەسدرێژیەکانی نۆبیەکان بۆسەر خاکی میسر دووبارەبوونەوە و پاشای نۆبە کە پێی دەوترا داود دەرفەتی سەرقاڵی **ظاهر** بیبرسی بەشەڕی دژبە مەغۆل و خاچپەرستان و شانشینی ئەرمینیای بچووکی قۆستەوە و هەڵمەتی بردە سەر سنوری ئەسوان لەساڵی ١٢٧٢ز.دا داود پاڵنەری گیانێکی خاچپەرستی و ناحەزی ئایینیەوە ئەم کارەی کرد، بەوبەڵگەی هەڵمەتی بردەسەر بەندەری(عیذاب) نەوەك بەمەبەستی هەڕەشەکردن لە بازرگانی مەملوکی لە دەریای سووردا بەتەنها، بەڵکوو بۆ پچڕاندنی ڕێی حەج لەو ناوچە.

بیبرس بە ناردنی دوو هەڵمەتی یەکلەدوای یەك بۆ وڵاتی نۆبە لە ساڵانی ١٢٧٣زو١٢٧٥ز.بەسەرکردایەتی هەردوو ئەمیر ئاقسنقری فارقانی و عیزەدینی ئەقرەم وەڵامی ئەوەی دایەوە، دەریاوانی نیلی لەو هەڵمەتانە دا بە گواستنەوەی سەربازان و چەك و خۆراکیان تا شاری ئەسوان بەشداری کرد، ئەمیر عیزەدین ئەقرەم توانی بە هەموو سنورەکان لەنزیك تاڤگەی دووەم ببڕێت و بەسەر داود دا سەربکەوێت و بەدیلی بگرێت و لەجیاتیدا (شکندە)ی مامی دابنێت کە بەڵێنی دابوو هەموو ساڵێك سەرانە بدات، ئەمە و سوڵتان بیبرس شاری(سواکن)ی دەروازەی دەریایی شانشینی نۆبەی لەسەر دەریای سوور لەساڵی(١٢٦٥ز)دا گرت.

ئەمە بوویە مایەی هەڕەشە بۆ سەر قەڵا مەسیحیەکانی ناو وڵاتی نۆبە سەرەڕای دەسەڵات چەسپێنی میسری بەسەر دەریای سوور و بازرگانی ئەوێدا، سوڵتان بیبرس دوای ئەو سەرکەوتنانە دیوانێکی تایبەتی بۆ نۆبە دامەزراند، ئەمەش لە قاهیرە و لەژێر چاودێری وەزیر بەهائەدینی کوڕی حەننادا تا چاودێری گەیشتنی سەرانەی وڵاتی نۆبە بکات.

تێبینی ئەوە دەکرێت هەڵمەتە بەردەوامەکان بۆسەر وڵاتی نۆبە هۆزە عەرەبیەکانی هاندا تا بەمەبەستی سەقامگیری لەپاڵ نۆبیەکان و تێکەڵ بوون پێیان لەگەڵ هەڵمەتەکاندا بچن، بەتایبەت لەناوچەی باکووری نۆبە یان خاکی مریس، بۆ نمونە عەرەبی ڕەبیعە کە لەگەڵ کچانی سەرکردە نۆبیەکاندا هاوسەرگیریان کرد و

کۆمەڵێ بەرژەوەندی مادییان بەدەستهێنا بەوەی لە سیستمی میراتگری باوی ناو نۆبیەکاندا سوودمەند بوون، ئەویش دەڵێت کچەزا یان خوشکەزا میراتی بەردەکەوێت.[١]

بەوجۆرە ئەو شانشینە مەسیحیە مۆرکی ئیسلامی وەرگرت و بەرەبەرە مۆرکی مەسیحی خۆی لەدەست دا تا ئەوەی نزیکەی نیو سەدە بەسەر تەمەنی بیبرسدا تێنەپەڕی تا ئەوەی نۆبیەکان ئیسلامیان وەرگرت و دەسەڵاتیان کەوتە دەست(بەنی کنز)بەوە سەرانەیان نەدا، چونکە ئەوانە عەرەبی موسڵمان بوون و لە ڕەبیعەبوون، ئەوانە کەنیزەکانی ئێستان.

## ٨-شەڕەکانی بیبرس دژبە مەغۆل:

ئەو گرفتە گەورەی هەرلەسەرەتای دەسەڵاتیەوە بەرەوڕووی سوڵتان بیبرس بوویەوە بەرەنگاربوونەوەی مەغۆلەکانی فارس بوو، چوونکە مەترسیان تەواو دیار و ڕوون بوو، بەتایبەت دوای شەڕی عەین جالووت کە بەسەرەتایەکی بێ کۆتایی پەیوەندی دەوڵەتی ئیلخانیەکانی فارس و مەمالیم دادەنرێت.

بیبرس ئەو قسانەی کەتبە غانوینی سەرکردەی مەغۆلی لەشەڕی عەین جالووت دا لەبیر نەچوو کە لە سەرەمەرگیدا بە قوتزی وت(من لەسەر دەستی تۆ لەناوچووم، دەی من دەزانم خوا خۆی ویستویەتی بکوژرێم نەوەك تۆ، بۆیە بەم سەرکەوتنە کاتیە هەڵمەخەڵەتێ،چونکە هەر هەواڵی مەرگم بگات بە هۆلاکۆخان تووڕەیی وەك دەریای شێواو هەڵدەچێ و پێی ئەسپە مەغۆلیەکان لەسەر خاکی ولآتلە ئازەربایىنجانەوە تا بەردەرگاکانی میسر چەسپاو دەبن).[٢]

ئەوجۆرە وشە و قسە بەهێز بوێرانە ئاستی ئەو مەترسیە دەنوێنن کە دەوڵەتی مەمالیك هۆلاکۆی چاوەڕوان دەکرد پاش ئەوەی سوپاکەی شکا و سەرکردەکەشی کوژرا، پاشان ئەو هەڵوێستە مەترسیەکەی زیاتری کرد کاتێك مەترسی مەغۆلی و

---

١ ـ تاریخ ابن الفرات ، ج٧ ص٥١.

٢ ـ فؤاد بن عبد المعطی الصیاد: مؤرخ المغول الکبیر رشیدالدین فضل الله الهمذانی،ص٥٥

مەترسی خاچپەرستان پەیوەستی یەك بوون، چونکە خاچ پەرستان هەوڵیاندا مەغۆڵەکان بە لای خۆیاندا ڕابکێشن و بەنیازی بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت لە نێوانیان و پشت پێ بەستنیان لە هەڵمەتی میسر و شامدا هاوپەیمانیان لەگەڵ ببەستن.

بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هەڵوێستە بیبرس لەگەڵ مەغۆڵی قفجاق ڕێککەوت و کچی سەرکردەکەیانی (بەرەکە خان) بەهاوسەر گرت، بەرەکەخان موسڵمان ببوو دژ بە مەغۆلە فارسە هاوڕگەزەکانی لە شەڕدا بوو، ئەمەش بەڕوونی لەناو مەسیحدا دەردەکەوێت کە لەساڵی١٢٦٣ز.دا ناردی بۆ سوڵتان بیبرس و تیایدا دەڵێت(دەی با سوڵتان بزانێت من لەگەڵ هۆلاکۆی خزم و هاوخوێنمدا لەپێناو بەرزکردنەوەی پەیامی خوا و لەپێناو ئاینی ئیلامدا شەڕم کرد).[1]

بیبرس تەنها پشتی بەو هاوپەیمانێتیە نەبەست، بەڵکوو کەوتە قایموقۆڵی بەشە سنوریەکانی وڵاتەکەی لەگەڵ دەوڵەتی مەغۆلی فارس لەسەر ڕووباری فورات، بەتایبەت قەڵای بیرەکە فریاگوزاری چاکی بۆ برد تا بۆماوەی دەساڵ توانای بەرەنگاربوونەوەی گەمارۆدانی هەبێت تا دڕکی ناو لەپی مەغۆل بێت لەو بەرە ڕۆژهەلاتیەوە، هەروەها هەوڵیدا ڕێگە وبان و دۆڵەکانی بەرەو شام تێکبدات تا مەغۆل لەکاتی هاتنیاندا پێویستنی خواردن و ئالفی ئاژەڵەکانیان دەست نەکەوێت.

لەساڵی ١٢٦٥ز/٦٦٣ك.دا هۆلاکۆخان مرد، بەڵام مردنی کەسەکان لەناو دەوڵەتێکی گەنجی وەك دەوڵەتی مەغۆلیدا کاریگەری لەسەر سووربونی مەغۆل بۆ بەدیهێنانی ئەو نیازەی هۆلاکۆ دەستی پێکرد، ئەویش کشان بوو بەرەو دەوڵەتی مەمالیك لە میسر و شام، بەڵکوو خانی نوێی دەوڵەتی ئیلخانەکانی فارس کە ناوی ئەباقا یان ئوبغا(١٢٦٥-١٢٨٢ز/٦٦٣-٦٨٠ك)بوو زیاتر لەسەر سیاسەتی باوکی دەچوو و گرنگیدا بە مەسەلەی هاوپەیمانی لەگەڵ خاچپەرستاندا، ئەوە بوو سۆزی بۆ مەسیحیەکان دەنواند و باڵوێز و دیاری لەگەڵ پاپاکان و پاشایانی ئەوروپادا ئاڵوگۆڕ پێ دەکرد.

---

١ ـص٤٩٤،عاشور،ص٤٠ العيني: عقد الجمان(بەشی تایبەت بەڕووداوەکانی ٦٥٦-٦٧٣ك.

ئامانجی هاوبەشی نێوان ئەوان ڕێکخستنی هەڵمەتێکی هاوبەش بوو بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی مەمالیك و دەستگرتن بەسەر بەیتولمەقدیسدا، ئەمەش لەئەنجامی هاوپەیمانیەکەوە بەڕوونی دەرکەوت کاتێك ئەباقاخان دەرفەتی سەرقاڵبوونی بیبرسی بەشەڕی خاچپەرستان قۆستەوە تا هەڵمەت بباتە سەر سنوورە ئیسلامیەکان، نموونەش ئەوە بوو کە لەساڵی١٢٦٦ز.دا ڕوویدا، کاتێك سوپا مەغۆلیەکان هەڵمەتیان بردە سەر شاری ڕەحبە لەسەر سنووری فوراتی، ئەمە لەکاتێکدا سوپاکانی مەغۆل هەڵمەتیان دەبردە سەر شاری (صەفەد)ی خاچپەرستی.

بەڵام سەرەڕای ئەم کەشە دوژمنکاریە، باقخان هەوڵیدا لەگەڵ بیبرسدا لەسەر چەند مەرجێکی گونجاو لەگەڵ مەغۆلدا ڕێککەوتن ببەستێت، یان بەواتایەکی تر هەوڵیدا بۆ بڵاوکردنەوەی دەسەڵاتی بەسەر دەوڵەتی مەمالیکدا ڕێ و شوێنی دیبلۆماسی بگرێتەبەر، بۆیە لەساڵی١٢٦٨ز.دا نامەیەکی نارد بۆ بیبرس و تیایدا پێشنیاری ڕێککەوتن و داوای ملکەچبوونی بۆ خستەڕوو، وەك ئەوەی دەیوت(ئەگەر بچیتە ئاسمان یان دابەزیتە سەر زەوی لەدەست ئێمە ڕزگارت نابێت، بۆیە بەرژەوەندی لەوەدایە ڕێککەوتن لەنێوانماندا بێت)، بەڵام ئەو شێوە فەرمانخوازیەی مەغۆل جێی سەرسامی بیبرس نەبوو و بەوجۆرە وەڵامی نێردراوی مەغۆلی دایەوە(بزانم من لەو ڕێککەوتنەدا داواکاریم هەیە، بەردەوام ئەو وڵاتانەی لەدەست دەسێنم کە دەستی بەسەردا گرتووە وەك وڵاتی خەلیفە و هەموو بەشەکانی تری سەرزەوی).

لە ساڵی ١٢٧٢ز.دا بیبرس چوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەتەر لەسەر خاکی خۆیان، چەند کەشتیەکی پارچەپارچەکراوی لەسەر پشتی وشتر لەگەڵ خۆیدا برد و لەناو ڕووباری فورات دایانان تا سوپاکانی پێیان بپەڕنەوە، بیبرس و سەربازەکانی توانیان لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە و سەرکەون بەسەر سوپا مەغۆلیەکاندا و لەخاکی عێراقدا لەساڵی١٢٧٣ز.دا پاشماوەی مەغۆلی ڕاوە دوو بنێن، سەرکەوتنی بیبرسیش لەو هەڵمەتەیدا وایکرد ژمارەیەکی زۆری پیاوانی گەورەی ناو دەوڵەتی مەغۆلی

بدەنــەپاڵی، ڕەشــیەدینی مێژوونوســـی مــەغۆل دەڵێــت ئــەباقاخان خێزانـــی جوەینیەکانی لەناوبرد، ئەوانە وڵاتی عێراقیان لەسەردەمی ئەودا گرتبوویە دەست، ئەویش بەتۆمەتی پەیوەندییان لەگەڵ بیبرسدا و ڕێککەوتنیان لەگەڵی لەسەرنەوەی عێـراق بدەنــە دەســت، لــەنێو ئەوانەشــدا مێــژوونووس عــەتا مــەلیکی جــوەینی فەرمانڕەوای عێراق و خواجە شەمسەدین موحەممەدی بـرای کـە وەزیریـشی بـوو، لەگەڵ کوڕەکانیدا، هەمووشیان ئەهلی فەزڵ و ئـەدەب و بـەڕێز و بەخـشندە بـوون، کۆڕیان کۆڕی ئەدیبان و نوسەران و شاعیران وجێی هیوایـان بـوو، چـییان پێـدەکرا لەپێناو ئاوەدانکردنەوەی وێرانکاریەکانی مەغۆلدا کردیان و لەکاری چاکە و بەسوود دا تەمبەڵیان دەنواند.[١]

ئەم ڕووداوە لێدانی بەرمەکیەکانمان لە ڕۆژانی هارونە ڕەشـید دا بیردەخاتـەوە، ئەمە بەڵگەی ڕوونی ئەوەیە کـە بیـبرس توانیویـەتی لەوبـەرەوە بەسـەر دوژمنانیـدا سەرکەوێت و سنوری ڕۆژهەڵاتی لە مەترسی مەغۆلی بپارێزێت.

بەڵام ململانێی نێوان دوو دەولەتی مەغۆلی و مـەمالیک لـەو سـنورەدا نەوەسـتا و خێرا چوویە مەیدانێکی تر کە ئـەویش وڵاتـی ئاسـیای بچووك بـوو لـە بـاکوورەوە ، هۆکاری ئەو گۆڕانەش ئەوەبوو بیبرس پاش دڵنیاکردنی سنوری ڕۆژهـەڵاتی ویـستی سـنوری باکووریـشی بپارێزێـت کـە هاوسـنوری وڵاتـی سـەلجوقیەکانی ڕۆمـی نـاو ئاسیای بچووك بوو، ئەو وڵاتە سەربە مەغۆل بوو هەرلەوکاتەوەی پاشاکانیان دایانە پاڵ هۆلاکۆ و کاروباری دەسەڵات لەدەست وەزیـر موعینـەدین سولەیمان پەروانـەدا بوو، پەروانە وشەیەکی فارسییە بەواتای پەردەدار.

ئەم کەسە لەپاڵ دەسەڵاتداری وڵاتدا کە مەغۆلەکان بوون کـاری دەکـرد، کاتێـك بیبرس زاڵبوو بەسەر مەغۆلدا پەروانە دایەپاڵ لایـەنی سـەرکەوتوو نامـەی نـارد بـۆ بیبرس و ڕایگەیاند کە داویەتی پاڵی، بیبرسیش بـە سـوپاکانیەوە چـوو بـۆ ئاسـیای بـچووك و بەسـەر سـوپای مەغۆلیـدا سـەرکەوت، ئەمـەش لەشـاری (ابلستین) یـان

---

١ ـ فؤاد عبد المعطی الصیاد: س.ث.ص.٥٨–٥٩.

(ابلستان)[1] لەساڵی(١٢٧٧ز/٦٧٥ك)مەغۆلەکان لەو شەڕەدا نزیکەی حەوت هەزارکەسیان لەدەست دا.

پاشان بیبرس چوویە شاری قەیسەریەی پایتەختی سەلجوقیەکانی ڕۆم و لەهەدار و سەلتەنە دابەزی و لەسەر کورسی سەلجوقیەکانی ڕۆم دانیشت و لەسەر مینبەرەکانی ئەوێ وتاری بۆ خوێندرایەوە و خەڵکی پێشوازیەکی چاکیان لێکرد، ئینجا بیبرس گەڕایەوە بۆ شام.

کە ئەباقاخان بەوەی زانی، خێرا هاتە مەیدانی شەڕ لە ئەبلستین، دەڵێن کاتێك ئێسك و پروسکی سەربازە کوژراوەکانی بینی گریا، پاشان جامی تووڕەییەکەی لێی ڕژا و بەرامبەر خەڵکی ئەوێ تووڕەی خۆی نواند و ژمارەیەکی زۆری لێکوشتن لەبەرئەوەی بەخێرهاتنی پاشای میسریان کردبوو، هەروەك فەرمانی کرد بە کوشتنی پەروانە پاش ئەوەی ئافرەتە کوژراوەکانی مەغۆل ڕێپێوانێکی گەورەیان کرد و داوای خوێنی پەروانەیان کرد، چونکە ئەو هۆکاری ئەو کارەساتە بووە.

هەندێ لە مێژوونووسان ئەو ڕەخنە لە بیبرس دەگرن کە نەهاتەوە بۆ وڵاتی سەلجوقیەکانی ڕۆم تا بیپارێزێت و مەغۆلەکان لەوێ دەربکات، چونکە ئەو وڵاتە سەر بە دەوڵەتی مەملوکی بوو، بەڵام پێدەچێت هۆکاری ئەوە بووبێت بیبرس لەوکاتەدا ماندوو بوبێت یان تووشی نەخۆشی بوبێت بە بەڵگەی ئەوەی لەوساڵەدا مرد،[2] لەدوای کوژرانی پەروانە هێندەی نەبرد لەساڵی (١٢٧٧ز/٦٧٦ك)مرد و لە دیمەشق بەخاك سپێردرا.

بەوجۆرە ژیانی سوڵتان ظاهر بیبرسی بوندوقداری صالحی کۆتایی پێهات، ئەوکەسەی سەرچاوەکان وا وەسفی دەکەن بالابەرز، ڕەنگ ئەسمەر، چاوشین، دەنگ زاڵ، دلێر و نەبەرد و پاڵەوان، توند و بزێو بووە، لە چاویدا بە چ حاڵێك پیسایەك هەبووە، ئەمە هۆکاری ئەوەبوو کە ئامادەی کڕینی نەبوون، پاشای میر

---

١ ـ ابلستين : دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری قەیسەریە یان قیساریەی ڕۆم.

٢ ـ تاريخ ابن الفرات ج٧ ص٨٥–٨٧ گێڕانەوەکانی مێژوونووسان دێنێت لەسەر هۆکاری ردنی بیبرس، هەندێج پێیان وایە ژەهر خوارذ کراوە.

ئیدکین بوندوقداری کڕی و ئەویش لەخزمەتیدا مایەوە تا مەلیك صالّح نەجمەدین ئەیوب لێی وەرگرت.

هەروەها دەڵێن زۆربەی جار بەسواری ئەسپی پۆستە بە شوێنەکان و قەلاّکاندا گەڕاوە، لە هەفتەیەکدا دوو ڕۆژی یاری(پولو)ی دەرکرد، ڕۆژێك لە میسر و ڕۆژێك لە دیمەشق، لەم بارەیەوە سەیفودەولە مهمندار وەسفی دەکات و دەڵێت:

ڕۆژێك لە میسر و ڕۆژێك لە حیجاز ڕۆژێ لە شام و ڕۆژێ لە حەلەب

بێگومان ئەو سوڵتانە گەورە و بەڕێزە بە کار و چاکسازیە بەرفراوانەکانی توانی دەوڵەتی مەمالیك لە دەوڵەتێکی سەرەتاییەوە بگۆڕێت بۆ دەوڵەتێکی بەهێزی پایە چەسپاو و ڕێخۆشکەری بۆ ئەوانەی دوای خۆی بکات تا پەیامەکەی تەواو بکەن و بگەنە ئامانجی خوازراو وکە لەناوبردنی مەغۆل و خاچپەرستان بوو.

بۆیە ناوبانگ و ژیاننامەی بەسەر سوڵتانەکانی تردا زاڵە تا ئاستێك هەندێ چیرۆکی خەیاڵی تێکەڵ بە ڕاستیە مێژووییەکانی ژیانی کراوە، بۆنمونە ئەو چیرۆکە فۆلکلۆری و جەماوەریانەی ناسراون بە چیرۆکی ظاهری یان ژیانی ظاهر بیبرس کە وا کەسایەتی بیبرس دەناسێنن کەسایەتی سەردەمێك بێت زیاتر لەوەی کەسایەتی مرۆڤێك بێت، تیایدا وێنەی ئەو بارە نوێیە بەدی دەکەین کە دەوڵەتی مەمالیك لە میسر و شام تیایدا بوو بە دەوڵەتێکی بەهێزی پێ چەسپاو.

## کوڕانی ظاهر بیبرس:

ڕووداوەکانی دوای مردنی بیبرس بە کۆتاییەکی ئاسایی نەریتی مەملووکی کۆتایی پێهات، بەوەی یەکلەدوای یەك دوو کوڕی هاتنە سەر دەسەلاّت، ئەوانیش مەلیك سەعید موحەممەدی ناسراو بە بەرەکەخان دواتر مەلیك عادل سلامش، لەم ڕوانگەوە چەند ڕووداوێك هاتنە ئارا کە بوونە هۆی کەنارخستنیان‌و دانانی بەهێزترین ئەمیری مەملوکی کە میر سەیفەدین قلاوونی صالحی ئەلفی بوو وەك سوڵتانی میسرو شام دانرا.

کوڕی یەکەمی بیبرس مەلیك سەعید موحەممەد لەوپەڕی تەمەنی گونجاویدا بوو تا پایەی دەسەلاّت بگرێتەدەست، تەمەنی ۱۷ ساڵ بوو، سەرچاوە هاوچەرخەکان

ئاماژە دەدەن بە جوانی ئاکارو مۆرك‌و ڕقبوونی لە خوێنرێژی.بەڵام ئەو سیفەتانە بوونە هۆی لابردنی چونکە بۆ گیانی ئەو سەردەمە گونجاو نەبوو، مەلیك سەعید شارەزاییەکی باشی نەبوو سەبارەت بە پیلان‌و دەسکیسەکانی مەمالیکەکان، ناچار پاسەوانی تایبەتی لە دەوری خۆی دانا کە لە چەمکی ڕەسمی مەملووکیدا ناسراوە بە خاصکی(پاسەوانی تایبەت). بە سروشتی حاڵ مەلیك سەعید گرنگی زۆری دەدا بە مەمالیکەکانی‌و سامانی بەسەریاندا دەڕشت‌و لە کارگێڕی کاروباری دەوڵەتدا دەستڕۆیشتووی کردن، ئەم کارە بێزاری گەورە مەملووکیەکانی لێکەوتەوە بەتایبەت ئەمیرە صالحیەکان کە خۆیان لەو بە شیاوتر دەزانی بۆ دەسەڵات وەرگرتن، بۆیە بۆیان نووسی:

تۆ هەستەکانت تێکداوەو بەڕووی گەورە سەرکردەکان بوویتەوە، یان وازبێنە لەوکارانەت یان ئێمەو تۆ بە جۆرێکی تر یەکتر دەبینینەوە.[1]

ئەم ململانێیە بە لابردنی مەلیك سەعید لەلایەن مەمالیکەکانەوە کۆتایی پێهات، ئەمەش پاش دوو ساڵ دەسەڵاتداری، لەبری ئەودا بەدرەدین سلامشی برایان دانا کە تەمەنی حەوت ساڵان بوو.

جێی ئاماژەیە هەندێ لە سەرکردە مەمالیکەکان داوایان لە میر سەیفەدین قلاونی گەورە کەسایەتی ئەوکاتی مەملووکی کرد تا لەبری سلامش دەسەڵات وەربگرێت، بەڵام قلاوون ڕازینەبوو و وتی:

(من لەتاو حەزی دەسەڵاتدا مەلیك سەعیدم لانەبرد، بەڵکو لەپێناو پاراستنی نیزام‌و دڵنیایی سوپا ئیسلامیەکاندا نەوەك بچووکەکان ببنە پێشڕەوی، باشتریش وایە لە نەوەی مەلیك زاهیر بیبرس دەرنەچێت).[2]

لەم دەربڕینەی قلاوونەوە دەردەکەوێت سووربووە لەسەر پێویستی پەیڕەوکردنی بنەمای میراتگری دەسەڵات ئەمەش بە هێشتنەوەی پایەی دەسەڵات لە بنەماڵەی بیبرسدا، بەڵام یەکپارچە ڕاستیەکە وانەبوو، چونکە قلاوون بەو

١ـ المقريزي: السلوك ج١ق٢ص٦٤٥.

٢ـ المقريزي: السلوك ج١ص٦٥٧.

دەربڕینەی مەبەستی دەربرینی هەنگوینی بوو تا خواستو پرۆژەکانی بشارێتەوە تا یەکەمجار خۆی پێشبخات، چاکترین بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە قلاوون خۆی کوڕی دووەمی بیبرسی لابرد، ئەمەش پاش ئەوەی لەدەست نەیارەکانی دەربازبوو و کەشوهەوای بۆ لەباربوو دواتر لەساڵی١٢٧٩ز.دا دەسەڵاتی وەرگرت، لەمبارەشەوە ئەبولمەحاسین دەڵێت قلاوون ترسی هەبوو لە شۆرشی مەمالیکی زاهیری لە روویدا چونکە ئەوڕۆژ ئەوان زۆرینەی سەربازگەی میسریان پێکدەهێنا... کە باری بۆ گونجا دەسەلاتی گرتەدەست.

نامۆییەکە لەوەدایە قلاوون سەرەڕای ڕێزنەگرتنی بنەمای میراتگری کەچی خۆیو کوڕەکانیشی لەدوای خۆی توانییان بۆ ماوەیەکی دووردرێژ ئەو بنەمایە جێبەجێ بکەن، دوای خۆی دوو کوڕی خۆی( ئەشرەف خەلیلو ناصر موحەممەد) دەسەڵاتیان وەرگرت، دواتر نەوەکانی ناصر مەحەممەد تا کۆتایی دەوڵەتی مەملووکی یەکەم لە میسر دەسەڵاتیان لەدەستدا مایەوە.

بەڵام ئەوە بەو واتایە نا کە سەرکردە مەملووکیەکان بە بنەمای میراتگری رازی بووبن، بەڵکو مەسەلەکە ئەوەبوو قلاوونو نەوەکانی توانییان بەرامبەر هەموو پیلانەکانی مەمالیکەکان بوەستنو پیلانیان بۆ داماڵینی دەسەڵات پووچەڵ بکەنەوە.

لەبەرئەوەی سەردەمی ناصر قلاوون درێژترین ماوەی دەسەلاتی نێو سوڵتانە مەملووکیەکان بوو بۆیە کەسایەتیەکەی لەناو دەوڵەتو لە عەقڵیەتی خەڵکدا خۆی چەسپاند، ئیتر ئاسان بوو کوڕەکانی دوای خۆی لەنێو خۆیاندا بەدرێژایی سەدەی چواردەی زایینی دەسەڵاتیان لەدەستدا بێت.

# بەشی حەوتەم

## دەوڵەتی بەنی قلاون تا کۆتایی دەوڵەتی مەملووکی یەکەم

سولڵتان مەنسوور سەیفەدین قلاون (١٢٧٩-١٢٩٠ ز/٦٧٨-٦٨٩ ك) ناوی تەوای بریتیه لە مەنسوور سەیفەدینی قلاونی صالّحی ئەلفی، بە یەکێك لە گەورەترین سولڵتانه مەمالیکەکان دادەنرێت لەدوای زاهر بیبرس، هەروەك لە ڕووی بنەڕەت و بنەچەوە لەودەچێت، ئەویش کۆیلەی ولاتی قفجاقه و هەر لە منداڵیەوە هێنراوە بۆ میسر و فرۆشراوە بە مەلیك صالّح ئەییوب، بۆیە نازناوی صالّحی وەرگرتووە، ناونانیشی بە ئەلفی لە ئامـاژەدان بە کڕینی بە هەزار دینار هاتووە، ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو سولڵتانانه شەرمیان لە وتنی ڕاستی خۆیان نەکردووە، قلاون بەرەبەرە پلەی بەرز بوویەوە تا گەیشتە پلەی ئەتابەگ یان جێگیری دەستەڵات لەسەردەمی بیبرسدا، پاشان لەسەردەمی سلامش و سەعیدی کوڕانیشتدا هەروابوو.

لە سەرەتای دەستەڵاتی سولڵتان قلاوندا چەند ڕووداوێکی ئاسایی و هەمیشەیی ڕوویاندەدا، وەك چۆن لە سەرەتاکانی سەردەمەکانی گەورە سولڵتانه مەملوکیەکاندا ڕوویاندەدا، ئەویش بەرهەڵستکاری سەرکردەکان بوو بۆ دەستەڵاتەکەی، ئەو سەرکردانه کە نەیاری بوون ڕووداوی لابردنی کوڕی سولڵتانیان دەکرد بە بنەمایەك بۆ ناڕەزایی و ڕەخنەگرتن و بەرگریکردن لە ڕێبازی میراتگری و ئەرکی هەواداری بۆ سولڵتانی کۆچکردو و ئەو بەڵێن و پەیمانانەی بۆی برابوونەوە تا لەدوای خۆی کوڕەکەی دابنێن، لەڕاستیدا ئەو بزووتنەوەی کە هەندێك لە سەرکردەکان پێی هەڵدەسان تەنها لەو بازنەیەدا بوو کە بەو بەرهەڵستکاریه و قۆستنەوەی دەرفەتە کار بۆ بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆیان بکەن، جا ئەگەر هەریەك لەو سەرکردە نەیارانه بیتوانیایە قلاون لاببات و بگاتە دەستەڵات، ئەوا ڕێزی ڕێبازی میراتگری شەرعی نەدەگرت و گوێی بە مافی هەواداری بۆ کوڕی سولڵتانی کۆچکردوو نەدەدا، جا لێرەدا بەرهەڵستکاری باسو خواسێکی شێوەییه بۆ شاردنەوەی ئەو خواست و چاوتێبڕینەی دەستەڵات کە لە دەروونیاندا هەبوو.

ئەویش کە لەسەرەتاکانی ڕۆژانی سولتان قلاوندا ڕوویدا کە میر شەمسەدین سنقر ئەسقەری جێگیری سولتان لە دیمەشقدا خۆی وەك سولتانی شامی ڕاگەیاند هەر کە بیستی قلاون بووە بە سولتان و سلامشی لابردووە، نازناوی مەلیك کامیلیشی لەخۆی نا و ژمارەیەکی زۆری مەمالیکی زاهریەکانیش دایانە پالی و نەوەی ئەییوبیش کە بەرپرسی حما بوو دایە پالی، هەروەها شێخەکانی ئەو هۆزە عەرەبیانەیش کە لەسەر سنووری شام و عێراق بوون.

قلاون توانی لە جەنگی(الجسورە) لەنزیك دیمەشق و لە یۆلیۆی سالی١٢٨٠ز.دا ئەو هاوپەیمانیە لەناو ببات و سنقریش ڕایکرد بۆ قەلایەکی سەرسنووری شامی کە بە صەیوب ناسراوە، لەکاتێکدا سولتان قلاون دەستیگرت بەسەر دیمەشقدا و لە خەلکەکەی خۆشبوو، ئەوانەی کە دابوویانە پال سنقر، لەوانە شەمسەدین ئیبن خەلەکانی دادوەری شارەکە و نووسەر کتێبی(وفیات الاعیان) کە فەتوای دروستی و ڕەوایی دەستەلاتی سنقری دابوو.[١]

سولتان قلاون دوای ئەوە لەسەر سیاسەتی بیبرس دەچوو بەرامبەر بەو دوو مەترسیە سەرەکیەی کە تەنگی بە دەولەتی مەمالیك هەلچنیبوو، ئەویش مەغۆل و خاچپەرستان بوون.

مەترسی مەغۆل گەورەترین مەترسی بوو، چونکە هەرچی لە بارەی خاچپەرستان و توانایانەوە بوترێت، دەبێت بیرمان نەچێت کە خاچپەرستان دوای لاواز بوونی فریاگوزاری بۆ هاتووەکانیان لەئەورووپاوە هێرشیان بەرەو کزی ولاوازی چوو، قلاون پێی باشبوو بە شێوەیەکی کاتی لەگەل خاچپەرستاندا ئاگربەست ببەستێت و هێزی خۆی دژ بە مەغۆل چڕ بکاتەوە، جا ماوەی نێوان ١٢٨١ بۆ١٢٨٢ماوەی بەستنی چەند پەیمانێك بوو لەگەل ئەو هێزە خاچپەرستیانەی کە لە شامدا مابوونەوە و بریتیبوون لە:

١-شانشینی بەیتولمەقدیسی وەهمی کە عەککا پایتەختی بوو(لەوکاتەدا شارل ئەنجۆ پاشای بوو و ئۆدۆی نوێنەری لەگەل سولتاندا دانوسانی ئاگربەستەکەی دەکرد).

---

١ ـ المقریزی: السلوك ج١ ص ٦٧٦-٦٨٧

٢- دەستەی سوارە ئیسپارتەییەکان کە مەڵبەندەکەیان قەڵای(المرقب) بوو لە باشووری لازقیە.

٣- دەستەی سوارە دوایەکان کە مەڵبەندەکەیان لە تەرسووس بوو.

٤- میرنشینی تەرابلوس کە سەرکردەکانی نۆرمانی لێ بوو و لەوکاتەدا بوهمندی حەوتەم سەرکردەی بوو، بەپێی ئەو پەیماننامانە بۆ ماوەی دە ساڵ ئاگربەستی نێوان هەردوولا دانرا.[1]

لەگەڵ ئەوەی قلاون هەوڵی دەدا ئەو ئاگربەستانە ببەستێت، کەچی زۆربەی مەرجەکانی لە بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتی مەملوکیدا بوون، نمونەی ئەمەیش خاچپەرستەکان بەڵێنیان دا شوورە و قەڵای نوێ بنیاد نەنێن و ڕێگە بە کەشتیە ئیسلامیەکان بدەن بەوپەڕی ئازادی تەواوەوە لە بەندەرە خاچپەرستیەکاندا بن، ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە کە تاکە ئامانجی خاچپەرستان لەپشت بەستنی ئەم پەیماننامانەوە پاراستنی قەوارەیان بووە.

## جەنگەکانی قلاون لەگەڵ ئیلخانەکانی فارسدا

وتمان کە مەغۆلەکانی فارس چاویان بڕیبووە داگیرکردنی میسر و شام و دەیانویست تۆڵەی جەنگی عەین جالووت بکەنەوە(تا ئێستایش ئەو گوندە ماوە و ناوی جالوودە لە قەزای نابلوس کە ژمارەی دانیشتوانەکەی لە سەدوپەنجا کەس زیاتر تێناپەڕن (النجوم الزاهرە ج٢ ص٥٦ حاشیە).

ئەبەقا یان ئوبغای کوڕی هۆلاکۆی پاشایان دابەشکاری و بارگرژی ناو دەوڵەتی مەملوکی بەهۆی شۆڕشەکەی سنقر ئەسقەری جێگیری دەستەڵاتی دیمەشق دژ بە قلاون قۆستەوە و سەرلەنوێ خۆی ئامادە کرد بۆ هێرش بردنە سەر خاکی شام و میسر و بڕوای وابوو سنقر لەو جەنگەدا یارمەتیدەر و پاڵپشتی دەبێت، سنقر هەواڵی بۆ مەغۆل ناردبوو و بەڵێنی پێدابوون دژ بە سوڵتانی میسر یارمەتیان بدات،

---

١ ـ محمد جمال الدين سرور: دولة بني قلاون في مصر ص ٢٢٢

بەڵام دواتر گەڕایەوە و لە هەڵوێستی خۆی پەشیمان بوویەوە کاتێك برا مەلیکەکانی لە میسر نامەیان بۆ نارد و پێیان وت:(وا دوژمن چاوی تێبڕیوین و هۆکارەکەیشی تەنها ناکۆکی نێوان خۆمانە، دروست نیە ئیسلام لەناو بچێت.

لەئەنجامدا سنقر دایە پاڵ قلاون و سەرلەنوێ یەکڕیزی مەمالیکەکان گەڕایەوە و هەمیشەیش لەکاتی مەترسی و تەنگەژەکاندا ئەمە کار و پیشەی مەمالیکەکان بووە.

سوپا مەغۆلیەکان بەسەرکردایەتی منکوتمری کوڕی هۆلاکۆ(برای ئەبەقا)لە ڕووباری فورات پەڕینەوە و دەستیانگرت بەسەر حەلەبدا و قلاونیش بە سوپاکانیەوە پێشڕەوی کرد تا لەنزیك شاری حیمس لای گۆڕی خالیدی کوڕی وەلید بە مەغۆلەکان گەیشت و لەوێدا لەساڵی ١٢٨١ ز جەنگێکی قورس لەنێوان هەردوولادا ڕوویدا و بە شکستی تەتار و پاشەکشەیان بەرەو دەوروبەری فورات کۆتایی پێهات، قلاون ویستی بە شێوەیەکی یەکلایی لەسەریاندا سەربکەوێت، بۆیە لە ڕێگەی کۆتری نامەبەرەوە هەواڵی نارد بۆ کاربەدەست و سەرکردەکانی لەسەر سنووری فوراتیدا تا لەڕووی تەتەرە ڕاکردووەکاندابوەستن، هەروەك فەرمانیکرد تا ئەو حەشیشانەی لەسەر فوراتن ئاگریان تێبەربدرێت، بەمە ژمارەیەکی زۆری مەغۆلەکان سووتان و منکوتمریش بە برینداری و غەمباریەوە گەڕایەوە بۆ بەغداد و ئەباقای برایشی سەرکۆنەی کرد.[1]

لەڕاستیدا ڕووداوی حیمس کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لە مێژووی پەیوەندیەکانی نێوان مەغۆل و مەمالیکدا و لەوئەنجامەدا ئاگربەستێکی درێژخایەن بەسترا و مەغۆلەکان دڵنیا بوون بۆ ماوەیەکیش بێت ناتوانن بەرامبەر بە مەمالیکەکان بوەستن.

ئەمە و ئەو سەرکەوتنە لەکاتێکدا بوو کە بزووتنەوەی پەیوەندی نێوان مەغۆل و خاچپەرستان هەبوو بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتووی دژ بە میسر کە زۆر

---

١ ـ المقریزی: السلوك ج١ ص٦٩٠

بەباشی بەڕێوە دەچوو، جا کاتێك قلاون لە جەنگی حیمسدا بەسەر مەترسی مەغۆلیدا زاڵبوون لەگەڵ ئەمەدا نرخی ئەو هاوپەیمانیە مەغۆلی خاچپەرستیش نەما.

پاشان واهاتە پێشەوە کە ئەبەقاخان لەساڵی ١٢٨٢ ز. واتە ساڵی دوای شکستەکە مرد و تکوداری برا شوێنی گرتەوە کە پێش بوونی بە سوڵتان موسوڵمان بوو بوو و ناوی خۆی نا تکودار ئەحمەد سوڵتان، لەوە ئەمە وەردەگرین کە ئەو هەولانەی مەسیحیەکان دایان بۆ بە مەسیحی کردنی مەغۆل و هاوپەیمان بوون لەگەڵیاندا، لەگەڵیشیدا بزووتنەوەیەکی بانگەوازی موسوڵمانانیشی لەگەڵدا بووە بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام لەنێو مەغۆلدا.

بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەنێو مەغۆلەکانی فارسدایە بە سیفەتێکی مەبدەئی و بنەماییش بێت، واتای ئەوە نیە کە دوژمنایەتی و گرفتە سیاسیەکانی نێوان دوو دەوڵەتی مەغۆلی و مەملوکی نەمابێت، هەروەك بوونی سوڵتانێکی موسوڵمان لە کورسی دەستەڵات مەغۆلیدا سیاسەتی دوژمنکاری دژ بە مەغۆلی نەگۆڕن بەوپێیەی ئەو سیاسەتە بە بنەڕەتێکی تەقلیدی دادەنرا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی و خواستەکانی دەوڵەتی مەغۆلی فارس، ئەو نامە دوژمنکاریانەیش کە تکودار ئەحمەد ناردنی بۆ سوڵتان بەڵگەی ئەوەن، (القلقشندی: ج٨ ص٦٥-٦٨).

بەهۆی بارگرژی ناوخۆیی مەغۆلەکانەوە سوڵتان ئەحمەد نەیتوانی هیچ چالاکیەکی سەربازی لە دەرەوەی ناوچەی خۆیدا ئەنجام بدات، بۆیە بەرامبەر بە میسر سیاسەتێکی ئاشتەوایی هێدی و لەسەرخۆی هەبوو، بەلام ئەو سیاسەتە ئاشتەواییەی وای لەسەرکردە مەغۆلەکان کرد بەوە تۆمەتباری بکەن کە بەهۆی موسوڵمان بوونیەوە لەگەڵ مسوڵمانانندا ڕێککەوتووە، بۆیە لێی ڕاپەڕین و لەکۆتاییدا کوشتیان و برازاکەیان دانا کە ناسرا بوو بە ئەرغونی کوڕی ئەبەقا، ئەمەیش لەساڵی ١٢٨٤ ز.دا بوو، بەلام ئەرغۆنیش بەدرێژایی سەردەمی قلاون نەیتوانی هیچ کارێکی مەترسیداری دژ بە میسر و شام ئەنجام بدات.

ئەمە لەبواری مەغۆلی فارسەوە، بەلام لە ڕووی مەغۆلی قفجاق یان هۆزی زێڕینەوە، ئەوا سوڵتان قلاون پەیوەندی دۆستایەتی کۆنی نێوان خۆی و ئەوانی

پاراست کە ئەو دۆستایەتیە وڵاتەکەی دەبەستەوە بەو دەوڵەتە مەغۆلیەی باکوورەوە.

## جەنگەکانی قلاون لەگەڵ خاچپەرستاندا:

پاش ئەوەی سوڵتان قلاون لە جەنگی ناسراوی حیمسدا کۆتایی بە مەترسی مەغۆلی هێنا، لایکردەوە بەلای جەنگی خاچپەرستاندا و گوێی بەو پەیماننامانە و ئاگربەستانە نەدا کە لەگەڵیاندا نەبەستبووی، بەڵکوو هێرشێکی بردە سەر مەڵبەندی سوارە ئیسپارتاییەکان کە قەڵای(المرقب)بوو لە باشووری لازقیەدا، ئەمەیش لەساڵی ١٢٨٥ ز.دا بوو، سوارە ئیسپارتاییەکان نەیانتوانی بەرنگاری ئەو هێرشە ببنەوە، بۆیە قەڵاکەیان پاش گەمارۆیەکی یەك مانگی بەدەستەوەدا و گواستیانەوە بۆ عەککا و تەرابلوس.

میرنشینە خاچپەرسیەکانی تریش ترسان هەمان باریان بەسەردابێت، بۆیە بوهمەندی حوتەمی بەرپرسی میرنشینی تەرابلوس کەوتە ئاگربەست لەگەڵ قلاونداو چەند قەڵایەك و ماڵ و سامانی پێشکەشکرد، بەڵکوو ڕازی بکات، میرنشینی صور و دەوڵەتی ئەرمینیای بچووکیش بەهەمان جۆریان کرد، هەموو ئەمانە بەڵگەی هەرچی بن ئەوە دەگەیەنن کە ئەو میرنشینە خاچپەرستیانە تا چ ئاستێك هەستیان بە مەترسی قلاون دەکرد.

لەساڵی ١٢٨٧ ز. واتە دوای دوو ساڵ لە ڕووخانی قەڵای (المرقب)، قلاون دەستکرت بەسەر شاری لازقیەی سەر بە میرنشینی تەرابلوسدا قلاون بۆ ئەو هێرشەی مردنی بوهمەندی حەوتەمی کرد بە بیانوو بەو بەڵگە و بیانووەی کە مردنی ئەو ڕێگە دەدات بە هەڵوەشانەوەی پابەند بوون بە مەرجەکانی ئاگربەستەکەوە.

قلاون بەوەیشەوە نەوەستا، بەڵکوو شاری تەرابلوسیشی گەمارۆدا و لەساڵی ١٢٨٩ ز/٦٨٨ ك.دا دەستیگرت بەسەریدا، مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە قلاون لەبەرەی وشکانیەوە بە سوپا و مەنجەنیقەوە دای بەسەریدا تا ئاستێك زۆرێك لە

دانیشتوانە خاچپەرستەکانی لە بەرەی دەریاوە لەسەر پشتی کەشتیەکان ڕایانکرد بۆ دوورگەیەکی نزیك بە کەناراو کە ناسرا بوو بە دوورگەی(قدیس نیقولا)، بەڵام مەمالیکەکان کەوتنە شوێنیان و هەموویان کوشتن، مێژوونووسی هاوسەردەم ئەبولفیدان دەگێڕنەوە کە سواری کەشتیەکی تەرابلوس بووە بۆ ئەو دوورگەیە دوای ئەوەی خەڵك لە تالانکردنی دەستبەتاڵ بوون، بەڵام بەهۆی بۆن و بۆگەنی کوژراوانەوە نەیتوانیوە تیایدا بمێنێتەوە.[1] هەروەها تێبینی دەکرێت کە سوڵتان قلاون فەرمانیکردووە بە وێرانکردنی شاری تەرابلوس و لەشوێنیدا چەند بورجێکی بە درێژایی کەناراو و لەدەرەوەی بەندەردا بنیاد ناوە و شاری تەرابلوسی گواستەوە بۆ پاڵ شاخەکە لە ناوخۆوە و دوور لە کەناراوی دەرەوەی قەڵای مسنجیل (سان جیل) لە ترسی هەڕەشەی کەشتی گەلی خاچپەرستی.[2] ئەمە و لەهەمان کاتدا قلاون لە پلەوپایەی تەرابلوس بەرز کردەوە وکردی بە جێگیرایەتی سوڵتانی کە جێگری سوڵتان بە دەقێکی سوڵتانی فەرمانڕەوایی دەکرد، لە گرنگترین تایبەتمەندیەکانیشی بریتیبوو لە توندوتۆڵکردنی کاروباری دەریا و ئامادەسازی کەشتیەکان لە بەندەرەکاندا کە تەرابلوس و لازقیە و ئەنترس و جوبەیل (جوبلە)ی دەگرتەوە، میرنسینی عەککا هەستی بە بێهیوایی هەڵوێستی خۆی کرد بەرامبەر بە فراوانخوازی میسری، بەتایبەت دوای ئەوەی هیوای بە هاتنی هەڵمەتێکی خاچپەرستی نەما کە یارمەتی مانەوەی بدات، بۆیە پێی باشبوو پەنا ببات بۆ هەنگاوێکی بەرگریکاری بێهیوایی و دلێرانەیش لەهەمان کاتدا، ئەویش ئەوە بوو کە ئەم دەست بکات بە هێرش بردن و ئاگربەستی نێوان ئەو و قلاون هەڵبوەشێتەوە، لە مەیشدا پشتی دەبەست بە سەختی قەڵاکانی و زۆر ماڵ و سامان و چەکی بەردەستی، ئینجا کەوتە جێبەجێکردنی نەخشەکە و هێرشی بردە سەر بازرگانە موسوڵمانەکان و کاروانەکانی ئەو ڕێگەی لای ئەوان.قلاون بەم کارە بیانووی پێویستی دەسکەوت تا جەنگی دژ بە عەککا ڕابگەیەنێت و کەوتە

---

١ ـ ابوالفداء: المختصر فی اخبار البشر ج٣ ص٣٠.

٢ ـ الامیر صالح بن یحیی: تاریخ بیروت ص٢٢.

ئامادەسازی بۆ هێرشبردنە سەری، بەڵام پێش ئەوەی پرۆژەکەی بەجێبهێنێت لە کۆتاییەکان ساڵی ۱۲۹۰ ز/٦٨٩ ك و لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا مرد.

لەمەی پێشەوە دەبینین سیاسەتی دەرەکی قلاون درێژە پێدەری سیاسەتی پێشینەی بیبرس بووە بەرامبەر بە مەغۆل و خاچپەرستانیش، قلاون زانی چۆن ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە، کە بیبرس بە هەموو شیاوێتیەك بەجێی هێشتبوو.

# سیاسەتی ناوخۆیی قلاون

تایبەت بە سیاسەتی ناوخۆیی قلاون دەبینین وەك بیبرس گرنگی داوە بە ڕێکخستنی سوپای مەملوکی و کەوتە کڕینی زیاتری مەمالیکە بچووکەکانی خەڵکی وڵاتانی باکووری وەك ئەرمینیا و قەوقاز و نیمچە دوورگەی قرم و قفجاق دەڵێن ژمارەیان گەیشووەتە نزیکەی چوار هەزار مەملوك.

قلاون بۆ ئەو دەستە مەملوکیە بورجی قەڵای تایبەتمەند کرد، بۆیە بەوردی ناسران، قلاون گرنگیدابە پەروەردە کردن و ئامادەسازی سەربازی ئیسلامییان، هەروەك گرنگیدان بە بەرگ و پۆشاکیان، دەڵێن قلاون گۆڕانێکی لەشێوەی بەرگیاندا ئەنجام داوە و بەجۆرێك لە شێوەی بەرگی مەممالیکی دەریایی جیا بوو، هەروەك گۆڕانکاری کردووە لەشێوەی زاوتی سەربازیاندا بەتایبەت لەڕێگەی بەکارهێنانی ڕمدا، بەمە مەمالیکەکان لەو هونەرەدا چەند بزاوتێکی جیا لەوانی پێش خۆیان ئەنجامداوە.

مقریزی دەگێڕێتەوە کە قلاون هەمیشە لەکاتی نان خواردنی مەمالیکەکاندا دەچوو و فەرمانی دەکرد تا خۆراك دابنرێت و خۆی تاقی بکاتەوە، ئەگەر کەموکورتیەکی تێدا بدیایە لە ئەستادار (کە سەرپەرشتی هەموو کۆشکە سوڵتانیەکانە) تووڕە دەبوو و سزای سەختی دەدا.

هەروەها دەڵێت: هەموو پاشایان کاری ماڵ و بینایان دەکرد، بەڵام من چەند شوورەیەکم بنیادناوە و چەند قەڵایەکی قایمو قوڵم بۆ خۆم و نەوەکانم و موسوڵمانان سازداوە کە مەمالیکەکان (الخطط ج٢ ص٢١ بۆ ل٦).

ئەو دەستە نوێ مەملوکیە، تا دوای مردنی قلاون یەکانگیر و وابەستەی یەك بوون و کاریگەری گەورەی هەبوو لە ئاڕاستەکردنی سیاسەتی دەوڵەتدا تا کۆتایی دەوڵەت یەکەمی مەملوکی ئەو بورجیانە توانیان دەستەڵات لە بنەماڵەی قلاون دابڕن و دەوڵەتێکی نوێی مەملوکی لە کۆتاییەکانی سەدەی چواردەی زایینی لە سەر دەستی زاهر برقوق دابمەزرێنن.

ئەوکارە دامەزراندو بیناسازیانەی مەلیك مەنسوور قلاون ئەنجامیدان زۆر بوون و هێشتا شوێنەواریان تا ئەمڕۆی ئێمەیش ماوە و لە شەقامی مسکەرانی(موعیز لیدینیللا) لە قاهیرەیە، لە گرنگترین دامەزراوەکانی ئەو گومەزیەیە کە قلاونی تێدا بەخاك سپێردراوە و خوێندنگەکەیەتی، پاشان نەخۆشخانەی مەنسووریە کە ئێستا بە خوێندنگەی قلاون ناسراوە، سێ بیناکەری سەر بەیەك بینایش هەن، بیمارستانیش وشەیەکی فارسیە کە پێکهاتووە لە بیمار واتە نەخۆش و(ستان) واتە شوێن، واتە ئەو شوێنەی کە نەخۆشە جۆر بە جۆرەکانی تێدا چارەسەر دەکرێت، پاشان ئەو وشەیە گەشەی کرد و لەسەر شوێنی دانیشتنی شێتەکان بەرتەسك بوویەوە، هەروەها وشەی گشیی مورستان. (بڕوانە: کتێبی تاریخ البیمارستانات فی الاسلام لاحمد عیسی ص٩٣).

خوێندنگەکەی قلاون یەکەم نەخۆشخانە نەبوو کە لە میسردا بنیاد نرابێت، بەڵکوو میسر چەندین جۆری مارستانی ڕۆژانی تۆلۆنی و ئەخشیدی و فاتیمی و ئەییوبیەکاندا بەخۆوە بینیبوو، دیارە ئەحمەدی کوڕی تۆلۆن مارستانێی بنیادنا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشان و دەرمانخانەیەکیشی پێوە پەیوەست کرد بۆ خەرجکردنی داو و دەرمان، دواتر ناسرا بە مارستانی عەتیق بۆ جیاکردنەوەی لەو مارستانەی تر کە دوای ئەوە دامەزران.

پاشان لێرەدا مارستانێك هەیە کە دەدرێتەوە پاڵ کافوری ئەخشیدی و لەڕۆژانی خیلافەتی فاتیمیدا خەزێنەی ئەشریە دەیبەستێن کە وەك عەیادەی دەرەکی نەخۆشخانەکانی سەردەم وایە، سەلاحەدین کردی بە نەخۆشخانە بۆ نەخۆشان، ئیبن جوبەیری گەشتیاری ئەندەلوسی دەگێڕێتەوە کە لە میسردا دوو مارستانی سەلاحەدینی بینیووە، یەکێکیان لە قاهیرە و ئەوی تریش لە ئەسکەندەریە.

ئەمەو شیاوی ئەوەیە ئاماژە بە مارستانی نوری لە دیمەشق بکەین کە سوڵتان نورەدین مەحموودی زەنگی بنیادی نا کە سەلاحەدین لە کۆشکی ئەودا پێگەیشت.

دەوترێت ئەو نەخۆشخانەی نوریە قلاون چوویە ناوی تا چارەسەر بکرێت کاتێك لە شامدا جەنگی دەکرد، نەزری کرد کە نەخۆشخانەیەکی وەك ئەوە لە قاهیرە

دابمـەزرێنێت ئەگـەر بێتـو لـە نەخۆشـیەکەی ڕزگـاری ببێـت، لەئەنجامـدا ئـەو نەخۆشـخانەی دامەزرانـد کـە لەسـاڵی ١٢٨٤ ز/٦٨٣ ك.دا تـەواو بـوو، لەڕاسـتیدا نەخۆشخانەکانی ئـەوکات بـۆ چـەند بەشـێك دابەشـکرا بـوون کـە هـەر بەشـێکی بـۆ جـۆرێکی نەخۆشـی تایبـەت کرابـوو وەك تـا و چاوئێـشە و نەخۆشـی ئافرەتانـە و دوسـنتایا و شـێت و... هتـد، هـۆڵێکی وتاردانیـشی تێـدا بـوو کـە مامۆسـتاکان لـە هونـەرەکانی پزیـشکی ئەوکاتـەدا وانـەیان تێـدا دەوتـەوە، هـەروەك کارگەیـەکی کیمیایشی پێ پەیوەست بوو بەهەموو جۆرە دەزگایەکی پزیشکی ئەوکاتەوە، بۆیـە ئـەوە بـە بنـەڕەتی یەکـەمی لێکۆڵینـەوەی پزیـشکی دادەنرێـت لـە میـسردا، ئـەو نەخۆشخانەیە هیچ مۆرکێکی ئایینی یان چینایەتی تایبەتی لەخۆ نەگرتبوو، بـەڵکوو دەرگای بۆ هەموو مەزهەب و چینەکان واڵا بوو.

وەسفێکی ئەو نەخۆشخانەیەشمان لایە کە مێـژوو نوسـێکی هاوسـەردەم بـەڵکوو کارمەندێکی ئەو نەخۆشخانەیە کە مێژوو نووسی ناسراو نوەیریە کە لە سـاڵی ١٣٣٢ ز.دا مردووە وەسفی دەکات و بەوپەڕی گرنگیەوە وەسـفی دەکـات، وێـڕای ئـەوەی تیشکێك دەخاتە سەر چەند لایەنێکی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە،(ئـەو وەسـفەی لـە کتێبەکەیدا هێناوە(نهاية الارب في الادب) کە مامۆستای دکتـۆر مومەممـەد موسـتەفا زیـادە لـە کۆتـایی بەشـی یەکـەمی کتێبـی(السلوك) ی مقریـزی (ج١ ص٩٩٧) دا هێناویەتی.

سـەبارەت بـە لایـەنی ئـابووریش، قـلاون گرنگیـەکی زۆری پێـدا و هەوڵیـدا چوارچێوەی ئاسۆی بازرگانی دەوڵـەتی مـەملوکی فـراوان بکـات، پێگـەی جـوگرافی میسریش لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا یارمەتی دا تا لە بزووتنـەوەی بازرگـانی نێـو دەوڵەتیدا ڕۆڵێکی گرنگ ببینێت، لـەو بـوارەوە قـلاون هاوپـەیمانی لەگـەڵ دەوڵەتـە ئەوروپییەکاندا بەست وەك ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی و فەڕەنسا و شانشینی قشتالەو ئەراگۆن لە ئیسپانیا و شانـشینی سـەقلیە کـە سـەربە ئـەراگۆن بـوو و کۆمارەکـانی ئیتالیا وەك جەنەوا و بوندوقیە، میسر لەسەر شمەکە تێپەڕبووەکانی سەر سنووری خۆی گومرگی نزیکەی یەك پێنجی دانابوو کە بە گومرگی یەك پێنج ناسرا بوو.

هەروەها قلاون دەرفەتی ئارامشی دەریاوانی لەدەریای سووردا قۆستەوە دوای ئەوەی مەترسی خاچپەرستی لێ نەما و هەوڵیدا بازرگانانی وڵاتانی ئاسیا بەرەو میسر ڕابکێشێت، شایەتیش بۆ ئەوە ئەو بڵاوکراوە ڕەسمیەیە کە سوڵتان قلاون بڵاوی کردەوە بەسەر ئەو بازرگانانەی لە چین و هند و سند و یەمەن و عێراقەوە هاتبوون بۆ وڵاتەکەی و تیایدا جەختی لەوە دەکردەوە کە خۆیان و ماڵ و سامانیان دەپارێزێت لەوماوەی لە وڵاتەی ئەودان، ئەمەیش بڵاوکرایەوە کێ جوان بوو کە بانگەشەی گەشت و گوزاری ئەمڕۆمان بیر دەخاتەوە، تیایدا دەڵێت:

(هەر کەس بیەوێت بێتە وڵاتی فراوانی ئێمە کە پڕ سێبەرە با عەزم بکات لەسەر ئەو خێرەی کە خوای گەورە بۆی داناوە و بێتە وڵاتێک کە دانیشتوانەکەی پێویستییان نیە بە ڕێکردن و خەزنکردن، چونکە بەهەشتی نەبراوەی دنیایە و گوڵزارێکە کە چاو لێی بێزار نابێت و ئەوەی لێرەیە لە بەهارێکی هەمیشەییدایە و هەمیشە چاکەی دێتە ڕێ و لەچەند وەسفێکی بەسە کە بەهەشتی سەرزەوی خوایە.... جا هەر بازرگانێکی یەمەن و هیند و چین و سند و ناوچەکانی تر کە لە وڵاتەکەیاندا بە بارگە و بنە بەرەو وڵاتمان بپێچنەوە و بەرەو ئێرە بێن و کردارمان لەجێی گوفتارمان ببینن و بەچاکی وەفای زیاترمان بە بەڵێن و قسەمان ببینن و لە وڵاتێکی خۆشدا و لە دڵنیایی و سەلامەتی ماڵ و گیان و بەختەوەریەکی پڕ هیوادا بن و چییان دەوێت لە خزمەتیاندا بن...) (القلقشندی: صبح الاعشی ج١٣ ص٤٠-٣٤٢).

## * سوڵتان ئەشرەف سەلاحەدین خەلیل( ١٢٩٠-١٢٩٢ ز/٦٨٩-٦٩٢ك ):

قلاون وەك بیبرس لەپێشتر هەوڵیدا لەماوەی ژیانی خۆیدا کوڕێکی خۆی بکاتە جێگیر بۆیە ئەکبەر علادینی کوڕی هەڵبژارد و نازناوی مەلیك صالحی لێنا لەساڵی ١٢٨٠ ز و لەوماوەی خۆی لە میسر نەبوو و سەرقاڵی جەنگی مەغول و خاچپەرستان بوو ئەوی لە میسر دادەنا تا فەرمانڕوایی بکات، بەڵام ئەم کوڕەی لەساڵی ١٢٨٨ز و لەسەردەمی باوکیدا مرد، دەڵێن ئەشرەف خەلیلی برای کە کوڕی

دووەمی سوڵتان قلاون بووە ئەوی کوشتوە و ژەهری پێداوە تا دوای ئەو خۆی ببێتە جێگیر. ئەم گێڕانەوە هەر چۆنێك بێتن گرنگ ئەوەیە سوڵتان قلاون گومانی لەوە بوو کە خەلیلی کوڕی شیاو و توانای دەستەلاتی هەبێت، دەڵێن قلاون بەردەوام ئامادە نەبوو و بەیعەتی جێگیرایەتی بە خەلیل بدات تا مرد، لێوەی دەگێڕنەوە کە لەو بارەیەوە وتوویەتی: من خەلیل ناکەمە سەرکردەی موسوڵمانان.[1]

لەگەڵ ئەمەیشدا خەلیل دوای مردنی باوکی لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٢٩٠ ز.دا خەلیل دەستەلاتی وەرگرت. یەکەم ئیش کە کردی تۆڵە سەندنەوە بوو لە پیاوانی باوکی و دەستگرتن بوو بەسەر ماڵ و سامانیاندا، ئەو توند و ڕەقیەکی وای نیشاندا کە ترس و بیمی باوکی بەدیهێنا و لەگەڵ کەموکورتیەکانیشدا کەسێکی دلێر و جەنگاوەری نایاب بوو، لەسەرەتای دەستەلاتەکەیەوە لەسەر سیاسەتی پێشینەی بەرامبەر خاچپەرستان بوو، ئەو سیاسەتە تەلقیدیەی کە هەمیشە ئامانجی ئەوە بوو خاچپەرستان لە شام دەربکات، میرنشینی عەککا لەوکاتەدا کۆتا دەوڵەتی خاچپەرستان بوو لە شامدا.

سوڵتان خەلیل لەبەهاری ساڵی ١٢٩١ ز.دا گەمارۆی شاری عەککای دا، لێرەدا سەرچاوە هاوسەردەمەکان ئاماژە بەتوانای ئامادەسازی و ئەو چەکی گەمارۆدانانەی دەدەن کە لە دەوروبەری شورەکانیدا داینابوو و دەڵێن دەگەیشتنە نزیکەی ٩٢ مەنجەنیق.

لەڕاستیدا شاری عەککا تایبەتمەندی شانوشکۆی بەرگریکاری خۆی هەبوو هەرلە جەنگەکانی سەلاحەدینەوە، خاچپەرستانیش لەڕۆژانی یەکەمیانەوە گرنگیان دەدا بە توند و تۆڵکردنی شورەکانی تا ئەوەی لە قایموقۆڵیدا کرابوو بە نموونە، هۆکاری ئەو گرنگی پێدانەش بریتیە لەوەی کەعەککا وەك دەروازەیەکی سەرەکی دەروازە کەناراویەکانی دەوڵەتی خاچپەرستی دادەنرێت بۆ بەیتولمەقدیس.

---

١ ــ المقريزي:السلوك ج١ ص٧٥٠

کاتێك شارە جیاجیاکانی خاچپەرستان لەڕۆژانی بیبرس و قلاوندا کەوتنەدەست میسریەکان. عەککا بوو بە پەناگەی هەموو ئەو ڕەگەزە خاچپەرستیانەی کە لەو شارانەوە کۆچیان کردووە بۆ ئەوەی ئیتر ئیسپارتەیی بن یان دوای بن یان لە میرنشینی تەرابلوس و ناوچەکانی ترەوە بن.

چاوەڕوان دەکرا ئەو جەختکردنەوەی ڕەگەزە خاچپەرستیەکان هۆکار بووبێت تا شاری عەککا هێزی قەڵاکانی زیاتر بوو بێت، بەڵام ڕاستی و حەقیقەت پێچەوانەی ئەوەیە، چونکە ئەو ڕەگەزە جیاوازانە هەوڵیاندەدا وەك چەند جالیەیەکی سەربەخۆی کاروباری خۆیان و حکومەتی تایبەت بە خۆیان بژین، لەسەر ئەم بنەمایە عەککا لە کۆتا ڕۆژەکانیدا واتە لە کۆتاییەکانی سەدەی سیانزەی زاییندا بوو بەئامازەی کۆمەڵێك دەوڵەتۆکەی بچووکی بەرژەوەندی جیا کە هەندێکیان بەناوی پاشای بە فەڕەنساوە کاریان دەکرد و هەندێکی تریش بەناوی پاشای ئینگلتەرا و هەندێکیش بەناوی پاشای بەیتولمەقدیسەوە کە لە قوبرس دادەنیشت، ئەمە لەپاڵ ڕکەبەری تەقلیدی کۆنی نێوان ئیسپارتە و داویە کە سەرلەنوێ ئاگرەکەی لە مەیدانەکانی عەککادا هەڵگیرسایەوە، بۆیە تەواو سەخت بوو لە عەککا سەرکردایەتییەکی یەککگرتوو هەبێت تا کاری بۆ بکات بۆیە یەکخستن و ئاڕاستەکردنی ئەو هێزە جیاجیایانە بەرەو یەك ئامانج.

بۆیە عەککا سوودی نەبینی لە قایموقۆڵی قەڵاکانی یان لەو فریاگوزاریانەی کە لە قوبرسەوە پێی دەگەیشت(لەوکاتەدا قوبرس بەدەست پاشایانی بنەماڵەی لوزجبناوە بوو کە خۆیان بە ناوی پاشایانی شانشینی خاچپەرستی بەیتولمەقدیس ناودەبرد).

لەڕۆژی هەینیدا١٨ی مایۆیساڵی١٢٩١ز/٦٩٠ك موسوڵمانان لەناکاوێکدا پاش گەمارۆیەکی چل و سێ ڕۆژی چوونە ناو شارەکە و بەرگریکاری گوازرایەوە بۆ قەڵاو بورجەکان، چاوەڕوان دەکرا ئەو قەڵایانە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەرگری بکەن ئەگەر هەندێك لە خەڵکی شارەکە پەنایان بۆ نەبردایەن تا لەوێ خۆیان بپارێزن، ئەمەیش پشێوی تێدا نایەوە و ڕێکخستنی بەرگریکاریەکی درێژ خایەن بوو بە

کارێکی سەخت لەو ناوچە بەرگریکاریانەدا، لەهەمان کاتدا زۆربەی خەڵکی شارەکە بەرەو بەندەری شارەکە چوون و تاقم تاقم دەچوونە ناو کەشتیەکانی ئەوێ بە نیازی ڕاکردن بەرەو قوبرس یان هەر شوێنێکی تر، ئەم قەرەباڵغیە سەختە نوقمبوونی چەند کەشتیەك و ڕوودانی بارگرژی لەهەموو بەشەکانی بەندەرەکەی لێکەوتەوە لەکاتێکدا دەبوو ئەو بەندەرە کراوە بێت بۆ گەیشتنی فریاگوزاری پێناوەکانی بەرگریکاری وەك چەك و خۆراك و شتی پێویست، بەڵام بە پێچەوانەوە بوو.

تێبینی دەکرێت لەنێو ڕاکردووەکاندا پاشای هنری دووەمی پاشای قوبرس و بەیتولمەقدیس هەبوو کە خێرا چوو بۆ ناوچەکەی خۆی لەدوورگەی قوبرس، ژمارەیەکی زۆری سەرکردە و سوارە ئیسپارتەییەکانیش پەیوەستی بوون.

لەگەڵ ئەوەیشدا لە قەڵاکانی شارەکەدا ژمارەیەکی زۆری بەرگریکاران مانەوە بەتایبەت سوارەکانی داویە کە بەردەوام بەرامبەر بەهێرشی میسری وەستان تا هەموویان لەناوچوون دوای ئەوەی شارەکەیان لە ساڵی ١٢٩١ ز/٦٩٠ ك.دا بە تەواوەتی سووتا و کاول بوو.

بەوجۆرە کۆتا پێگەی خاچپەرستی لە ڕۆژهەڵات ڕووخا و بەدوای ئەویشدا ئەو پێگە کەمانەی خاچپەرستی کە مابوون نەمان وەك صور و صیدا و حەیفا و بەیروت، هەموویان بەبێ بەرگری خۆیان بەدەستەوەدا جگە لە بەیروت کە هەوڵی بەرگریکاریدا، بۆیە کوشت و بڕ و وێرانی بوو بە بەشی.[1]

بەوجۆرە کۆتا بەشی مێژووی جەنگە خاچپەرستیەکان لە شام کۆتایی پێدێت، ئیدوارد جبونی مێژوونووسی ئینگلیزی بەم جۆرە وەسفی ئەو بارەمان بۆ دەکات:(بێدەنگی بە درێژایی ئەو کەناراوەدا خۆی سەپاند کە ماوەیەکی دوور و درێژ بوو دەنگی بەریەککەوتنی شمشێری خەبات و جەنگمان لێ دەبیست).[2] لێرەدا پێویستە لەم بارەوە ئاماژە بکەین بەوەی میسر بەدرێژایی ئەو جەنگە

---

١ ـ ابو المحاسن: النجوم الزاهره ص٨ و دواتری

٢ ـ Gibbon: decline and fall of the boman empire

خاچپەرستیانە ڕۆڵێکی ئیجابی کارای بینیوە و تیایدا میحوەری بەرگریکاری ئیسلامی بووە تا ئەوەی لە کۆتاییدا لەسەر دەستی ئەو عەککا ڕووخا و خاچپەرستانی لە شام دەرکرد.

بێگومان ئەو سەرکەوتنە گەورەیە گەورەیی و سۆزی هەموو بەشەکانی جیهانی ئیسلامی بە سوڵتان خەلیل و دەوڵەتی مەمالیك بەخشی.

سوڵتان خەلیل ئەو گورپوتینەی قۆستەوە کە لەڕووخانی عەککاوە لەنێو ڕیزەکانی موسوڵمانانداا کەوتبوویەوە و هەوڵیدا لەدژایەتی مەترسی دووەمدا بیقۆزێتەوە کە ئەویش مەترسی مەغۆلی بوو، جا خەلیفە حاکم بیئەمریللا فەرمانیکرد لەسەر مینبەرەکان جیهادی گشتی ڕابگەیەنرێت، پاشان سوڵتان بە سوپاکانیەوە بەرەو سنوورە فوراتیەکان چووە و دەستیگرت بەسەر قەڵای ڕۆمدا کە تەتارەکان گرتبوویان و ناوی گۆڕی بۆ قەڵای موسوڵمانان، پاشان بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە دەیەوێت مەغۆل لە عێراق دەربکات و بیانگرێتەوە بۆ نشینگەی بنەڕەتی خۆیان.

سوڵتانی مەغۆلی فارس ویستی گاڵتە بەو بانگەشەیانە بکات کە ئەشرەف خەلیل دژبە مەغۆل پێی هەڵدەستا، بۆیە دەقێکی بۆ نارد و تیایدا داوای لێکرد شاری حەلەب بدات بەدەستەوە تا تیایدا بێت وەك چۆن ئیلخانەکانی فارس پێشتر ئەوەیان کردووە، سوڵتانیش نامەیەکی هاوشێوەی بۆ ناردووە و داوای لێکرد بەغدادی بدات بەدەستەوە تا لەوێ نیشتەجێ بێت و خیلافەتی عەبباسیش بگوازێتەوە بۆ ئەوێ.

ئەو دیمەنە جەنگیانەی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی مەغۆل و مەمالیکدا ڕوویدا بەئەنجامێکی ئیجابی کۆتاییان پێ نەهات، ئەمەیش بەهۆی کوژرانی ئەشرەف خەلیل لەسەر دەستی جێگیری سوڵتان میر بەدرەدین بیدرا، ئەمەیش لە ساڵی۱۲۹۳ز و لەکاتی چوونیدا بوو بۆ ڕاوکردن.

ئەمەیش دڵتەنگیەکەی قوتزمان بیر دێنێتەوە کاتێك لەساڵی۱۲٦٠ ز.دا کوژرا، بەڵام لەگەڵ جیاوازیەکدا کە ئەویش ئەوە بوو بیبرس کە لەساڵی۱۲٦٠ ز.دا قوتزی

کوشت خۆی دەستەڵاتی میسری گرتە دەست، بەڵام بیدرا بوو بە ڕاوی دەستی مەمالیکەکانی ئەشرەف کە زۆر بە خراپی کوشتیان.[١]

## *سوڵتان ناسر موحەممەدی کوڕی قلاون(٦٩٣-٧٤١ ك/١٢٩٣-١٣٤٠ز):

دوای مردنی ئەشرەف خەلیلی برای بوو بە سولتان، ئەو هێشتا منداڵ بوو و تەمەنی نۆ ساڵ بوو، نازناوی سوڵتان ناسر موحەممەدی وەرگرت.

لەو دانانە تێناگەین کە سەرکردە مەمالیکەکان کوڕی ئوستادەکەیان قلاون دانابێت وەك ڕێزگرتنی ڕێبازی میراتگری، جا مەمالیکەکان بەدرێژایی مێژوویان دانیان بەو ڕێبازەدا نەدەنا ئەگەر چی هەندێ جار لەبەر پەردەپۆشکردن خواستەکانیان ڕزی ئەو ڕێبازەیان نیشان دەدا، هەرچییەك بێت سەرکردە مەمالیکەکان دوای کوژرانی ئەشرەف خەلیل لەنێوانیاندا سەرکردەیەکی بەهێزیان نەدەدی کە کەسایەتی خۆی بەسەریدا زاڵ بێت و وەك سوڵتان پێی ڕازی بن، بۆیە ئەو منداڵەیان بەکاتی دانا تا لەسەر یەکێك ڕێکبکەون، ئەنجامی ئەو کارەیش ئەوە بوو کە سوڵتان ناسر مەحەممەد دووجار لە ڕێگەی ئەو سەرکردە چاوچنۆکانەوە لابرا.

## * دەستەڵاتی یەکەمی ناسر (١٢٩٣-١٢٩٤ ز/٦٩٣-٦٩٤ ك):

تیایدا بۆ ماوەی ساڵێك فەرمانڕەوایی کرد، پاشان لابرا و دوورخرایەوە بۆ قەڵای کەرك لە باشووری ئوردون، ئەمە لەساڵی١٢٩٤ز.دا بوو، ئەوەی دەستیگرت بەسەر دەستەڵاتدا مەمالیکی باوکی بوو کە میسر حسامەدین لاجینی مەنسوری بوو و جێگیری دەستەڵاتی ناسر بوو.

سوڵتان لاجین ماوەی چوار ساڵ فەرمانڕەوایی میسر و شامی کرد و لەوماوەیەدا چەند کارێکی چاکسازی ئەنجامدا کە گرنگترینیان بریتیبوو لە نوێکردنەوەی بینای مزگەوتی ئیبن تۆلۆن و منارەکەی بوو و زۆرێك لە باجەکانی لەسەر شانی گەل

---

١ ـ المقريزي: السلوك ج١ ص٧٧٨

لابرد، ئەمە وایکرد لای خەڵك خۆشەویست بێت، بەڵام لاجین لەگەڵ ئەوەدا نەیتوانی هەموو سەرکردە مەمالیکەکان ڕازی بکات، بەتایبەت دوای سەرلەنوێ پێوان و دابەشکردنەوەی زەویە کشتوکاڵیەکان بۆ دیاریکردن خەراجی شیاو لەسەریان کە ناسرابوو بە(الروك الحسامی)هەروەك نێوەند و لەسەر حسابکردنەکان لە ڕۆژانیدا بڵاوبویەوە، ئەمە وایکرد سەرکردەکان ڕقیان لێی بکەوێت، بۆیە لەساڵی ١٢٩٨ ز.دا ئەیان کوشت و بۆ جاری دووەم ناسر موحەممەدیان بانگکردەوە.

## * دەستەڵاتی دووەمی ناسر ( ١٢٩٨-١٣٠٨ ز/٦٩٨-٧٠٨ ك ):

دەستەڵاتی دووەمی ناسر ماوەی نزیکەی دە ساڵ درێژەی کێشا و تیایدا قەڵەمڕەوی سەرکردەکان بەهێز بوو و سوڵتانی گەنج لەبەر کەمی تەمەنی نەیتوانی دەست بەسەر بارەکەدا بگرێت، بۆیە لەبەردەم ڕکەبەری توندی نێوان دوو لە گەورە سەرکردەکان کە میر بیبرس جاشنگیر[1] و میر سەلار بوون دەستەوسان وەستا، سوڵتان لەوەوە جۆرەها خراپە و تەنگەبەری دارایی بەخۆیەوە دی، بۆ نمونە داوای لە میر بیبرس جاشنگیرکرد کە مەڕێکی برژاوی لەگەڵ حەلوادا پێ نەدات کەچی ئەو داواکەی وەرنەگرت، لە کۆتاییدا ناسر ناچار بوو لە دەستەڵات دابەزێت و بڕوات بۆ قەڵای کەرك دوور لە سیاسەت و پیلانگێڕیەکانی مەمالیك، سەرچاوەکان دەگێڕنەوە کە ژمارەیەکی زۆری خەڵك بۆ ماڵئاوایی لێکردنی چوونە دەرێ و بە دووری جیابوونەوەی گریان دایگرتبوون.

جاشنگیر دەرفەتی کۆچی سوڵتانی قۆستەوە و دەستەڵاتی بۆ خۆی داگیرکرد و نازناوی سوڵتان موزەفەر ڕوکنەدین بیبرسی لە خۆی نا، میر سەلاریش ڕازیبوو وەك جێگیری دەستەڵات بمێنێتەوە و ماوەی ساڵێك بارەکە وابوو تا دواتر خەڵکی و سەرکردەکان لێی ڕاپەڕین و هوتافیان دەکێشا(یا ناصر یا منصور الله بیخون من یخون ابن قلاون).[2] لەکۆتاییدا ناسر موحەممەد لە ئاهەنگێکی گەورەی جەماوەری

---

١ ـ جاشنگیر ئەو سەرکردە بوو کە پێش سوڵتان نانی دەخوارد نەوەك ژەهر کرابێتە ناو خواردنەکەوە لە ترسی ئەوەی سوڵتان ژەهر خوارد نەکردبێت.

٢ ـ ابوالمحاسن: النجوم الزاهرة ج٨ ص١٧٣.

لەساڵی ١٣٠٩ ز.دا گەڕایەوە بۆ سەر دەستەڵات.

ناسر ئەمجارە دوو دڵی نەنواند لە تۆڵەسەندنەوە لەهەریەك لە بیبرس و سەلار و یەکەمی لە برساندا مراند تا ئەوەی بە برساندا پەنجەکانی خۆی خواردەوە، دووەمیشی لە سێدارە دا.

## دەستەڵاتی سێیەمی ناسر ١٣٠٩-١٣٤٠ ز/٧٠٩-٧٤١ ك:

ئەم ماوەی سێیەمەی فەرمانڕەوایی ناسر مەحەممەد بە ماوەی حەقی دەستەڵاتی حەقیقی ناسر دادەنرێت کە تا مردنی درێژەی کێشا، ئەگەر بڕوانین بۆ ئەو سێ سەردەمەی کە ناسر موحەممەد تیایدا فەرمانڕەوایی کردووە، دەبینین سەردەمەکەی بە درێژترینی سەردەمەکانی سوڵتانە مەمالیکەکان دادەنرێت (کە نزیکەی ٤٣ ساڵ بوو).

بێگومان سوڵتان ناسر موحەممەد بەچەند ئەزمونێکی جیاواز سوودی لە ڕووداوەکانی پێشوو وەرگرت و لە ئاکار و پیلانی مەمالیکەکان و چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیان ئاگادار بوو.

هەروەك لەوکاتەدا تەمەنیشی گەیشتبووە قۆناغی پێگەیشتن کە بیست و پێنج ساڵ بوو، ئەمەیش یارمەتیدا بۆ سەقامگیریشی بۆ دەستەڵات و کۆبوونەوەی کارگێڕی لە دەستیدا.

سوڵتان ناسر موحەممەد بەرامبەر ئەو کێشە سەرەکیانەی ڕووبەڕووی دەوڵەتەکەیان دابوویەوە لەسەر سیاسەتی پێشوانی خۆی دەڕۆیشت، ئەو کێشانەیش کێشەی خاچپەرستی و مەغۆل بوون، دیارە ئەو گرفتانە لەوکاتەدا بەشێوەیەکی باڵا لە بەرژەوەندی موسوڵمانان‌دا گەشەیان سەند چونکە خاچپەرستان بەیەکجارەکی لە میسر دەرکران و کەفوکوڵی خاچپەرستیش لە ئەوروپا لاواز بوو بوو، هەروەك دەوڵەتەکانی مەغۆلی فارسیش لە لاوازیدا بوون کە ئەمەیش لەئەنجامی ئەو جەنگانەدا بوو کە لەلایەك لەگەڵ مەمالیکدا بەرپایان دەکردو لەلایەکی تریشەوە لەگەڵ مەغۆلی قفجاقدا ئەنجامیان دەدان

## * سیاسەتی ناسر موحەممەد لەگەڵ مەغۆلدا:

کاتێك لەکۆتا ڕۆژانی سوڵتان لاجیندا(دەستیگرتبوو بەسەر دەستەڵاتەکەی ناسر موحەممەددا) ناکۆکی کەوتە نێوان سەرکردە مەمالیکەکانەوە، هەندێکیان پەنایان برد بۆلای خانی مەغۆل کە ناوی غازال یان قازان موحەممەدی کوڕی ئەرغون بوو، ئەو موسوڵمان بوو بوو و لەسەر مەزهەبی شیعی بوو، ئەوان باسی باری خراپی میسر و شامیان بۆ کرد و هانیان دا تا هێرش بێنێتە ئەو وڵاتە، غازانیش حەزی دەکرد ئەو ڕۆڵە بگێرێت کە باوباپیرانی لەپێشتردا گێڕاویانە و بتوانێت ئەو پرۆژەیە بەدی بهێنێت کە ئەوان نەیانتوانی بەدیبهێنن کە ئەویش لەناوبردنی دەوڵەتی مەمالیك و دەستگرتن بوو بەسەر میسر و شامدا.

پاشان غازان ڕووباری فوڕاتی بڕی و بەرەو شام چوو، سوڵتان ناسر موحەممەدیش چوو بەرەو ڕووی کە لەوکاتەدا پاش کوژرانی لاجین بۆ جاری دووەم هاتبوویەوە سەر دەستەڵات، لە دۆڵی خازندار لەنێوان حاما و حیمسدا جەنگ لەنێوان هەردوولادا بەڕێوە چوو و ئەویش لە سێپتەمبەری ١٢٩٩ز/٦٩٨ك.دا بوو، لەوجەنگەدا سوپای میسری شکستی خوارد و گەورە سەرکردەکانی ڕایانکرد و سوڵتانی گەنج بەتەنها مایەوە و لە شوێنی خۆیدا دەگریا و تەنها شتێك کە لە مەرگ دەربازی کرد ئەوە بوو کە مەغۆلەکان نەکەوتنە ڕاوەدوونانی مەمالیکەکان لە ترسی ئەوەی نەوەك لەسەر نەریتی جەنگییان بۆسەیان بۆ نابنەوە.

ناسر موحەممەد پاشەکشەی کرد بۆ بەعلەبەگ و لەوێیشەوە بۆ میسر، غازانیش قەڵەمڕەوی خۆی بڵاوکردەوە بەسەر شامدا، دواتر درێژەی بەکشانی خۆی دا بۆ دیمەشق و دەستیگرت بەسەریدا،[1] بەڵام سەرکردە مەمالیکەکان بەو شکستە خۆیان نەدا بەدەستەوە و بۆ جاری دووەم لە قاهیرە بوونەوە بەیەك و چوونەوە بۆ شام تا تۆڵە لە مەغۆل بسێننەوە، کاتێك غازان زانی سوپاکانیان لە دیمەشق نزیك بوونەتەوە، لەوێ پاشەکشەی بە سەربازەکانی کرد و شارەکەی لە پاسەوانی ئەو

---

١ ـ مفضل بن ابى الفضائل: كتاب النهج السدس ص٦٣٥-٦٤ نشر بلوشية.

سەرکردە مەمالیکەکاندا بەجێهێشت کە دابوویانە پاڵ ئەو، وای دەزانی بەو هۆکارە دەتوانێت مەمالیکەکان بکات بە دووبەرەی دژ بەیەك لە یەکتر بدەن.

بەڵام بەپێچەوانەی پێشبینیەکەی غازانەوە ڕوویدا و ئەو مەمالیکانەی کە پێشتر هەوادایان بۆ ئەو نیشان دابوو و بۆ جاری دووەم گەڕانەوە و دایانە پاڵ سوپاکانی ئەو برا مەمالیکانەیان کە هاتبوون بۆ شام، ئەم دیاردەیش لە مێژووی مەمالیك و لەکاتی ئەو بارگرژیانەی هەڕەشە لە قەوارەیان دەکەن بەزۆری بەدیدەکەین، بەوجۆرە دەستەڵاتی مەغۆل لە شام نەما و سەرلەنوێ لەژێر دەستەڵاتی ناسر موحەممەددا یەکڕیزی نێوان میسر و شام گەڕایەوە.

غازان بەرەو ڕووی ئەنجامێك بوویەوە کە چاوەڕوانی نەدەکرد و بیری کردەوە لەوەی سەرلەنوێ هەڵمەتێکی نوێ بنێرێت بەرەو شام، بەڵام ڕوودانی چەند شۆڕشێکی ناوخۆیی لە وڵاتەکەیدا ناچاری کرد تا ئەو پرۆژەیە بۆ ماوەیەك دوابخات، غازان هەوڵیدا بە بەستنی ڕێککەوتنێك لەگەڵ میسریەکاندا گورجوگۆڵی و گوڕوتینیان لاواز بکات، بەڵام سەرکردە مەمالیکیەکان بەفێڵەکەیان زانی و بەرپرچی ئەو ڕێککەوتنەیان دایەوە و هەوڵیاندا بۆ بەهێز کردنی ڕیزەکانیان و خۆ یەکدەنگکردنیان سوود لەو دوا خستنە ببینن.

لەساڵی ١٣٠٣ ز/٧٠٢ ك.دا غازان بە سەرکردایەتی قتلوشاهی سەرکردەی سوپاکانی خۆی بەرەو وڵاتی شام نارد، سوڵتان ناسر موحەممەدیش بە سوپاکانیەوە چوو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی و هەردوولا لە مرجع الصفر لە باشووری دیمەشق و لە مانگی ڕەمەزاندا بەرەو ڕووی یەك بوونەوە و لە کۆتاییدا سەرکەوتن بۆ میسریەکان بوو و میسریەکان پاش ئەوەی نزیکەی دە هەزار سەربازی کوژرا و دیلیان لە دەستدا بەرەو فورات ڕوویان وەرچەرخان.[1]

غازان بەو شکستە تەواو تووڕە بوو و سزا گەلێکی توندی سەرکردەکانی دا و هێندەی نەبرد ئەمیش لە ساڵی دواتردا لە ١٣٠٤ ز.دا بە خەفەتەوە لەتەمەنی سی و

---

١ ـ ابو الفداء: اخبار البشر ج٤ ص٤٩، ئەبولفیدا خۆی لە جەنگەکەدا ئامادە بوو

دوو ساڵێدا مرد، ئەمە بەلایەنی کەمەوە چوارەم جار بوو کە میسریەکان تیایدا توانییان بەسەر مەترسیدارترین دوژمنێکدا سەر بکەون کە لە فەتحی ئیسلامیەوە تا ئەوکات ناسیبێتیان.

لێرەدا گرنگ ئەوەیە کە ئەو سەرکەوتنەی دوایی بەسەر مەغۆلدا بەکۆتا ئەڵقەی زنجیرەی ئەو جەنگە گەورانە دادەنرێت کە لەنێوان دەوڵەتی ئیلخانی مەغۆلی و مەملوکیدا ڕوویاندا، چونکە پەیوەندیەکانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە دوای ئەوە بەرەبەرە باش دەبوو، جا ڕێککەوتنێك لەنێوان ناسر موحەممەد و ئیلخانی نوێی مەغۆلی فارسدا ئەبوو سەعید بەسترا، هەروەك ئیسلامیش بەرەبەرە لەنێوان پاشایان و گەلی دەوڵەتیشدا بڵاودەبوویەوە دەتوانین بڵێین مەترسی مەغۆل دوای جەنگی مەرج صەفەر بەتەواوەتی لەسەر میسر و شام نەما تا سەرەتاکانی سەدەی پانزدەی زایینی کاتێك سەرلەنوێ لەسەر دەستی تەیمورلەنگی سەرکردەی مەغۆلی دەرکەوتەوە

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەبدەین کە ئەو ڕێککەوتنەی لەنێوانیاندا بەسترا هیچ کارێگەریەکی نەبوو لەسەر ئەو دوژمنایەتیە تەقلیدیە کۆنەی کە دەوڵەتی مەمالیکی بەدەست دەوڵەتی مەغۆلی قفجاقەوە یان هۆزی زێڕینەوە لەباکووری دەریای ڕەشدا، کە ئەوکات سەرکردەی بە ئۆزبەك خان ناودەبرا.

دیارە ئەو دەوڵەتە مەغۆلیەی باکوور دوژمنایەتیەکی پتەوی لەگەڵ مەغۆلی فارسدا هەبوو و زۆرجار چەندین جەنگی سەخت لەنێوانیاندا ڕوویدەدا و تیایدا میسر دەیدا پاڵ مەغۆلی هۆزی زێڕین، بەڵام کاتێك دوژمنکاری نێوان مەمالیك و مەغۆلی فارس نەما، ناسر موحەممەد نەیتوانی یارمەتی ئۆزبەك خانی سەرکردەی هۆزی زێڕین و هاوڕێی خۆی بدات دژبە ئەبو سەعیدی ئیلخانی فارس و هەڵوێستی نوێی خۆی بۆ ئەو دەوڵەتە بۆ ڕوون کردەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا هەوڵیدەدا دوژمنکاری نێوان ئەو دوو دەوڵەتە مەغۆلیە نەهێڵێت و هەوڵەکەیشی سەریگرت و هەردوولا ڕێککەوتنیان بەست و بەوەیش کۆتایی بەو گرفتە هات.[1]

---

١ ـ ابن خلدون:العبر و دیوان المبتدأ و الخبر ج٥ ص٤٣١،المقریزی:السلوك ج٢ص٢٠٤-٢١١

## * سیایەتی ناسر موحەممەد لەگەڵ خاچپەرستاندا:

لە ڕاستیدا ئەو کارە جەنگیانەی ناسر موحەممەد دژ بە خاچپەرستان ئەنجامیدان، لەڕاستیدا چەند کارێکی سادە بوون کە وەك پاشکۆیەکی یان دەرئەنجامێکی ئەو کێشە خاچپەرستیە دادەنرا کە لەڕۆژانی ئەشرەف خەلیلی برایدا کۆتایی پێهات.

لە پاشماوەکانی ئەو گرفتە خاچپەرستیانە بریتیبوو لە کێشەی سەرکەشبوونی ئەرمینیا و هاندانی مەغۆلی فارس و پاشایانی ئەورووپا بۆ هێرشبردنە سەر میسر و شام، ئەو دەوڵەتە مەسیحیە لەسەردەمی سوڵتان زاهر بیبرسەوە بەرامبەر بە ئاشتەوایی دەوڵەتی مەمالیك سەرانەیەکی ساڵانەی دەدا بە میسر، ناسر موحەممەد ناچار بوو چەند هەڵمەتێکی تەمێکردن بنێرێتە سەر ئەرمینیا کە لەئەنجامدا ئەو دەوڵەتە ملکەچبوو و دانی نا بە دەستەڵاتداری سوڵتانی میسر و شامدا، هەروەها کێشەی سوارەکانی داویە یان پەرستگاکە پاش ئەوەی ئەشرەف خەلیل دەستیگرت بەسەر عەککادا چەند دەستەیەکیان پاشەکشەیان کرد و لە دوورگەی(ئەرواد) لە دووری سێ میل لە دەریا و لەبەردەم شاری ئەنترتوس لە باکووری تەرابلوس سەقامگیر بوون و کردیان بە بنکەیەك کە لەوێوە شاڵاویان دەبردە سەر بەندەرە شامیەکان بەتایبەت شاری تەرابلوس کە لێوەی نزیك بوو، پاشان ناسر موحەممەد بڕیاریدا ئەو دوورگەیە بگرێت، بۆیە کەشتیگەلی ئامادە کرد و چەکدار و چەك و نەوتی بۆ دابینکرد و سەرکردایەتیەکەیشی دایە دەست سەیفەدین کە هرادش زراق مەنسوری سەرکردەی دەریا.

پاشان لەساڵی٧٠٢ك.دا کەشتیگەلەکە بەرەو تەرابلوس کەوتەڕێو سەرکردە ئوستد مرکرجی بەچەند یەکەیەکی سەربازیەوە دایە پاڵی، پاشان هەڵمەت برایە سەر دوورگەی ئەرواد و پاش وێرانکردنی شورەکانی دەستیان بەسەردا گرت و کوشتارێکیان لێ کردن و نزیکەی پێنج سەدیان لێ بەدیلگیرا، بەوجۆرە کەناراوەکان لە خاچپەرستان چۆڵکرا و کەسیان لە شام نەما مەگەر دیل بوایە یان نەناسرانیەکی دیممی بوایە.

## * پەیوەندیە دیبلۆماسیەکانی ناسر موحەممەد:

دیارە کێشەی خاچپەرستان لەسەردەمی سوڵتان ئەشرەف خەلیلدا کۆتایی پێهات، بەڵام بیرۆکەی جەنگە خاچپەرستیەکان لە ئەندێشەی نووسەر و بانگخواز و کۆمەڵە پاشا و پاپایەکی ئەوروپادا مابویەوە و هەواڵی ئەو پرۆژە خاچپەرستیانە دەگەیشتە قاهیرە، ئەمە وای لە سوڵتانە مەمالیکەکان کرد هەنگاوی پێشینەی جەنگی و دیبلۆماسی پێویست بگرنەبەر تا ڕێ لەو مەترسیە بگرن، جا لە ڕوانگەی دیبلۆماسیەوە دەبینین سوڵتان ناسر موحەممەد سوور بوو لەسەر پتەوکردنی پەیوەندی خۆی لەگەڵ پاشایانی دەوڵەتە ئەوروپی و ئیسلامیەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەمە کۆشکی سوڵتان پڕبوو لە باڵوێزانی ئەو دەوڵەتانە بەجۆرێك نە لە پێشتر و نە لەدواتردا نەبوو، لەوانە خایمی دووەم باس دەکەین(لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا بە جام هاتوو) پاشای شانشینی ئەرجوان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئیسپانیا، ئەو پاشایە سوور بوو لەسەر ئەوەی شەرەفی چاودێری بەرژەوەندی مەسیحیەکانی ڕۆژهەڵات ئیسلامی بەدەست بهێنێت، ئەو بەرژەوەندیانە یان ئایینی بوون وەك زامنکردنی حاجیان و ئازادکردنی دیلەکان و پاسەوانی ئەو مەسیحیانەی لە میسر و شام نیشتەجێ بوون، یان بەرژەوەندی بازرگانی بوون کە پەیوەست بوون بە زامنکردنی باری بازرگانە مەسیحیەکان لەسەر بازرگانی و ماڵ و سامان و گیانیان لەوکاتەی لەسەر سنوورە میسریەکاندا بەتایبەت شاری ئەسکەندەریە، جا باڵوێزەکانی پاشای ئەرجوان لە دەوری ئەو بەرژەوەندیانەدا دەسوڕانەوە، لەبەرامبەر ئەمەیشدا ئەو پاشا ئیسپانیە بەڵێنی دەدا موسوڵمانانی وڵاتەکەی بپارێزێت و دەست وەرنەداتە کاروباری ئایینیان، ناوی(مدجنین)[1] لەو موسوڵمانانە نرا بوو کە لە ژێر دەستەڵاتی ئیسپانیدا بوون.

پاشای فەرەنسایش(فیلیپی شەشەم) یەکێك بوو لە بانگەشەرانی زیندووکردنەوەی بیرۆکەی جەنگی خاچپەرستیەکان بەڵکوو ئەو ئامادەیی خۆی نیشاندا تا سەرکردایەتی هەڵمەتێکی خاچپەرستی بکات بۆ سەر میسر، بەڵام

١ _ Atiya (a.s.): Egypt and aragon p.٢٥

دواجار بۆی دەرکەوت کە ئەو پرۆژەیە سەر ناگرێت بەتایبەت دوای ئەوەی سەرقاڵبوو بە جەنگی سەد ساڵەوە کە لەنێوان فەڕنسا و ئینگلتەرادا ڕوویدا.

پاشای فەڕنسا پێی باشبوو لە چارەسەری کێشەی خاچپەرستیدا پەنا ببرێت بۆ سیاسەتی دانووستان، بۆیە لەساڵی١٣٣٠ز.دا باڵوێزێکی گەورەی لە سەد و بیست باڵوێز نارد بۆ لای سوڵتان ناسر موحەممەد، ئەو باڵوێزانە هەوڵیاندا سوڵتان ڕازی بکەن تا بەیتولمەقدیس بداتە دەست مەسیحیەکانەوە، بەڵام سوڵتان ئەو داوای پشتگوێ خست.[1]

باڵوێزانی دەوڵەتی بیزەنتیش سەرقاڵ بوون بە بەستنی هاوپەیمانیەك لەگەڵ دەوڵەتی مەمالیکدا دژبە دەوڵەتی تازە پێگەیشتووی عوسمانی لە ئاسیای بچووکدا، ئەو دەوڵەتە عوسمانیە بەرەبەرە سنووری خۆی بەرەو ڕۆژئاوا و لە زەویە بەلقانیەکانی سەربە دەوڵەتی بیزەنتیدا فراوان دەکرد و لەهەمان کاتیشدا هەڕەشەی دەکرد لە سنورەکانی باکووری دەوڵەتی مەملوکی بەوەی فشاری دانابوو لەسەر دەوڵەتۆکە تورکمانیەکانی باشووری ئاسیای بچووك وەك قرمانی و زی قادری کە هاوپەیمانیان لەگەڵ مەمالیکەکاندا هەبوو، بۆیە ئەو باڵوێزە بەریتانیە ڕەزامەندی سوڵتان ناسری وەرگرت لەبەر بوونی چەند بەرژەوەندیەکی هاوبەشی نێوان هەردوولا.

سەبارەت بە باڵوێز خانەی پاشایانی دەوڵەتە ئیسلامیەکان باس لە باڵوێز خانەی سەڵتانی دەوڵەتی هیندی ئیسلامی دەکەین لە داهی لەسەر دەستی موحەممەدی کوڕی تلغق شا لە ساڵی ١٣٢٥ز/٧٢٦ك کە مەبەستی بوو لەگەڵ ناسر موحەممەددا دژبە مەغۆلەکانی فارس هاوپەیمانیەتیەك ببەستێت بەوەی میسر و هیند لەیەك کاتدا لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە هێرش ببەنە سەر مەغۆلەکانی فارس، ئەو پرۆژەیش بەهۆی چاکبوونی پەیوەندیەکانی نێوان میسر و دەوڵەتی ئیلخانەکانی فارسەوە وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە سەری نەگرت.

---

١ ـ محمد جمال الدين سرور: دولة بني قلاون في مصر ص٢٧٧

هەروەها سولّتان ناسر موحەممەد گرنگیدا بە پتەوکردنی پەیوەندیەکانی خۆی لەگەلّ دەولّەتی بەنی مەرین یان بەنی عەبدولعەق لە مەغریبی دووردا، لەوکاتەدا سولّتان ئەبولعەسەنی مورینی سولّتانی بوو، جا سەرچاوەکان ئاماژە دەدەن بە بالّوێز و نامە ئالّوگۆڕ کردنی نێوان ئەو دوو دەولّەتە، بەتایبەت ئەو بالّوێزەی کە سولّتان ئەبولعەسەنی مورینی لەسالّی١٣٣٧ ز/٧٣٨ ك.دا بە هاودەمی کاروانی حەجی مەغریبی و لەسەرو هەموویانەوە خاتوو(الحره) ی ژنێکی باوکی نارد، مقریزی بە کچی سولّتان وەسفی دەکات، ئەمە دیاری سولّتانی مەغریبی بۆ سولّتانی میسر هەلّیگرتبوو کە سێ ڕیزی هێستر بوو جگە لە وشتر، ئەوڕۆژە ڕۆژێکی دیار بوو و مقریزی لە کتێبەکەیدا(الذهب المسبوك) لەباسی حەجی خەلیفە و پاشاکاندا باسی دەکات.

## کارە ناوخۆییەکانی ناسر موحەممەد:

ناسر موحەممەد لە سیاسەتی بیناسازیدا لەسەر سیاسەتی قلاونی باوکی چوو و لەسالّی ١٣٠٤ز.دا خوێندنگەی ناسریەی بنیادنا کە تا ئەمڕۆیش شوێنەوارەکەی لەبەشی مزگەرانی قاهیرە ماوە، هەروەها کۆشکی(الابلق) لە قەلاّی شاخ لە سالّی١٣١٣ز.دا بۆیە ئەو ناوەی لێنرا چونکە بەردەکانی ڕەش و سپی بوون(ناوی بالّندەی ئەبلّەق لەمەوە هاتووە، بەلقایش لە باشووری شامدایە) پاشان ئەو مزگەوتەی کە لە سالّی ١٣١٨ز لە قەلاّدا بنیادی نا و بەچەند ماددەیەك ڕازاندیەوە کە لە کاتدرائی عەککاوە هێنابووی، ئەمە لەپالّ حەمام و مزگەوت و تەکیە و پرد و قەنات و کارێز لەهەموو بەشەکانی ولاّتدا کە گرنگترینیان ئەو جۆگاوە بوو کە ئاوی لە نیلەوە دەگواستەوە بۆ قەلاّی سەر شورەکان (مجرى العيون).

ناسر موحەممەد زەویە میسریەکانی پێوانە کردووە و دابەشکاریەکی نوێی بۆ کرد کە لە مێژوودا ناسراوە بە(روکی ناسری)، ئەمەیش بۆ دیاری کردنی باج و خەراجی پێویستی زەویە کشتوکالّیەکان بوو، ئەم چالاکیە بەناوی(فك الزمام) یش ناسراوە.

دیـاره زەوی میـسر لـەپێش سـەردەمی ناسـر موحەممـەددا و لەسـەردەمە ئیسلامیەکانی ناوەڕاستدا شەش جار پێوانە کرابوو،[١] ئەمـەیش بەڵگـەی ئەوەیـە کـە ئەم کارەی ناسر کارێکی نویێ نەبووە، بەڵکوو وادیارە ئامانجی ئەوە بووە لەڕێگـەی کـەمکردنی پـشکی زەویانـەوە لـەکاتی سـەرلەنوێ دابەشـکردنەوەیدا هێـزی مەمالیکەکان کەمبکاتەوە، هەروەك ناسر هەڵکەندنـەوەی کەنـداوی ئەسکەندەریەی لەسـاڵی۷۱۰ك.دا دەسـتپێکردەوەو خەڵکیـشی لەلاکانیـەوە کـشتوکاڵیان دەکـرد، هەروەك گرنگیـدا بەچاککردنی ڕێگـەی حـەج لـە قـاهیرەوە بـۆ مەککـە و مەدینـەی مونەوەرە.

سـەبارەت بـە کەسـایەتی ناسـر، دەتـوانین لەچـەند دیـدێکی کـورتی سەرچـاوە جیاوازەکانەوە بیرۆکەیەکی لێ وەربگرین، لەوانە، باڵا کورت بـووە و ڕەنگـی سـپی و خێلیەك لە چاویدا و شـەلیەك لـە ێیـدا بـووە و دەبـوو لەسـەر گـالۆك ڕێـی بکردایـە ئەمەیش لەبەر ڕووداوێ کە لە ڕۆژانی یەکەمدا تووشـی بـوو کاتێـك لـە قـەڵای کـەرك دوور خرابوویەوە و(درکێك چوو بە پێیدا)، ئەو زۆر حەزی لە ڕاوچێتی بـوو و حـەزی دەکـرد هەمیـشە خـۆی سـەرقاڵ بکـات بـە ئەسـپی ڕەسـەن و بـەردی گرانبـەهاوە، هەرچەنـدە گرانبەهاکانی نەدەپۆشی، چونکە لێوەی دەگێڕنەوە کە لـە جـل و بـەرگ و ڕوخـساریدا سـادە بـووە، هـەروەها ناسـر گرنگـی داوە بـە زانـست و زانایـان، دۆستایەتیەکی پتەو هەبوو لەنێوان ئەو و نێـوان مێـژوونووس مـەلیك موئەیـەد ئـەبو لفیدائی نووسەری کتێبی(المختصر فی اخبار البشر)، وەك ڕوونە ئەبولفیـدا نازنـاوی (مـەلیك موئەیـەدی) بـووە کـە ئـەو نازنـاوە دەدرێتـەوە لای مـەلیك شاهەنـشاهی ئەییوبی برای سەلاحەدین، ناسر موحەممەد هەوڵیدا ڕێزی بگرێت، بۆیە دەسـتەڵاتی باو و باپیرانی بۆ گێڕایەوە کە بریتیە لە ویلایەتی حەما لە شام.

فـەرمانی بـە والیـەکانیش کـرد بـەوجۆرە هەڵـسوکەوتی لەگەڵـدا بکـەن، لـەکاتی بەجێگەیاندنی فەرزی حەجیشدا هاودەم بوون و تەنها بە براکەم بانگی دەکرد.

---

١ ـ علی ابراهیم حسن: تاریخ الممالیك البحریة ص٣٣٢

ئەمە و سوڵتان ناسر موحەممەد پیاوێکی دلێر و نەبەرد بوو، بەڵام خەیاڵاوی و گومانی زۆر بوون بۆیە ژمارەیەکی سەرکردەکان کوشت لەبەرئەوەی گومانی هەبوو لە دڵسۆزی و نیاز پاکییان، بەڵکوو لەسەر دەستەڵاتەکەی تەنانەت گومانی لە کورەکانیشی هەبوو، بۆیە هیچ جێگیرێکی دانەنا، لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنیدا ئەحمەدی کورە گەورەی دوور خستەوە بۆ قەڵای کەرك لەبەر خراپی ڕەفتاری، ئانووکی کوری دووەمیشی لە برای پێشووی باشتر نەبوو و لە کۆتا ڕۆژەکانی باوکیدا مرد، بۆیە ناسر دوو ڕۆژ پێش سەیفەدین ئەبوبەکری کوری سێیەمی لەسەر دەستەڵات دابنێت و ناسر موحەممەد خۆیشی لەساڵی١٣٤٠ز/٧٤١ك و لە تەمەنی ٥٨ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

## دەوڵەتی مەمالیکی یەکەم دوای مردنی ناسر موحەممەد تا کۆتاییەکەی( ١٣٤٠-١٣٨٢ ز/٧٤١-٧٨٤ ك ):

مەرگی ناسر موحەممەد بۆشاییەکی گەورەی وای بەجێهێشت کە هیچکام لە کورو نەوەکانی دوا خۆی نەیانتوانی ئەو چۆڵەوانیە پڕ بکەنەوە.

تێبینی دەکرێت بنەماڵەی قلاونی تەواو لە دڵ ودەرونی خەڵکدا ڕەگی داکوتابوو بە بەڵگەی ئەوەی کوڕ و نەوەکانی ناسر دوای ئەو دەستەڵاتیان دەگرتە دەست تا کۆتایی دەوڵەتی مەمالیکی یەکەم لەساڵی١٣٨٢ز.دا سەرکردە مەمالیکەکانیش لەوکاتەدا هەموو ململانێیان لەسەر ئەوە بوو کە قەڵەمڕەو و ماڵ و سامان بگرنە دەست و گوێیان لە دەستەڵات و کورسی دەستەڵات نەبوو.

لەماوەی دوای مردنی ناسردا تا کۆتایی دەوڵەتی مەملوکی یەکەم کە ماوەی نزیکەی چل و دوو ساڵە (١٣٤٠-١٣٨٢ ز) دوانزە سوڵتان دەستەڵاتیان گرتە دەست کە هەشتیان لە کوڕانی ئەو نەوانەی بوون.

هەموو ئەو سوڵتانانە تەنها بەناو دەستەڵاتدار بوون و دەستەڵاتی حەقیقی بەدەست گەورە سەرکردەکان بوو، ئەو سوڵتانانە منداڵی بچووك بوون و تەنها چەند ساڵ یان چەند مانگێکی کەم سوڵتان دەبوون.

## تەنها دوو کەس لەو سوڵتانانە لەم یاسایە لایان دابوو:

## یەکەم: سوڵتان ناسر حەسەنی کوڕی ناسر موحەممەد بوو کە دووجار بوو بە سوڵتان:

یەکەمیان چوار ساڵی خایاند(١٣٤٧-١٣٥١ ز) و دووەمیش حەوت ساڵی خایاند(١٣٥٤-١٣٦١ ز)، ئەم سوڵتانە وەك باوکی زۆر سەرقاڵی بیناسازی بوو، مزگەوتی گەورە و جوانی(سوڵتان حەسەن) بۆ ئەو دەگەڕێتەوە کە تائێستایش لە شەقامی موحەممەد عەلی(لەپاڵ مزگەوتی الرفاعی) دا وەك قەڵایەکی ماوە، سوڵتان حەسەن لەسەر دەستی یەلبەغاخاسکی جێگیری کوژرا.

سوڵتانی دووەمیش سوڵتان ئەشرەف شەعبان بوو کە لەنەوەی ناسر موحەممەد بوون دەسەڵاتەکەی ئەمیش سیانزە ساڵی خایاند (١٣٦٣٠ -١٣٧٦ ز)، لەسەردەمی ئەمدا شالاوی ڕەشی قوبرسیەکان بۆ سەر شاری ئەسکەندەریە لە ساڵی ١٣٦٥ ز.دا ڕوویدا.

لەگەڵ لاوازی زۆربەی کەسایەتیە سوڵتانەکانی ئەو سەردەمە دوای مردنی ناسر، بەڵام دەوڵەتی مەملوکی هەر بەهێزی و شان و شکۆییەوە مایەوە، ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ باشی کارگێڕی میسر و شام کە لەڕووی نیزام و وردبینیەوە گەیشتبووە ئەوپەڕ بەجۆرێك باشترین کارگێڕی حکومی سەردەمی خۆی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، بۆیە دەبینین لاوازی سوڵتانەکانی دوای ناسر موحەممەد ڕێگر نەبوو لەبەردەم بەردەوامی دیمەنەکانی ژیانی مەملوکیدا وەك پێشتری خۆی هەر لە بنیادنانی مزگەوتی جوان و کۆشکی شکۆدار و پێشوازی وەفد و باڵوێز لە کۆشکی سوڵتاندا کە هێشتا شان و شکۆی پێشووی خۆی مابوو.

ئەوماوەی دوای مردنی ناسر موحەممەد تایبەتمەندی دوو ڕووداوی گرنگی هەیە کە لە کۆتایی ئەو دەوڵەتە یەکەمەی مەملوکیدا کاریگەریەکی گەورەیان هەبوو:

## ڕووداوی یەکەم ناوخۆیی بوو:

ئەویش بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعوون یان مەرگی ڕەش بوو لە میسر و شام و

ناوچەکانی تری ئەفریقیا و ئاسیا و ئەورووپادا، ئەمەیش لەنیوەی سەدەی چواردەی زایینی یان هەشتی کۆچیدا، بێگومان ئەو دەردە کە تیایدا ملیۆنەها مرۆڤ لەناوچوون لەپاڵ تاعوونی ولاخ و وێرانە کشتوکاڵیەکان کە لەئەنجامدا برسێتی و تەنگژەی ئابووری لێکەوتەوە و لەئەنجامدا چەند تەنگژە و بارگرژیەکی سیاسی لێکەوتەوە کە چەندین ناوچەی جیهانی گرتەوە لەوانەیش میسر، ئیبن بەتوتەی گەشتیاری تەنجی کە لەوکاتەدا خۆی لە قاهیرە بوو، وەسفێکی گرنگی ئەو دەردەو شوێنەوارە خراپەکانیمان بۆ دەکات،[1] هەروەها ئیبن خەلدونی مێژوونووسی هاوسەردەم بەدیدە فەلسەفیە گشتگیریەکەی ئەو بارەمان بۆ دەردەبڕێت کاتێك لەپێشەکیەکەیدا بەدواداچونێك لەسەر ئەو دەردە دەکات.[2] (ئەو دەردە وەك چۆن لە رۆژئاوادا هەبوو لە رۆژهەڵاتیشدا هەبوو... وەك ئەوەی زمانی گەردوون لە جیهاندا هاواری تەوەزەلی و بەرتەسکی بکات و ئەویش وەڵامی دایەوە، خوای گەورە خاوەن میراتی زەویە، ئەگەر بارەکان یەکپارچە بگۆڕێت وەك ئەوە وایە دنیا لە بنەڕەتیەوە بگۆڕدرێت و دنیاش وەك دروستکراوێکی نوێ کەوتە دیلی و داوەوە).

## ڕووداوی دووەم دەرەکی بوو:

ئەمە پەیوەستە بەو شاڵاوە دەریاییە دڕندانەی کە پاشای قوبرس بوترسی یەکەم لوزنجان لە ساڵی١٣٦٥ز/٧٦٧ك.دا بردیە سەر شاری ئەسکەندەرییە، ئەمەیش بەیارمەتی سوارە ئیسپارتەییەکانی ڕۆدس و جەنەوی و بوندوقیەکان بوو، ئەو نەفریناویە کاتێکی لەباری بۆ شاڵاوەکەی هەڵبژارد، ئەوکات وەرزی لافاوی نیل بوو و ڕێگەی نێوان قاهیرە و ئەسکەندەرییە تەواو و قوڕاوی بوو و بۆ ئەوە نەدەشا

---

١ ـ پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە دایکی ئەو گەشتیارە ئیبن بەتوتە لەشاری تەنجە بەو دەردە مرد و لەوێش بەخاك سپێردرا

٢ ـ المقدمة ص٢٣، تێبینی دەکرێت ئیبن خەلدونیش لەو دەردەدا باوك و دایکی خۆی لە دەستدایە

فریاگوزاری خێرای سەربازی بێت بۆ ڕزگارکردنی شارەکە، بەڵکوو ئەو فریاگوزاریە دەبوو لەڕێگەیەکی تر بوو لە بیابانەوە کە ڕێگەیەکی دوور و درێژ و سەخت بوون کاتەکەیش کاتی حەج بوو و سەلاحەدینی کوڕی عەرمی بەرپرسی شارەکە لەوێ ئامادە نەبوو تا فەرزی حەج بەجێبهێنێت و جنفر جێگیری بوو کە پیاوێکی نا بەرنامە و بێ مەعریفە بوو، واتە کەسێکی لاواز و ڕاڕا بوو و بۆ باری مەترسیداری لەوجۆرە شیاو نەبوو، وێڕای ئەوەیش سوڵتانی میسر تەمەنی دوانزە ساڵ بوو کە ئەشرەف شەعبانی نەوەی ناسر موحەممەد بوو، لەکاتێکدا دەستەڵاتی حەقیقی لەدەست میسر یەلبەغا خاسکی جێگیری دەسەڵاتدار بوو، ئەمە بوویە هۆی بارگرژی باری ناوخۆیی میسر،بابڵێین بارەکە بەهەموو جۆرێك لە خزمەت دوژمندا بوو.

ئەسکەندەریەکان سەرەتا وایان زانی ئەو کەشتیە خاچپەرستیانە هەمان ئەو کەشتیە بوندقیانەن کە هەموو ساڵێك دەهاتن بۆ بازرگانی، بۆیە بەبینینی دڵخۆش بوون و چوون بە پیریەوە، بەڵام دەبینین بەرەو ڕووی تیرهاوێژی بوونەوە، ئیلخازانییان لەبەردەم مەترسیەکی خاچپەرستیدان، ئەوکات بەپەلە ئامادەسازی کرا بۆ داخستنی دەرگاکان و قەڵاکان پڕبوون لە جەنگاوەر و عەرەبەکانی دەریاچە بانگکران بۆ بەرگریکردن، بەڵام ئەو ئامادەسازیە سەرپێییانە ڕێیان لە خاچپەرستەکان نەگرت تا شارەکە ببڕن و هەندێکیان توانیان بچنە دەروازەی نۆکەندەوە کە لەژێر شورەکان و لە بەندەری ڕۆژهەڵاتیەوە دەڕژانە ناو دەریاوە و بە دیوارەکەدا و لەبەشی ناوخۆییەوە هەڵژنین و لە دەرگای دیوانەوە(گومرگ) کە لەپاڵیدا بوو ئاگر هەڵگیرسا، بەوەیش خاچپەرستان توانیان بچنە ناو ئەسکەندەریە و تاڵان و بڕی بکەن و بیسوتێنن و کوشت و بڕ و بەدیلگرتنی ژمارەیەکی زۆری پیاوان و ئافرەتانیان ئەنجامدا و لەمەیشدا جیا کارییان نەدەکرد لەنێوان موسوڵمانان و مەسیحی و جوولەکەکانی شارەکەدا، دوای چوار ڕۆژی تاڵان و بڕی و وێرانی مەلیك بوترس ناچار بوو پێش ئەوەی سوپا فریاگوزاری میسری پێی بگەن سواری کەشتیگەلەکەی بێتەوە و بەو بڕە دەستکەوتە ڕازی بێت.

ئەو شالاوە گورزێکی کوشندە بوو لەشاری ئەسکەندەریە، چونکە لەوکاتەوە چالاکی بازرگانی و پێگە ئابووریەکەی دایەدواوە، مقریزی قسە لەسەر ئەو بارە دەکات و دەڵێت: (ئەو ڕووداوە لە خراپترین ئەو ڕووداوانە بوو کە تووشی ئەسکەندەریە بوو و لەوێوە باری خراپ بوو و ماڵوسامانی خەڵك کەمیکرد و بەخشش و خۆشگوزەرانیەکان نەما)[1] بێگومان ئەو ڕووداوەی تووشی گرنگترین بەندەری بازرگانی میسری بوو، بە شێوەیەکی گشتی دەرئەنجامی خراپی لەسەر ئابووری میسری هەبوون زۆری ڕکەبەری نێوان سەرکردە موممالیکەکانیش بە شێوەیەکی تونتر لەپێشوو و توشبوونی میسر بەچەند تەنگەژەیەکی دارایی پاڵپشتی ئەوەن، تا ئەوەی دەڵێن دەوڵەت نەیدەتوانی لەبەر هەژاری خۆی زیاتر لە جارێك شمەك بنێرێت بۆ کەعبە.

دوای ئەو دوو تەنگەژەی کە تووشی دەوڵەت بوون کە دەردی تاعون و شالاوی قوبرسیەکان بوون دەوڵەتی مەملوکی یەکەمی ناسراو بە دەریایی هێندە درێژەی نەکێشا و لەکۆتاییدا سەرکردەیەکی مەملوکی بەناوی برقوق توانی پەردە لەسەر ئەو ماوە بارگرژیە و بنەماڵەی قلاونیش لاببات، جا لەساڵی ١٣٨٢ ز/٧٨٤ ك.دا برقوق سوڵتان حجی کۆتا کەسی بنەماڵەی ناسر موحەممەد کوڕی قلاونی لابرد و خۆی وەك سوڵتانی میسر و شام ڕاگەیاند بەناوی مەلیك زاهر سەیفەدین برقوق، بەم سوڵتانە نوێیە دەوڵەتی مەمالیکی دووەم دەستپێدەکات کە ناسراوە بە بورجی(لەبەرئەوەی لە بورجەکانی قەڵادا بوون) یان بە چەرکەسی یان شەرکەسی ناسرا بوون لە ڕووی ناونانی ڕەگەزیەوە، بەڵام ئەو ناونانە لە ڕای مامۆستا زیادەدا ورد و دروست نین، چونکە دەوڵەت تەنها پشتی بە ڕەگەزی شەرکەسیەکان نەدەبەست، بەڵکوو پشتی بەچەند ڕەگەزێکی تری مەملوکی جیاوازی وەك تورکمان و قفجاق و ڕۆم دەبەست، بەوجۆرە بورجەکانی قەڵای(المقتم) پەناگەی چەند دەستەیەکی مەمالیك بوون لەڕۆژانی دەوڵەتی مەمالیکی یەکەمدا، بۆیە دەبینین ئەو

---

[1] ـ بۆ درێژەی ئەو شالاوانە بکەڕێرەوە بۆ ٠ احمد مختار العبادی و السید عبد العزیز سالم: البحریة الاسلامیة فی مصر و الشام ص٣١٢).

ناونانەی پێویستە لەو دەوڵەتە بنیین ناونانی ژمارەییە کەدەوڵەتی مەمالیکی دووەمە.[١]

لەڕاستیدا ئەو دەوڵەتە درێژە پێدەری دەوڵەتی مەمالیکی یەکەم بوو لە سیاسەت و نەریت و ڕێکخستنەکەدانیدا بەشێوەیەکی گشتی، ئەوەی وای لێکرد بە دەوڵەتێکی جیا دابنرێت، دەگەڕێتەوە بۆ دامەزرێنەرەکەی کە سوڵتان برقوقە کە توانی دەستەڵاتی بنەماڵەی قلاون لەناو ببات و دەستەڵات بۆخۆی بگرێتە دەست، ئەمە لەناوبەری ئەو ڕێبازە میراتگریە بوو کە دەوڵەتی مەملوکی یەکەم لەکۆتا ڕۆژەکانیدا هەوڵیدا وەك پێناوێکی مانەوە و بەردەوامبوونی پەیڕەوی بکات.

---

١ ـ محمد مصطفى زيادة: بعض الملاحظات جديدة فى تاريخ دولة المماليك فى مصر ن مجلة كلية الاداب القاهرة ن سنة ١٩٣٦

## چەند سەرچاوەیەکی گرنگ لە مێژووی ئەییووبی و مەمالیکەکاندا

### ١ـ ئەبوو عەلی موحیەدینی فەخمی ناسراو بە( القاضي الفاضل )( کۆچکردووی٥٩٦ك ):

لە عەسقەلان لە دایکبووە و لە میسر گەورە بووە و لە دیوانی ئینشا لە قاهیرە لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی فاتیمی کاری کردووە، دوای ڕووخانی ئەودەوڵەتە وەك نووسەری شێرکۆ و دواتریش سەلاحەدین ئیشی کردووە، قازی فازیل لە فێرکردنی نهێنیەکانی دەستەڵات و بنەما سەربازی و کارگێڕی و داراییەکانی دەستەڵاتدا بەرامبەر بە سەلاحەدین دڵسۆزی نواند، سەلاحەدینیش کردی بە وەزیر و ڕاوێژکاری یەکەمی خۆی و هەمیشە ڕاوێژکاری پێ دەکرد و گوێی لە ئامۆژگاریەکانی دەگرت.

قازی فازیل لەشێوەی چەند نامەیەکی ڕیزبەندی ڕۆژانەدا هەموو دیمانەکانی خۆی تۆمار کردووە و زیاتر لە ڕۆژنامەیەکی ڕەسمی ڕۆژانەی دیوانی ئینشا دەچوو، ئەو نامە ناردنانەی دەگرتەوە کە لەنێوان سەلاحەدین و پاشا خاچپەرستیەکان و سەرکردەکانی موسوڵماناندا هەبوو و هەموویان لە داڕشتنی قازی فازیل بوون.

بەداخەوە ئەو نامانە لەیەك کتێبدا کۆنەکرانەوە، بەڵکوو لەچەند کتێبێکی مێژوونووسانی دواتریدا دابەشبوون وەك ئەبوو شامە لە کتێبی(الروضتين) و قلقشندی لە(صبح الاعشى).

### ٢- عیمادەدین موحەممەد ئەسفەهانی ( م ٥٩٧ ك ):

نازناوی(الكاتب) ی هەیە چونکە وەك نووسەری نورەدین و دواتریش سەلاحەدین ئیشی دەکرد، عیماد هەمیشە لەگەڵ سەلاحەدیندا وەك مێژوونووسێکی جەنگی دەهات و دەچوو و لە کتێبەکانیدا چەندین هەواڵی جەنگ و سەرکەوتنەکانی سەلاحەدینی بۆ گواستوینەتەوە.

# لە گرنگترین کتێبەکانی عیمادەدین ئەسفەهانی

ا–البرق الشامی: تیایدا باس لەوە دەکات کە لەوکاتەی لە خزمەت نورەدین و سەلاحەدیندا بووە چی هاتوەتە ڕێی وەك چۆن قسە لەسەر فتوحاتەکتنی ئەو دوو پاڵەوانە لە شامدا دەکات، ئەو کتێبە هێشتا دەستنووسە.

ب– الفتح القسی فی الفتح القدسی: تیایدا باسی فەتحی بەیتولمەقدیسی سەلاحەدین و ململانێی لەگەڵ هەڵمەتی سێیەمی خاچپەرستیدا دەکات، لە قاهیرە لەساڵی ١٣٢١ك. چاپکراوە.

ج–خریدە القصر و جریدە العصر –بەشی یەکەم لەبارەی شاعیرانی میسر – تیایدا باسی شاعیرانی سەردەمی خۆی دەکات، بەڵام لەهەمان کاتدا کار و جەنگەکانی سەلاحەدین وێنە دەکات و سەرچاوەیەکی مێژوویی ئەدەبیە، ئەو بەشە لە قاهیرە لە دوو بەشدا(١٩٥١–١٩٥٢ ز) چاپکراوە و ئەحمەد ئەمین و شەوقی زەیف و ئیحسان عەبباس بڵاویان کردەوە.

د– دولە السلجوق: مێژوویەکی گشتی سەلجوقیەکان و ئەتابەگەکانیانە، ئەو کتێبە لە قاهیرە لەساڵی ١٩٠٠ ز بڵاوکرایەوە.

## ٣- ئوسامە ئیبن مونقیز (م ٥٨٣ ك):

سەرکردەیەکی مونقیزیەکانی سەرکردەکانی قەڵای شینزری سەر ڕووباری عاسی باکووری شام بووە و ئەو شوێنە تا ئەمڕۆیش ناسراوە بە(سیجر) و ڕەمیل لە باکووری حەما لەبەرەی ڕۆژئاوای ڕووباری عاسیە، خاچپەرستان لەبەر سەختی قەڵای شینزر و بوونی ڕووباری عاصی لە چواردەوریدا نەیانتوانی قەڵاکە بگرن، بۆیە ئوسامە بەپێی دراوسێیەتی لەگەڵ خاچپەرستاندا توانی شایەتحاڵی زۆربەی ئەو ڕووداوانە بێت کە لە ناوچەکەدا بەڕێوە چوون، ئەمە وێڕای ئەوەی سەردانی زۆربەی پایتەختە ئیسلامیەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی کردووە و لە ڕۆژانێکیشدا کە لە

فەلەستین لەژێر دەستی خاچپەرستاندا بووە سەردانی فەلەستینی کردووە و لەگەڵ چەند پاشایەکیاندا پەیوەندی هەبووەو چەند پەیوەندیەکی تایبەتی و گرفت و دۆستایەتیەکی لەگەڵیاندا هەبووە، ئەو هەموو دیمەنەکانی یان دەوەریەکانی خۆی لەبارەی ئەو وڵاتەوە لەو کتێبەیدا تۆمار کردووە کە ناوی ناوە(کتاب الاعتبار)، ئەم کتێبە بەڵگە نامەیەکی مێژوویی ماوەی جەنگە خاچپەرستیەکانی ئەوکاتە دادەنرێت چ لەڕووی ئیسلامی یان لای مەسیحیەکانەوە بێت، وێڕای ئەوەی چەند وێنەیەکی بەراوردکاری نێوان نەریتی موسوڵمانان و فرەنجەکان لەخۆدەگرێت کە خودی ئوسامە بینیونی، ئوسامە جێی سەرسامی هاوسەردەمەکانی بوو، جا زەهەبی بە پاڵەوانێکی ئیسلام ناوی دەبات و ئیبنولئەسیریش بە ئەوپەڕی دلێری وەسفی دەکات و عیمادەدینی ئەسفەهانیش بە شاعیر بوون و ئەدەبیدا هەڵدەدات لە کتێبی(خریدە القصر) دا، هەروەها ئەبوو شامەیش ئاماژە بەوە دەدات کە سەلاحەدین دیوانەکەی ئوسامەی لەبیر نەکرد و بە شیعرەکانی سەرسام بوو، ئوسامە لەساڵی٥٨٣ ك لە دیمەشق مرد، چەند کتێبێکی بەجێ هێشتووە کە گرنگترینیان(کتاب الاعتبار)ە کە یەکەمجار درنبۆرگی ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی بڵاوی کردەوە، پاشان (فیلیث حتی) پاش ڕاستکردنەوەی چەندین هەڵە بڵاوی کردەوە و دواتر وەرگێڕایە سەرزمانی ئینگلیزی،ئەمە لەپاڵ وەرگێڕانەئەڵمانیەکەی درنبۆرگ و فەڕەنسیەکەی شۆمان دا.

ئوسامە بەناونانی ناونیشانی کتێبەکەی(الاعتبار) ویستویوتی خوێنەر پەند وەربگرێت لەو ڕووداوانەی تووشی کەسانی تر بووە و مەترسییەکانی ئەجەلی نووسراو دیاریکراو ناگۆڕێن.

## ٤- گەشتیاری ئەندەلوسی ئیبن جوبەیر (م ٦٣٢ ك/١٢٣٤ ز):

لە کۆتاییەکانی سەدەی شەشەمی کۆچیدا(١٢ز) سەردانی شامی کردووە و لە کتێبەکەیدا (تذکرة باالاخبار عن اتفاقیات الاسفار) باسی گەشتەکەی کردووە، چەند جارێك لەژێر ناوی (رحلة ابن جبیر) بڵاوکراوەتەوە، گرنگترین شتێك تیایدا هاتووە

وەسفی هاریکاری کشتوکاڵی و بازرگانی و پیشەسازی نێوان موسوڵمانان و خاچپەرستانە لە میرنشینە خاچپەرستیەکاندا، ئەمەیش لەبەرئەوەی خاچپەرستان هەستیان بەوە کردبوو کە مانەوەیان لە میرنشینەکاندا لەسەر هاریکاری و تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە و توانەوە لەگەڵیاندا وەستان، ئیبن جوبەیر لە ئەسکەندەریە مرد و لەوێش بەخاك سپێردرا، دەڵێن لە مەزارگەی(سیدی جابر) ی ئێستایە و خەڵکی ناوەکەیان گۆڕیوە.

## ٥- بەهائەدین ئیبن شداد( م ٦٣٢ ك/ ١٢٣٤ز):

هاوسەردەمی سەلاحەدینی ئەییووبی بووە و کتێبێکی لەبارەوە نووسیووە و ژیانی هێناوە و ناوی ناوە(النوادر السلطانیة و المحاسن الیوسفیة)، یەکەمجار شولتنز لەساڵی١٧٥٥ز بڵاوی کردەوە، پاشان لەساڵی(١٣ ك) لە قاهیرە بڵاوکرایەوە، پاشان لە کۆتاییدا لەساڵی ١٩٦٤ ز جەمالەدین شیال بڵاوی کردەوە، هەروەك کوندر لەساڵی ١٨٩٧ ئەو کتێبەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی.

پێویستە بەهائەدین ئیبن شداد لە عیزەدین موحەممەد ئیبن شداد جیابکرێنەوە کە پەنجا ساڵ دوای ئەو ژیاوە، لەهەمان شاری حەلەب ژیاوە و لەساڵی (٦٨٤ ك/١٢٨٥ ز) لەوێ مردووە، کە ئەمیش کتێبێکی لەبارەی سوڵتانی ئەوکات زاهیر بیبرس نووسیووە بەناونیشانی (الروض الزاهر فی سیرة الملك الظاهر).

## ٦- جەمالەدین ئیبن واسیلی حەمەوی کۆچکردووی ٦٨٧-١٢٩٧ ز( مفرج الکروب فی اخبار بنی ایوب ):

گرنگی ئەو کتێبە لەوەدایە کە نووسەرەکەی لەمیسر ژیاوە و هاوسەردەمی ڕووخانی دەوڵەت ئەییووبی و دامەزراندنی دەوڵەتی مەمالیکە لە میسر، بۆیە لەبەرئەوەی شایەتحاڵ بووە بۆیە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ئەوماوەیە بەهای خۆیان هەیە، دکتۆر جەمالەدین شەیال بەشی یەکەم و دووەم و سێیەمی ئەو کتێبەی بڵاوکردۆتەوە و مێژووی ئەییووبیەکانی تا کۆتایی سەردەمی سەلاحەدین هێناوە،

بەشی کۆتایی کتێبەکەیش دوو بەشی چوارەم و پێنجەم لەخۆ دەگرێت کە د. ربیع حسنین و د. سعید عاشور بڵاویان کردونەتەوە.

## ٧- شەهابەدین ئەبووشامەی دیمەشقی کۆچکردووی ٦٦٥ ك/١٢٦٨ز:

ئەم مێژوونووسە هاوسەردەمی ئیبن واسلە و لەشام دانیشتووە،بۆیە بەشێوەیەکی تایبەت گرنگی بە ڕووداوەکانی شام داوە، لەبەرئەوەی لە ڕۆژانی ئەییوبی و مەملوکیشدا شام و میسر یەك دەوڵەتیان پێکهێناوە بۆیە ڕووداوەکانیان تەواو پەیوەستی یەکتر بوون، ئەمەیش گرنگی نووسینەکانی ئەبی شامان بۆ ڕاڤە دەکات و ئەو مێژوونووسە دوو کتێبی نووسیوە:

ا- کتاب الروضتین في اخبار الدولتین النوریة و الصلاحیة: کە دووبەش لەخۆدەگرێت و مێژووی دەوڵەتەکەی نورەدین زەنگی و دەوڵەتەکەی سەلاحەدینی ئەییووبی دێنێت، لە قاهیرە لەساڵی (١٢٨٧ ك) ی چاپکراوە.

ب- کتاب الذیل علی الروضتین: ماوەی گواستنەوەی نێوان ئەیوبی و مەمالیکەکان لەخۆ دەگرێت و عیزەت عەتار حوسەینی بەناونیشانی(تراجع الرجال القرنین السادس و السابع الهجري) لە قاهیرە لەساڵی ١٩٤٧ ز بڵاوی کردەوە.

## ٨- الملك المؤید ابو الفداء: المختصر فی اخبار البشر ( چوار بەش لە دوو بەرگدا ):

نووسەری ئەم کتێبە سەرکردەیەکی نەوەی ئەییووبییەکان و بەرپرسی شاری حما بوو لە ڕۆژانی سوڵتانی مەملوکی ناسر موحەممەد کوڕی قلاوندا، دۆستایەتیەکی پتەو بەو سوڵتانەی دەبەستەوە و زۆربەی جار بۆ بەجێگەیاندنی فەرزی حەج هاودەمی دەبوو، سوڵتانیش هەرکات بانگی بکردایە پێی دەوت براکەم، ئەبولفیدا بەپێی پێگە و قەڵەمڕەوی توانی بەڵگەنامە و کتێبە گرنگەکان بەدەستبخات و مێژوویەکی ڕاست و زۆر گرنگمان بۆ بنووسێت کە ئەویش بریتیە لە (المختصر في اخبار البشر) ئەبولفیدا لەساڵی ٧٣٢ ك/١٣٣١ ز.دا مرد.

لێرەدا چەند کتێبێکی تر وەك مەسعویەکی مێژوویی هەن کە مێژووی ئیسلامی میسری دەگرتەوەو چەند مێژوونووسێکی میسری نووسیبویان لەسەدەی هەشتەم و نۆیەمی کۆچیدا ژیاون، لە کەلەپوور و هەوڵەکانی مێژوونووسانی ئەو کاتەیان بۆ پاراستوین کە بەتێپەڕبوونی ساڵان کتێبەکانیان فەوتان و نەگەیشتونەتە دەست ئێمە.

## گرنگترین ئەو مێژوونووسانەی سەردەمی مەملوکییان تۆمار کردووە بریتین لە:

## ٩- تەقیەدین ئەحمەد مقریزی کۆچکردووی ساڵی٨٤٥ ك/١٤٤٢ ز واتە سەردەمی دووەمی مەملوکی:

بەڕاستی بە گەورەی مێژوونووسە میسریەکانی سەردەمەکانی ناوەڕاست دادەنرێت، هێندە بەسە ئاماژە بەوە بدەین کە خوێندکاری فەیلەسوفی مێژوونوسانی موسوڵمانە ئیبن خەلدونی نووسەری(المقدمة) و مقریزی مێژوونوسی میسری قاهیر بووە، لە قاهیرە لەدایك بووە و لەوێش مردووە، وشەی مقریزی دەدرێتەوە پاڵ کۆڵانی لمقارزە لە شاری بەعلەبەك کە خێزانەکەی پێشتر لەوێ بوون و دواتر لە ژیانی باوکیدا چوون بۆ میسر.

## مقریزی چەندین کتێبی لە مێژووی ئیسلامی میسردا نووسیووە و لەبارەی سەردەمی مەمالیکەوە ئەمانەی لا گرنگە:

أ ـ السلوك لمعرفه دول الملوك: مێژووی میسر لەسەردەمی ئەییووبی و مەملوکی تا ساڵی ٨٤٤ ك دێنێت، موحەممەد موستەفا زیادە بەشی یەکەم و دووەمی لێ بڵاوکردۆتەوە کە بە سەردەمی ناسر موحەممەدی کوڕی قلاون واتە تاساڵی ٧٤١ ك کۆتایی پێدێنێت، پاشان سەعید عاشور بەشی سێیەم و چوارەمی بڵاوکردۆتەوە.

ب- الموعظ و الاعتبار بذکر الخطط و الاثار: وەك کورت بێژی بە(الخطط) ناسراوە، ئەو کتێبە دیدێکی ڕوونمان لەمەڕ ژیار و شوێنەواری مەمالیکی لە میسردا پێدەبەخشێت و وێنەی کۆمەڵگەی میسری ئەوکاتمان بۆ دەکێشێت، کتێبەکە لە چاپی بولاق لە قاهیرە دوو بەرگە، چاپێکی تریشی لە چاپخانەی نیل لە چوار بەرگدا هەیە، بەڵام یەکەمیان ڕاست و دروسترە.

ج- اغاثة الامة بكشف الغمة: تیایدا مقریزی باس لە لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەکات و ئەو ڕووداوە مێژووییانەی پێ ڕاڤە دەکات کە تووشی میسر بوون، بێگومان مقریزی لەو ئاڕاستەیەدا کاریگەر بووە بە ئیبن خەلدونی مامۆستای لە(مقدمة) کەیدا.

دکتۆر موحەممەد موستەفا زیادە و دکتۆر جەمالە دین شەیال ئەم کتێبەیان بڵاوکردۆتەوە و دکتۆر حوسەین فەهمی پێشەکیەکی ئابووری گرنگی بۆ نووسیووە.

د- البيان و الاعاب عما بارز مصر من الاعراب: کتێبێکی بچووکە ئاماژە بەو شۆڕشەی عەرەب دەکات کە لە ڕۆژانی سوڵتان ئەیبەگ ڕوویدا، موحەممەد عابدین بڵاوی کردۆتەوە.

## ١٠- ئەبولمەحاسین ئیبن تغری بەردی کۆچکردووی ساڵی ٨٧٤ ك/١٤٦٥ز:

لە خوێندکارەکانی مقریزیە و مەوسوعەیەکی گرنگی لەسەر مێژووی سیاسی میسر لە سەردەمەکانی ناوەڕاستەوە هەرلە فەتحی ئیسلامیەوە تا سەردەمی خۆی نووسیووە و ناوی ناوە(النجوم الزاهرة فی محاسن ملوك مصروالقاهرة) ئێمە بەرگەکانی ٩،٨،٧ مان لاگرنگە، ئەم کتێبە لە خستنەڕوو دابەشکاریدا تایبەتە و ژیاننامەیەکی سەربەخۆی بۆ هەر سوڵتانێکی مەملوکی هێناوە و لەکۆتایی هەرکامیاندا ئەو ڕووداوانە دێنێت کە لەسەردەمی ئەو کەسەدا تووشی جیهانی ئیسلامی بووە، ئەمەیش بەپێی ساڵ، ئەبولمەحاسیس شتێکی تری هەیە کە هێشتا دەستنووسە، بەناوی(المنهل الصافي و المستوفي بعد الوافي) ئەم کتێبە زۆر گرنگە چونکە نوسەر هەندێ شتی هێناوە کە لە (النجوم الزاهرة)دا نەیهێناوە، هەروەك هەندێ هەڵەی ناو(النجوم الزاهرة) ی ڕاست کردۆتەوە.

## ١١- جەلالەدینی سیوتی:

لە کۆتاییەکانی سەردەمی مەمالیکدا ژیاوە و لەساڵی ١٩١١ ك/١٥٠٥ ز.دا

مردووەو دوو کتێبی گرنگی لەسەر ئەو سەردەمانە هەیە:

ا– حسن المحاظرة في اخبار مصر و القاهرة (دوو بەش لە بەرگێکدا).

ب– تاریخ الخلفاء امراء المؤ منین(لەسەدەی یەکەمی کۆچی تا سەردەمی سوڵتان ئەشرەف قایتبای ٩٠١ ك).

## ١٢- ئیبن ئیاسی میسری:

ئەمیش لە کۆتایی دەوڵەتی مەملوکیدا ژیاوە و هاوسەردەمی ڕووخانی بووە لەسەر دەستی عوسمانیەکان، لەساڵی٩٣٠ ك/١٥٢٣ ز مردووە و مێژوویەکی گشتی میسری تا ڕۆژانی خۆی نووسیوە و ناوی ناوە(بدائع الزهور فی وقائع الدهور) سێ بەشە.

## ١٣- قلقشندی: ئەحمەدی کوڕی عەلی (م ٨٢١ ك / ١٤١٨ ز).

مێژوونووسێکی میسرییە لە شارۆچکەی قلقشندەی سەربە پارێزگای قلیوبیە، مەوسوعەیەکی ئەدەبی مێژوویی بەناوی(صبح الاعشي في صناعة الانشا) لە چواردە بەشدا نووسیوە، ئێمە بەشی چوارەمیمان لاگرنگە کەباس لەیەکە جیاجیاکانی دەسەڵاتی ناو دەوڵەتی مەملوکی دەکات وەك سوپا و پۆسە و دادگا جل و بەرگ و بۆنە و جەژن و ئاهەنگەکان و... هتد، ڕۆژهەڵاتناسانیش لەبەر گرنگیەکەی پشتیان پێ بەستووە.

# پاشکۆی ژمارە ١

وتاری هەڕەشە ئامێز کە هۆلاکۆ ناردی بۆ سولْتان سیف الدین قتز سولْتانی میسر کەمێك پێش جەنگی عەین جالوت.[1]

## لە پادشای پادشاکانی خۆرهەلاّت و خۆرئاوا، قانی گەورە.

بەناوی خودای ڕاخەری زەوی، بەرزکەرەوەی ئاسمان، پادشا قتز خۆی دەزانێت کە یەکێکە لە کۆیلەکان کە ڕایان کردووە لە شمشێری ئێمە بۆ ئەم هەرێمە،[2] لەناو نیعمەتەکانیدا ڕادەبوێرن، وە بەهۆی دەسەلاّتیانەوە خەلّك دەکوژن، پادشا تز خۆی دەزانێ، وە هەموو میرەکانی دەوڵەتەکەیشی لە ولاّتی میسر و دەوروبەری دەزانن، کە ئێمە سەربازی خوداین لە زەویدا، لە تورەیی خودا دروست بووین، وە زاڵی کردین بەسەر ئەوانەی کە خالێیان تورە بوو، ئێوە دەبێ لەو هەموو ولاّتانە پەند وەربگرن، وە لەڕاستی هەڕەشەمان تێبگەن، دەی پەند وەربگرن لە خەلّکی، کار و فرمانتان بدەنە دەستمان، پێش ئەوەی پەردە لادرێ و پەشیمان بنەوە، وە هەڵە بەسەرتاندا بگەڕێتەوە، چونکە ئێمە بەزەییمان بە کەسێکدا نایەتەوە کە بگری، وە دلّمان نەرم نابێت بۆ کەسێ کە سکالاّ بکات، وە ئێوە بیستوتانە کە ئێمە هەموو ولاّتانمان داگیر کردووە، وە زەویمان لە خراپەکاری پاك کردۆتەوە، وە زۆربەی خەلّکمان کوشتووە، ئیتر ئێوە دەبێ ڕابکەن و ئێمە دواتان بکەوین، ئیتر کام زەوی جێتان دەکاتەوە، وە کام ڕێگا ڕزگارتان دەکات، وە کام ولاّت دەتانپارێزێ ئێوە لە شمشێرەکانی ئێمە ڕزگارتان نابێ، وە لەهەلّمەت و ئازایەتیمان پەناتان نیە، ئەسپەکانمان خێران، تیرەکانمان کونکەرن، شمشێرەکانمان بروسکەن، دلّەکانمان وەك چیاکانن، وە ژمارەمان وەك لمە، قەلاّکان لای ئێمە نابێتە ڕێگر، وە سوپاکان بۆ جەنگ دژی ئێمە بێ سوودە، وە

---

١ ـ المقریزی: السلوك ج٢ ل٤٢٧– ل٤٢٩ بکەڕێرەوە بۆنەوەی باسمان کرد دەربارەی ئەم نامەیە لە شوێنی خۆیدا

٢ ـ ئاماژەیە بۆ بنەچەی قطز، ﷺ پێشتر باسکرا کە قگز خوارەزمی بوو.

نزاکانتان لای ئێمە نابیستریٚ، ئێوە حەرامتان خواردووە، وە لەکاتی قسەدا لێبوردنان نیە، وە ناپاکیتان کردووە لە بەڵێن و پەیماندا، وە لەناوتاندا خراپە و سەرپێچی بڵاوبۆتەوە، دەی مژدەتان لیٚ بیٚ کە سەرشۆڕ و بیٚ نرخ دەبن، ئەمڕۆ پاداشتان دەدرێتەوە بەسزای ڕیسواکەر چونکە لوت بەرز بوون لە زەویدا بە بیٚ هەق، وە بەهۆی فاسق بوونتان، وە لە داهاتوودا ستەمکاران دەزانن چ پاشە ڕۆژێك چاوەڕوانیان دەکات، هەرکەس داخوازی لە ئێمە بێت پەشیمان دەبێتەوە، وە هەرکەس مەبەستی پەنادان بێت لێمان سەلامەت دەبیٚ، ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی مەرج و فەرمانەکانمان بن، ئەوا ئەوەی بۆ ئێمە بێت بۆ ئێوەش هەیە، وە ئەوەی لەسەرمانە لەسەر ئێوەش دەبیٚ، وە ئەگەر سەرپێچی بکەن لەناو دەچن، دەی بە دەستی خۆتان خۆتان لەناو مەبەن، هەرکەس ئاگادار کرایەوە با بترسیٚ، وە ئەو لای ئێوە چەسپاوە کە ئێمە کافرین، وە ئەوەش لای ئێمە چەسپاوە کە ئێوە گوناهبارن، وە ئەو کەسەی کە فەرمانەکان و حوکمی بە دەستە ئێمەی زاڵ کردووە بەسەرتانا، زۆریەکەتان لای ئێمە کەمە، وە دەسەڵاتدارانتان لای ئێمە سەرشۆڕە، وە بەبیٚ چەن و چوون پادشاکانتان لای ئێمە هیچ چارەکتان نیە، درێژە مەدەن بە وتار، بەپەلە وەڵام بدەنەوە، پێش ئەوەی ئاگری جەنگ هەڵبگیرسێت، وە پریشکی بە ڕووتاندا بێت، ئیتر لای ئێمە پلە و پایە و سەربەرزیتان نامێنیٚ، وە هیچ شت سوودی نیە و ناتانپارێزیٚ، وە بەهۆی ئێمەوە تووشی بەڵای گەورە دەبن، وە وڵاتتان لەئێوە چۆڵ و بەتاڵ دەبیٚ، ئێمە بەزەیمان پیاتاندا هاتەوە نامەمان بۆ ناردن، وە وریامان کردنەوە کە هەڕەشەمان لیٚ کردن، ئیتر ئێمە هیچ شوێنێکی تر نیە بۆ بچین جگە لە ئێوە، وە سڵاو لە ئێمە و لە ئێوە، و لەسەر ئەو کەسەی کە گوێڕایەڵی ڕێنمونیە، وە دەترسیٚ کە پاشەڕۆژی مردن و گوێڕایەڵی پادشای باڵا دەکات.

الاقل لمصرها هلاوون[1]قد اتى بحد سيوف تنتضي و بواتر

يصير اعز القوم منا اذلة ويلحق اطفالا لهم بالاكابر

ئەم شیعرە هەڕەشەیە لە میسر کە هەرچی شمشێری برندەیە ڕووی لیٚ کردووە، ئەوەی سەربەرزە سەرشۆڕ دەبیٚ، وە منداڵەکانیان نامێنیٚ دەدرێتە سوپا داگیر کەرەکە.

---

١ ـ هلاوون: ئوناوی هۆلاکۆیەی زۆرجار لە سەرچاوە کۆنە هاوچەرخەکانی هاتووە.

# پاشکۆی ژمارە ٢

ڕیوایەتی صارم الدین ازبك کوڕی عەبدوڵای ئەشرەفی

دەربارە وەسفی تەتار و نەریتیان و جەنگی عین جالوت [١] ئەمیر شهاب الدین قرتای عزی خازنەداری لە مێژووەکەیدا بەم شێوە دەڵێ:

صارم ازبك کۆیلەی پادشا اشرف ئەیوبی خاوەنی حەص دەڵێ: کە هەلاوون گەشتە حەلەب من لەوێ نەبووم، لەیەکێك لە ئەشکەوتەکانی حەلەب ماوەی سێ ڕۆژ خۆم شاردەوە، وە من گوێم لە زرمەی پێی ئەسپەکان بوو لەسەر سەرم، کە زرمەی قاچی ئەسپەکان نەما، لە ئەشکەوتەکە هاتمە دەرەوە، بینیم پیاوێکی تەتار لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا مردووە، جلەکانی ئەو مردووەم لەبەرکرد، ئیتر جلەکانم وەك جلی تەتار بوو، ڕووم کردە شوێنی هەلاوون، وە یەکێ لە دادپەروەریەکانی

---

١ ـ وە ئەم دەقە مێژووی ا، قرگای عزی خازنەدار کە لە هاوەڵەکەی هیچ نازانێن هاتووە، جگە لەوەی کە یەکێك بووە لەمیرە کۆیلەکان و چەند پلەوپایەیەکی هەبووە، وەك میری دیمەشق و پەردەداری حەلەب و جێگری گرابلس و لەسەرووی تەمەنی شەست ساڵیەوە مردووە ساڵی ٧٣٤ك/١٣٣٣ز.، و مێژوویەکی نووسیوە، کە مێژوونووسی میسری ناصرالدین محمدی کوڕی فورات کە ساڵی٨٠٧ك/ ١٤٠٥ز. گواستووینەتەوە، لە مێژووە گەورەکەیدا (الطريق الواضح المسلوك الى معرفة تراجم الخلفاء والملوك) کە نەیتوانی تەواوی بکات،و لەم مێژووە گەورەی کوڕی فرات ن بەشی هەیە کە باسی ساڵانی (٥٠١-٧٩٩ك)دەکات کە د.**قسطنطين** زريق بەشەکانی ٩،٨،٧ی لێ بڵاوکردۆتەوە، کە باسی ساڵانی (٦٧٣-٧٩٩ك)دەکات، و ئەو بەشەی کە ئێمە مەبەستمانە بریتییە لەبەشی شەشەم کە باسی ساڵانی (٦٣٥-٦٥٩ك)دەکات، کە مێژووی قرطای عزی تیایە لەگەڵ هەواڵی صارم الدین ازیك کە لەدەقەدا باسمانکرد،و ئەم بەشە لە کتێبخانەی ڤاتیکانە کە ڕۆژهەلات ناسی لیفی دلاڤیدا هەواڵەکانی صارم الدیتی تیا بڵاوکردۆتەوة

Levid;l'inyasione die tartare in syrid nel syrid ne;١٢٦٠ di un testinone ocuyatc,orientalia vol, roma ١٩٣٥

تەتار، ئەگەر چوونایەتە هەرخاکێ لەنزیکی شوێنی پادشـادا نیشانەیەکیان دادەنـا، وە لەسەری ئەو نیشانەیەوە سندوقێکی بچوکیان دادەنا و بە پەت هەڵدەواسـرا، وە لای سندوقەکە و نیشانەکە پاسەوانێ دادەنرا، کە ئەوانە لەکەسـانی گـەورەی تـەتار بوون، ئەگەر کەسێ سکاڵا یان ستەمێکی لێ بکرایـە، سـکاڵاکەی دەنووسـی و مۆری دەکرد و دەیخستە ناو ئەو سندوقەوە، لەرۆژی هەینی دا پادشـا داوای سـندوقەکەی دەکرد و دەخرایە بەردەستی، بە کلیلێ کە لای خۆی بوو سندوقەکەی دەکـردەوە، وە تەماشـای سـکاڵای خـەڵکی دەکـرد، صـارم دەڵـێ: سـکاڵایەکم نووسـی بـەم شێوە:(کۆیلە صارم، نەموت ازیك، ترسام ئەگەر بنووسم ازیك تەتـەرەکان بـە صـارم بانگم نەکەن بەڵکوو بە ازیك بانگم بکەن لە نووسـراوەکەدا نووسـی:کۆیلـەی صـارم، کۆیلەی پادشا اشرف دەسەڵاتداری حمص، زەوی ماچ دەکات، داوای ئامـادە بـوون دەکات لەبەردەستی(قان) کاتێ کە بانگی کردم و ئامادە بووم لەبەردەستیدا، دیـتم پادشـایەکی خـاوەن رێـز و بەدەسـەڵاتە، زۆر رێـزدارە، کورتـە باڵایـە، سـەر و چـاو گەورەیە، دەنگی بڵندە، بەزەیی چاوەکانی لە دەم و چاویدا دیار بوو، خاتوونـەکان لـەلای دانیـشتبوون، لـەلای چـەپی خـاتوو تقـرزی دانیـشتبوو، صـارم دەڵـێ: لەبەردەستی هلاوون وەستام لە چوار پەردە دارەوە قسەی لەگەڵ کـردم، وە لـەناو قسەکانیدا پێ ی وتم:(تۆ کۆیلەی پادشا اشرف دەسـەڵاتداری حـمصی، سوارچـاکی موسڵمانەکان؟ وتم بەڵێ، قسە لەگەڵ دەکردم لە پەردەدارێکـەوە بـۆ پـەردەدارێکی تر، پەردەداری چوارەم بەزمانی تورکی قـسەی لەگـەڵ دەکـردم، کـە بینـی خـاوەن زمانێکی پاراو و بەهێزم، بەخێرایی وەڵام دەدەمەوە، نزیکـی کردمـەوە لـەخۆی، وە فەرمانی دەرکرد کە تەنها یەك پـەردەداری لا بمێنێتـەوە، پاشـان پـێ ی وتم:(مـەی دەخۆیتـــەوە) وتم بـــەڵێ، فـــەرمانی دا پـــەرداخێ مـــەی هێنـــرا، ئامـــاژەی دا بەپەردەدارەکە وتی بیدەرێ، زەویم ماچ کرد، سەمام کـرد، هەنـدێ جموجـوڵم کـرد کە ئەو کەسانە کە لەبەردەم پادشای موسڵماناندا دەیاننوانـد، کـاتێ کـە وڵات هـی ئەوان بوو، ئـەو خاتوونانـە سـەریان سوڕما و دەسـتیان کـرد بـە پێکـەنین و دڵیـان خۆش بوو، بەڵام هلاوون لەسەر زەوی لە زەوی بەرز نـەکردەوە، پاشـان فرمـانی دا

کە دانیشم منیش دانیشتم، وتی بخۆرەوە خواردمەوە، فەرمانی دا خواردن بخۆم خواردم، کە بینی هەر فەرمانێ دەردەکا جێ بەجێی دەکەم، فەرمانی دا کە لەسەر هەموویانەوە دانیشم لە شوێن بەرز و خۆشدا دابنام، من ئامادە نەبووما یە خواردنی نەدەخوارد، وە نەیدەخواردەوە بە ئامادە بوونی من نەبوایە، وە ئەگەر هلاوون بخەوتایە خاتوو تقزی خێزانی بانگی دەکردم، بۆ ماوەی سێ شەو بەم جۆرە دەمامەوە، وە ئێمە ئابلۆقەی حەلەبمان دابوو، پاشان هلاوون پرسیاری لێ کردم دەربارەی فرمانێ لە فرمانەکان، منیش وەلامێکی ناڕاستم دایەوە، لەوکاتەدا حەزم دەکرد زەوی قوتم بدات و ئەو درۆیەم نەکردایە، لەسەر زمانی پەردەدارەکەیەوە پرسیاری لێ کردم: بەماوەی چەند ڕۆژ ئەم ولاتە دەگرین؟ – واتە حەلەب – وتم: لە دە سالدا، هلاوون سەری خستە سەر زەوی و بە تورەییەوە، وتی بە پەردەداکە پرسیاری لێ بکە، بە چەند ڕۆژ ئەم قەلایە دەگرین؟ – واتە قەلا حەلەب– وتم: بە سی٣٠ سالێ، وە مەبەستم لە قسەکەم ئەوە بوو بێزار بێت و بڕوات و حەلەب واز لێ بهێنێ، هلاوون خەندەیەکی کرد و وتی بە پەردەدارەکەی، ئەگەر پێشتر نەهاتبایەتە بەردەستم دەمدا لە گەردنی، شەرم ناکات لەم قسانە؟ ئایا توانای پاشاکانیان وایە؟– واتە پاشای موسلمانەکان– کە ڕایان جیاوازە، وە بەخۆیانەوە خەریکن؟(هەموو ئەمانە لەسەر زمانی تەتار) وە من نەمزانی چی دەلێ، صارم دەلێ: بێ دەنگ بووم، وە پەشیمان بووم لە وەلامەکەم بەوجۆرە، کاتێ کە بینیم زۆر تورە بوو، هلاون لە قسەکانی نەبوویەوە پیاوێکی تەتار خۆی کرد بەژووردا، سەرێکی براوی کەسێکی پێ بوو، بە قژەکان هەلی گرتبوو، خستیە بەردەستی هلاوون و بە زمانی تەتاری قسەی لەگەلێ کرد و پاشان چووە دەرەوە و سەرەکەی لەگەلێ خۆی برد، پەردەدارەکە ڕووی تێ کردم و وتی: ئەی صارم دەزانی ئەوە سەری کێ بوو؟ وتم: نەخێر، وتی: ئەمە یەکێکە لە گەورەکانی تەتار، لە چالێك لە چالەکانی ژێر قەلاکەدا بووە، چووە بۆ پێداویستی خۆی، کوڕەکەی لەجێگەی خۆی داناوە، حەلەبیەکان هێرشیان کردۆتە سەریان، کوڕەکەی کۆمەلێ تەتار لەترسا هەلاتوون، کە باوکی ئەمە دەبیستێ، شوێن کوڕەکەی دەکەوێت و

بەدەستی خۆی کوڕەکەی سەردەبڕێ، وە هێناویەتی بۆ(قان) واتە هەلاوون، صارم دەڵێ: ئیتر زانیم کە تەتار هەر دەبێ حەلەب بگرن، وە کوڕ و کچمان دەکەوێتە دەستی تەتار، وە ئەمەش ویستی خودای لەسەرە، وە ویستی خودا ڕەت ناکرێتەوە.

شەوێك لای هلاوون بەیەکەوە دەمانخواردەوە، هەندێ لە تەتار هاتنە لای کە چەند جۆرێکی زۆر لە مێوژ و تووی لۆکە و گەنم و ئاردەدار و خەڵوز و شتی تریان ێ بوو، هەلاوون تەماشای کردن و زەردەخەنەیەکی کرد، نەم دەزانی چی لە دەرونیدایە، پاشان فرمانیدا کە بە پەرداخی گەورە و زەبەلاح بخۆینەوە، کە چوومە دەرەوە بۆ پێویستی خۆم، پەردەدارەکە شوێنم کەوت، وە خۆشی دەویستم، وە منیش زۆرم خۆشدەویست، وتی ئەی صارم: دەزانی ئەوە چی بوو ئەو تەتارانە هێنایان؟ وتم: نەوەڵاهی نازانم، وتی: ئەوانە بەژێر قەڵاکەدا ڕۆشتوون تا گەیشتوونەتە ئەو شتانە کە تۆ بەچاوی خۆت دیت.

پاشان هلاوون پرسیاری لە سەربازەکان کرد کە هاتبوون، وتی: ئەو چاڵەی ژێر قەڵاکە کە هەڵتان کەندووە جێگەی چەند کەسی تیا دەبێتەوە وتیان: وتیان جێی شەش هەزار کەسی تیادەبێتەوە، وتی فراونی بکەن تا دەگاتە ئەوەی کە جێگەی دە هەزار کەسی تیا بێتەوە، وە سبەینێ پاش نیوەڕۆ تەتار قەڵای حەلەب دەگرێ، وە ژن و کچەکانتان و خێزانەکانی پاشاکان کە لەم قەڵایەدا خۆیان حەشارداوە دەبنە خزمەتکار و بەردەستی خاتوو تقز، ئیتر بزانە ئەی صارم چی دەکەی).

صارم دەڵێ: وەڵاهی کە ئەم قسەم بیست، سەرخۆشیەکەم نەما، بەئاگا هاتم، چوومە ناو پێڕەکەیانەوە، وە لەبەردەستی هلاوون دانیشتم، لەشێوەی گاڵتەجاڕیدا وتم: وەڵاهی پادشاکانی تەتار وەك گوێدرێژن، خاتوو تقز تەماشای کردم و پێکەنی، وتی: چۆن ئەی صارم ؟ وتم:(پاشای موسڵمانان، ئەگەر مەییان بخواردایەتەوە مەزەکەی فستەق و ئاوی ترشی و لیمۆ لەناو کەرەی چینیدا لەگەڵ دەسکە گوڵی ڕێحانە و وەنەوشە و نەرگسدا مێزیان دەڕازاندەوە کەچی ئێوە، مەی دەخۆنەوە بە مەزەکەی خەڵوز و تووی لۆکە و ئاردی دار و ئەو شتە پیسانە)

هلاوون زەردەخەنەیەکی کرد و ژنە خاتوونەکان پێکەنین، صارم دەڵێ: وشەیەك لە دەمم دەرچوو پاداشتەکەی هەر ئەوە بوو کە لەملم بدرێ، وتم:(من دەزانم ئەو سەربازانە لەکوێ ئەو شتانەیان هێناوە، هلاوون تووڕە بوو وتی: لەکوێ دەزانی و چۆن دەزانی؟ زەویم ماچ کرد و وتم: (خوا قان بپارێزێ سوێن بەسەری پادشا، من ئەم شتانەم لە قەڵاکەدا داناوە لەترسی تەتار وە بۆ ئامادەکاری ئەگەر قەڵاکە ئابلۆقە درا، (هلاوون کەمێك هێور بوویەوە و تووڕەییەکەی نەما) چونکە وای دەزانی کە پەردەدارەکە درکاندێتی بۆم، کە لەڕاستیدا وابوو.

پاشان هەستام و زەویم ماچ کرد، وە وتم: خوا قان سەرکەوتوو بکات ڕێزت گەورەیە و، دەسەڵاتەکەت فراوانە، وە پاشاکان لێت دەترسن، وە کەس ناوێرێ لەبەردەستت ڕاوەستێ، وەڵاهی وەڵاهی ئەی خوند، پاشان حەز دەکەن لەبەردەستت بوەستانایە وەك کۆیلەکانی بەردەستت، بەڵام لە زەبر و زەنگت دەترسن) هلاوون زۆر قسەکەمی پێ خۆش بوو وە پێی وتم: ئەی صارم، وتم، گەورەم وتی:(دەتوانی مامۆستاکەت بهێنی پادشا ئەشرف دەسەڵاتداری حەم ؟ وتم: بەڵێ، وتی: سواربە بۆم بهێنە، وتم: دوای دوو ڕۆژ، وتی: بەڵێ، هلاوون فەرمانی دا ئەسپیان بۆ ئامادە کردم، وتی: سواربە و دامەنیشە، وتم: بەمەرج، وتی: مەرجت چییە؟ وتم ئەم قەڵایە داگیر نەکەی تا پادشا ئەشرف ئامادە دەکەم لەبەردەستی قان، وتی: بەڵێ، سوار بووم و دە کەسم لەگەڵ خۆم برد، مۆرم بە ملمدا هەڵواسی – واتە تابلۆی بەرید – لێم خوڕی و گەشتمە غەززە، هەواڵیان پێدام کە پاشاکان ڕایان کردووە ڕوو بە دەشت و چۆڵەوانی، بەپەرتەوازەیی و سەرگەردانی و تاك و تەرا، هەواڵی پلە و پایەی من لای هلاوون گەیشتبووە پاشاکانی موسڵمانان، لێم خوڕی و گەشتم بە پاشاکان لە شوێنێکدا پێ ی دەووترا گۆماوی زیزە.

کە پاشاکان منیان بینی، لە ئەسپەکان دابەزین و هەردوو دەستمیان ماچ کرد، هەروەکو چۆن من کاتی خۆی دەستی ئەوانم ماچ دەکرد، پادشا ئەشرف مامۆستاکەم دەستەکانمی ماچ کرد، زۆرم بەلاوە گران بوو، وە شەرمم لە

مامۆستاکەم دەکرد، وە پادشا الناصر، پاشان پادشا ئەشرەفم وت:(قـان داوای تـۆ دەکات)، ترسا، وتم: لەچی دەترسی؟ وتی: لەقان دەترسم، وتم:(مەترسە لەسەر من بە پادشایی دەگەڕێیتەوە و هیچ ناخۆشیەکت تووش نابێ)، پادشا الناصر ڕووی تێ کردم و وتی: ئەی مـن ئـەی صـارم الـدین؟ وتم: بـۆ تـۆ قـسەم نیـە، پادشـا الناصـر دەستی کردە گریان.

که پادشا اشـرفم بـرد و ڕۆشـتم بـۆلای هـلاوون، وە لەبەردەستیدا ئامـادە بـوو، شوێنێکی بۆ ئامادە کرد تا تیادابنیشێ، بەرخێك و مەنجەڵێك و چەند پارچە دارێکی بۆ دانا، وەڵاهی ئەو شوێنە کـە هـلاوون داینـا بـۆ پادشـا اشـرف سـەگ پـێ ی ڕازی نەدەبوو، وە ئەو بەرخە هێنـدە پـیس و لـەڕ بـوو گـورگ پـێ ی ڕازی نـەدەبوو، وە دارەکەش کەس بۆ ئاگرکردنەوە بەکاری نەدەهێنا ئەوەندە خراپ بوو، ئـەوە ژیـانی هەمیشەیی تەتەرەکان بوو، پادشـا ئەشـرفم لـەو شـوێنەدا بەجێهێـشت، ڕۆشـتم بـۆ خزمەتی هلاوون، وەك نەریتی جاران دانیشتم، فرمـانی دا بخۆم خـواردم، فرمـانی دا بخۆمەوە خواردمەوە، پرسیاری لێ کـردم دەربـارەی بـارودۆخی پادشـاکان، چۆن و چـی دەکـەن، وتم: لـە خـراپترین بارودۆخـدان، ڕایـان کـردووە، پەرتـەوازە و سەرگەردانن لـە چۆڵەوانیدا هـیچ خـەو و خۆراکیـان نیـە لەترسـی دەسـەڵاتی قـان، هلاوون قسەکانی منی پێ خۆش بوو، وتی ئـەی مامۆسـتاکەت چۆن بـەجێ هێـشت ئەی صارم؟ وتم: جگە قان کەس مامۆسـتای مـن نیـە، وتـی: نـەخێر، مامۆسـتاکەت پادشا ئەشرەفە، وتم: هیچ لە هەواڵی نازانم، وتی: چۆن بەتـەنیا بەجێتهێـشت؟ وتم: هەرگیز قان بەجێ ناهێڵم خوا سەرکەوتووی بکات، هلاوون ماوەیـەك بـیری کـردەوە وتـی:(ئـەی صـارم وامـەڵێ، بـەڵکوو بـڕۆ بـۆلای مامۆسـتاکەت، بزانـە لەچـی بارودۆخێکدایە) هاتم بۆلای پادشا ئەشـرەف بینـیم دەسـتی لەژچێر چەناکەیدایە و زۆر دڵتەنگە، بەرخەکەش بەپەت بەستراوەتەوە، سـوتەمەنی و دارەکـەش پـەرش و بڵاوبۆتەوە لەسەر زەوی، وتم: ئەوە چیتە ئـەی خەوەنـد؟ وتـی: ئـەم حاڵـە نـابینی ئەی صـارم الـدین ؟ دەسـتی کـرد بـەگریان، وتم: ئـەی خەوەنـد مـەگری، وەڵا وەڵا وەڵاهی ئەمە ژیانی هەمیشەیی تەتەرەکانە، وە ئەمە حاڵیانە، وەڵاهی ئەی خەوەنـد ئەمـەیان نـەکردووە بـەتۆ، بـەڵکوو ئەمـە ژیـانی تەتەرەکانـە(پادشـا ئەشـرەف

زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:(دەبێ پاشاکان وابن، وە بەم حاڵە و بەم جۆرە پیاوانە پادشاکان وڵاتان دەگرن).

لەم کاتەی کە من قسەم لەگەڵ پادشا ئەشرەف دەکرد، هلاوون ناردی کە لەبەردەستیدا ئامادە بێت، سوێند بە خوا پادشا ئەشرەف ڕەنگی تێکچوو، وە هەرگیز لەوەو پێش نەم بینیوە و ڕەنگی تێکچێ، پادشا ئەشرەف شەش هەزار سواری خوارەزمیەکان بە هەزار و پێنج سەد سوار شکاند و ڕەنگی تێکنەچوو، وە بە هەشت سەد سوار هەزارو پێنج سەد سواری تەتەرەکان شکاند و ڕەنگی هەڵنەبزڕکا.

کە پادشا ئەشرەف لەبەردەستی هلاوون وەستا، من دەستی چەپم گرتبوو پەردەداریش دەستی ڕاستی گرتبوو، سوێند بەخوا پادشا ئەشرەفم بینی دەلەرزی وەك قامیش، خۆی لەسەر قاچەکان نەدەگرت لەترسی هلاوون، پادشا ئەشرەف گەنجێکی جوان بوو، ڕووی ئەسمەرێکی تێکەڵ بەسوور بوو، باڵا بەرز بوو، ئەتڵەس بوو، خوفێکی بونگاری لەپێ بوو بەزێڕ چنرابوو، خاتوو قتزی ژنی هلاوون تەماشای کرد، پاشان ڕووی کردە هلاوونی مێردی ووتی: (ووتی ئەمە گەنجێکی جوان و سوارچاکی موسڵمانەکانە، وە پاشا ئەبێ ئاوا بێ)، هلاوون ڕووی کردە خێزانەکەی خۆی و زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:(ئێمە پادشاین کە ئەم پادشایانە لەبەردەستماندا بە سەرشۆڕی و ترسەوە لەبەردەستماندا دەوەستن) وە پادشا ئەشرەف وەستا بوو لەبەردەستی هلاوون نەی دەزانی ئاخۆ چی بەسەردا دێت، پاشان هلاوون سەری بەرز کردەوە و وتی:(ئەی ئەشرەف چی داوا دەکەی هەڵیبژێرە؟(پادشا ئەشرەف سێ جار زەوی ماچ کرد) صارم دەڵێ: بە ئەشرەفم وت: داوای لێ بکە تاوەرەکەی قەڵاکە(برج) کە دایکت و خوشکەکانت و کچەکانت و خێزان پادشاکان و کچەکانی پادشا الناصر یوسف و خێزانەکەی تیا پێت ببەخشێ، ئەگەر لەم کاتەدا داوای ئەم تاوەرە نەکەی ئەمشەو تەتارەکان قەڵاکەی حەلەب دەگرن و خێزانەکانی پادشا موسڵمانەکان دەبنە کۆیلە و بەردەستی خاتوو تقزی خێزانی هلاوون.ئیتر پادشا ئەشرەف:نابیچت دەمکوژێ.. وتم: تەتار هەر کەس

وەك میوان لایان بێت نایکوژن.

پاشان بۆ جاری دووەم هلاوون وتی:(ئەی ئەشرەف سولتان چی داوا دەکەی هەڵیبژێرە)،پادشا ئەشرەف وتی:(داواکارم لە قان کە ئەم تاوەرەم پێ ببەخشێ کە خێزانم و خێزانی پادشا ناصر و پادشاکانی تر کە هەڵاتوون لەترسی زەبری قان پێم ببەخشێ) ئەمە هلاوونی تووڕە کرد، ماوەیەك بێ دەنگ بوو، پاشان وتی:(داوای شتێکی تر بکە نەك ئەمە)، پادشا ئەشرەف بێ دەنگ بوو، خاتوو قتز وتی بە هلاوون:(شەرم ناکەیت ئەم پادشایە داوای ئەم تاوەرە دەکات، کەچی لێی قەدەغە دەکەی، وەڵاهی ئەگەر داوای حەلەبی لە من بکردایە لێم قەدەغە نەدەکرد، ئەو سوارچاکی موسڵمانەکانە)، هلاوون وتی:(من لەبەر تۆ پێ ی نادەم، تا کچان و ژنانی پادشاکان ببنە خزمەتکاری تۆ)، وتی:(من لەبەر خودا ئازادیان دەکەم پاشان لە پادشا ئەشرەف) ئیتر هلاوون داواکەی پادشا ئەشرەفی نووسی، وە قبوڵی کرد، وە پادشا ئەشرەف سێ جار دەستی هلاوونی ماچ کرد.

صارم دەڵێ:کە پادشا ئەشرەف دەستی هلاوونی ماچ کرد و گەڕایەوە بۆ لامان و لەناوماندا وەستا و ویستی زەوی ماچ بکات، وە من دەست چەپیم گرتبوو پەردەداریش دەستی ڕاستی گرتبوو، وەڵاهی پادشا ئەشرەف زەوی ماچ کرد و ویستی هەستێتەوە نەیتوانی هەستێتەوە لە ترسی هلاوون، من و پەردەدارەکە چوینە بن دەستی و بەرزمان کردەوە وە پێم وت: دامەزراوبە، وە ئەم ئایەتەم بۆ خوێندەوە:(یثبت الله الذین امنوا بالقول الثابت فی الحیاة الدنیا و فی الاخرة).

صارم ازیك بە ئەشرەفی وتی: هۆلاکۆ پێ ی وتم لە قسەکانیدا(ئەی صارم حەز دەکەی لەگەڵ پادشا ئەشرەف بمێنیتەوە یان لەگەڵ من ؟) زەویم لەگەڵ دەستی ماچ کرد، وتم:(هەرگیز لە قان دوور ناکەومەوە)، ئەوەش لە دڵمەوە نەم وت، پاشان هۆلاکۆ ڕووی کردە خۆرهەڵات، کتبغا نوینی کردە جێگری خۆی بەسەر حەلەب و دەوروبەری، بێدرای کردە جێگری خۆی بەسەر دیمەشق و دەورووبەری، وە ڕووی کردە خۆرهەڵات، وە داوای کرد کە صارم لەگەڵیدا بێت، وە کۆیلە تورکەکانی دەریا ئەوانەی کە لە قەڵای حەلەب بەند کرابوون بریتی بوون لە: سنقری ئەشقەر، سەکەز، یرامق، بەمکەشی مسعودی، حەوت کەسی بوون، وە ووتران تۆکەس بوون.

صارم دەڵێ: کە هۆلاکۆ گەیشتە اعزاز و گەیشتە دەوروبەری موصل بانگی کردم، وتی ئەی صارم: ئەگەر لای من دەمێنیتەوە ئەوا تەبەڵخانەت [1] پێ دەدەم، یان لەشام لەناو خاك و ئاوی خۆت دا دەمێنیتەوە؟ دەستم ماچ کرد و وتم:(هەرگیز لە قان دوور ناکەومەوە و لێی جیانابمەوە).

وتی: نا، شام لات خۆشترە، چونکە خێزان و ماڵ و منداڵ و ملکت لە شامە، (فەرمانی دا ئەسپ و سامان و ئاژەڵم پێ بدرێ، وە داوای لە پادشا و میرەکانی خۆی کرد ئەوانیش هەرکەس بەپێی توانایان شتم پێ ببەخشن، سوێند بەخوای گەورە کە لە هۆلاکۆ جیا بومەوە، نەمزانی ئەوەندە سامان و ماڵی زۆرم پێ دراوە بۆم نەدەژمێررا، بەڵام ئەوەی کە زانیم بریتی بوو لە هەزار و پێنج سەد ئەسپ، وە لە قومشدا دەهەزار پارچە لەنێوان مروزی و کەمخی و چنراوی ئەتڵەس و عتابی و شتی تریش، کاتێ کە فەرمانیدا برۆم بۆ شام، لەو قسانەی کە بۆی کردم وتی: ئەی صارم تۆ دەزانی ئێمە چەند چاکەمان لەگەڵ تۆ کرد، کورەکانم لای تۆ کتبغا و بیدرا ئەو دوانەیان لەهەموو کورەکانی ترم بەرێزترن، ئاگات لێیان بێت، وە چاودێریان بکە، (هەموو ئەمە و من زەویم ماچ کرد و دەستیم ماچ کرد پاشان پێ ی وتم:(ئەی صارم، ئەگەر گەیشتیتە لای کتبغا گەردنی بگرە دەستی خۆت)، وە هۆلاکۆ گەردنمی بەدەستی خۆی گرت و پێ ی وتم: (بڵێ بە کتبغا کە بەعلەبەگ و دیمەشق و وڵاتانی شام و وڵاتی منن و لەژێر دەستی مندان، دروست نیە ستەم لەژێر دەستە بکەین، چۆن وێرات سندوقێکی زێر لە پیاوێکی بەعلەیەکی داگیر بکەیت؟ زێرەکەی بۆ بگەرێنەرەوە ئەگەر نا دەمری، دەست لە گەردنی

---

١ ــ دەربارەی رژێمی تەبەلخا لە سەردەمی مەغۆل هیچ نازانین، لەوانەیە هاوشێوەی رژێمی سەردەمی مەملوکی بووبێت، کە خاوەنی تەبەلخانە جل سواری کۆیلەی هەبوو، تا لە جەنگەکانی دەوڵەت بەشداری بکات، وە ئەوەی ئەم بلە و بایەی ببوایە، خاوەن تیمێکی موسیقای جەنگی بوو کە بێ ی دەوترا گبلخانە لەبەر دەرگای ماڵەکەیدا تەپڵیان لێ دەدا، وە لە میرەکانی تەبەلخانە والی ناوچەکان — بەرێوەبەرەکان — و فەرمانبەرانی بچوك و گەورەکان، وەك جێگری دەوادار و والی قەلا و بێشەنکی کۆیلەکان. تەماشای: (القلقشندی: صبح الاعشی ج٤ ل٨ — ١٢ — ١٥ — ٥٠ بکە.

مەگەڕێنەرەوە تاوەکو زێڕەکەت دەگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی).

که ماڵئاوایم له هۆلاکۆ کرد پێ ی وتم: (ئەی صارم که گەیشتیته لای کتبغا و بیدرا یارمەتیان بده بۆ

گرتنی(بخش الفار) [١]– که مەبەستی وڵاتی میسر بوو – چونکه من فەرمانم پێ١داون که وڵاتی میسر بگرن) صارم دەڵێ: (میسر لای تەتارەکان وەك کونە مشك بوو، ئەگەر له شوێنێك بپەڕێتەوە هەر لەوێیشەوە دەردەچێ، ئەوەش لەبەر تەسکی ڕێڕەوەکە، وه کاتێ هۆلاکۆ ئەو فەرمانەی پیادام، خێرا فەرمانەکەیم بە گوێڕایەڵی یەوە جێ بەجێ کرد، پاشان ڕووم کردە شام، دەبینم تەتار هەمووی لەسەر ڕووباری ئەردەن کۆبونەتەوە، که منیان بینی لە ئەسپەکانیان دابەزین، وه نێوانی هەردوو چاوی منیان ماچ کرد، ئەوەش لەبەرئەوەی که ناوچەوانی من تازە بە تازە له هۆلاکۆ دوور کەوتبووە، چونکه هۆلاکۆ زۆر گەورە و بەڕێز بوو لایان، پاشان دەربارەی سندوقە زێڕەکە قسەم لەگەڵ کتبغا کرد، وه وتم هۆلاکۆ وتی بۆ خاوەنەکەی بگەڕێتەوە، بەخێرایی و بەگوێڕایەڵیەوە سندوقەکەی گەڕانەوە بۆ خاوەنەکەی خوا دەزانێ.

صارم دەڵێ: که خواحافیزیم له پادشا هلاوون کرد له وڵاتی موصل، لەو شتانەی که پێی وتم:(ئەی صارم، سوپاسی نیعمەتم بکه لەسەرت)، وتم: ئەی خەوەند، خوا پشتگیری قان بێت، تۆ خاوەنی نیعمەتی زۆربەی لەگەڵ خوادا لە سەرفی، وتی: دەزانی چۆن بوویت هاتیته لای من ؟ وتم: بەڵێ، وتی: گەورە کردی لەبەر چاوی

---

١ ــ واته کۆنه مشك، وه میسر لای تەتارەکان به (کاروان سەرا) ناسرا بوو، لەو وتارەی که هۆلاکۆ ئاراستەی بادشا الناصر یوسفی کرد که دەستەڵاتداری شام بوو ووتی: بێمان کەیشتووه که بازرکانەکانی شام و خوڵکی تریش ڕایان کردووه و ڕوویان کردۆته کاروان سەرا، ئەگەر لە جیاکاندا بوونایە وێرانمان دەکرد بەسەریاندا.. هتد. وه مەبەست لە ووشەی کاروان سەرا شوێنی حەوانەوەی کاروانجیەکان یان میوانخانەی کەشتیاران. وه لەوانەیە ناونانی ووشەی میسر بەم ووشه دەکەڕێتەوە بۆ ئەوەی که زۆربەی ڕێکاکانی بازرکانی لە میسردا کۆتایی دەهات، لەهەموو لایەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا له سەدەکانی ناوەڕاستدا. تەماشای (المقریزی: السلوك) ج١ ل٤١٦ پەراوێزی زمارە ٣ بکە.

پادشاکان تاوات لێ هات تکایان بۆ بکەیت لای من، وە دەستت ماچ بکەم، هەروەکو چۆن تۆ دەستی ئەوانت ماچ کرد، پاشان وتی:(ئەی صارم سوپاسم بکە لەسەر نیعمەتم).

دەستم ماچ کرد، وە وتم خودا قان بپارێزێ، نیعمەتەکانت زۆرن لەسەرفی، وتی: (ئەوەك ئەم نیعمەتە ؟) وتم: کامەیە ؟ وتی لە شەوی فلآندا ئێمە لەسەر حەلەب بووین، بەزمانی تورکی سێ وشەم پێ وتی، بەخوا هەرگیز پێشتر قسەم بەم شێوەیە لەگەلّ کەس نەکردووە، وە ئەم قسەم لەگەلّ نەکردی تاکو وەسیەت بکە بە کورەکانم کتبغا و بیدرا، وە چۆنم لەگەلّ کردی وایان لەگەلّ بکەی، وە نامەی تۆم بۆ نەیەت ان شاءالله مەگەر دوای ئەوەی کە میسر بگرن.

صارم وتی: کە گەیشتمە شام، ببینم تەتارەکان لەسەر ڕووبار ئەردەن کۆبونەتەوە، وە دەردەچن ڕووەو ولآتی میسر، وە موسلّمانەکانیش دەرچوون بۆ بەرەنگاربوونەوەیان، کەزانیم تەتارەکان هەر دەڕۆن ڕووە و ولآتی میسر بۆ ئەوەی بیگرن، خزمەتکارێکی خۆم لەشێوەی سیخوڕ نارد بۆ میسر، وە فەرمانم پێ کرد کە لەگەلّ پادشای سەرکەوتوو قتز و لەگەلّ میر بیبرس بوندقداری و بلبان رشیدی و سنقری رومی وە پێیان بلّێت کە تەتار هیچ نیە، مەترسن لێیان، وە بالآی چەپی سوپای موسولّمانەکان بەهێز بێت بە ئەسپ و پیادە، وە پێیان بلّێ کە تەتار سوپاکەیان کەمە، پێم وت پێیان بلّێت با لە بەرەبەیان و کاتی خۆرهەلآتن ڕووبەڕووی تەتار ببنەوە، کە خزمەتکارەکەم گەیشتە ناو سوپای موسلّمانەکان، بینی کە سوپای موسلّمانەکان زۆر دەترسن لە سوپای تەتارەکان، لەگەلّ هەندێ لەو میرانە کە من بۆم دەست نیشان کرد بوو کۆبوویەوە، وە ئەوەی پێی وتن کە من وەسیەتم پێ کردبوون، وە وتبووم: بلّێ بە میرەکانی موسلّمانەکان نەترسن، ئەوە من و هاوڕێکانم و پادشا ئەشرەف لەبەردەستتان هەلّدێین، بەو خودایە بەو شێوەیە بوو، کە میرە موسولّمانەکان قسەی خزمەتکارەکەی منیان بیست، هەندێکیان بە هەندێکیان وت: ناکرێ ئەمە کارپێ کراو بێت لەسەر موسلّمانەکان.

کاتێ کە شوێنی پێکدادانی هەردوو سوپاکە(عین جالوت) بوو، خۆرمان لێ

هەڵهات، سێبەری سوپای ئیسلام دەرکەوت، یەکەم پۆلی سوپا کە دەرکەوت، سورو سپی، چەکی چاکیان لەبەر بوو، خۆرهەڵات بەسەر ئەو ژمارەدا، کتبغا داوای منی کرد، واقیان ورمابوو لە زۆری سوپای موسڵمانەکان و ئەوشتە باشانەی کە هەیانبوو، وە جوانیان دیار بوو کە لەلێژی چیاکەوە دادەبەزین، کتبغا بانگی کردم وتی: ئەی صارم ئەم رنك هی کێ یە ؟[١]

وتم: سنقری رۆمی، پاشان ئاڵای زەردی تر دەرکەوت، وتی: ئەم ڕەنگە هی کێ یە؟ وتم: بلبانی ڕەشیدی، پاشان یەك لە دوای یەك سوپا دەهات، وە لە دامێنی چیاکەوە شۆڕ دەبوونەوە، وە تەقەی تاسەکان دەهات،[٢] دەنگی تەبلخانەکان و تەپڵ دەهات، دەشت و دۆڵەکان دەزرنگایەوە لەدەنگی تەپڵ و تاسەکان،جوتیار و خەڵکی گوندەکان و ناوچەکان نادیار بوون لەهەموو لایەك، وە من شارەزا بووم بە دروشمی موسڵمانەکان، کتبغا پرسیاری لێ کردم: ئەمە ڕەنگی کێ یە ؟ منیش هەرشتێ بەسەر زمانمدا بهاتایە دەم وت.

پاشان تەتارەکان پەنایان بردە بەر چیاکە، خوای گەورە سەرکەوتنی نارد، وە میللەتی محمدی ڕزگار کرد بە کۆیلە تورکە دەریاییەکان، هیچ تەتارێك بەسەلامەتی دەرنەچوو تاوەکو هەواڵ بگەیەنێ بە هەلاوون، بەڵکوو هەموویان کوژران، وە هەواڵیان بەکەس نەگەشت مەگەر بەوانە نەبێ کە جێگیر بوون لە دیمەشق و لە حەلەب، ئەوەی قرتای باس کرد تەواو بوو.[٣]

---

١ ـ رنك بێشتر ئامازەمان بۆ کرد واتە دروشم، کە بەڵگەیە لەسەر ئەرك و بلە و بایەیەك کە خاوەنی ئەو دروشمە هەیەتی. وە نەریتی هەر ئەمیرێکی مەملوکی گەورەیان بجوك وابوو کە ڕەنگی خۆی هەبوو تایبەت بە خۆی، بەڵام ڕنکی موسڵمانەکان بەڵکە بوون لەسەر فەرمانەکەی تایبەتی لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی، کەجی لە ئەوروبا و لە جەرخەکانی ناوەڕاست دا هێما بوو بۆ خێزانە دەرەبەگەکان، هەموو خێزانێك دروشمی تایبەت بە خۆی هەبوو کە لە خێزانەکانی تری دەرەبەگەکان جیای دەکردەوە

٢ ـ تاسەکان ئامێرێکی مس بوون وەك ساج.

٣ ـ ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم دەقە، جگە لەو چالاکیەی کە تیایدایە، وە ئەو ئامازانەی کە بە نرخن کە لەم دەقانەدا هەیە، کرنکیەکی تایبەتی هەیە بۆ مێزووی کردووە لە ڕۆڵەی کە

# پاشکۆی ژمارە ٣

**پەیامی سوڵتان قتز بۆ پادشای مژدەی یەمەن پێ دەدات بە ژێرکەوتنی تەتار قەلەشەندی[1] دەڵێ:**

**ئەمە نوسراوی پەرتوکێکە، کە پادشای سەرکەوتوو قتز نووسیویەتی بۆ دەستەلاتداری یەمەن لەو ڕۆژگارەدا مەنصور،[2] مژدەی دا بە دۆڕاندنی تەتار لە جەنگدا، وا گومان دەبەم لە دانراوی قازی محی الدین کوڕی عبدالزاهر بێت،[3] کە بریتییە لە: خودای بڵند پایە شتیوانانی معزالشریف العلی سەرخست، مەولەوی، سوڵتان، پادشای منصوری، وە مەنارەکەی بڵند کرد، وە توانای چەندجار کرد، دەزانین کە لە نیوەی مانگی ڕەجەب دا بوو[4] کە خودا سەرکەوتنی بەخشی بە موسڵمانان بەسەر دوژمنانی موسڵماناندا.... ئەو سەرکەوتنەی کە ڕاست و دروست بێت، وە تانە لە ئامۆژگاریەکانی بدات، ئەوەیە کە تەتار خوا سەرشۆڕی کردن، دەم درێژیان کرد بەسەر ڕۆژگاردا، چوونە ناو وڵاتی شام، وە داوای فریاکەوتنیان کرد بە هۆزەکانیان دژی ئیسلام:**

**سعی الطمع المردي بهم لتخوفهم و من ينسكن ذيل المطامع يتعب**

**ئەم شیعرە باس لە هەوڵی تەتار دەکات بۆئەوەی بگەنە ئامانج و ئاواتەکانیان**

---

کیڕاویەتی لە ماوەی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا،بەلام وا دەردەکەوێ کە هیچ کۆڕانێکی لە ناوەڕۆکی ڕاستیە مێژووییەکاندا نەکردووە.

١ ـ القلقشندی: صبح الاعشی ج٧ ل٣٦٠-٣٦٢

٢ ـ لەوانەیە منصور نورالدین عومەری کوڕی عەلی سوڵتانی دەوڵەتی ڕەسولیە بووبێت لە یەمەن

٣ ـ خاوەنی (دیوان الانشاء) لە ڕۆژکاری قتز و بیبرس و قلاوون و ئەشرەف خلیل کە ساڵی ١٢٩٢ زاینی کۆچی دوایی کردوە. کە کتێبی (تشریف الایام و العصور فی سیره المنصور) هەیە لە ساڵی ١٩٦١ مراد کامل تخصیصی کردوە.

٤ ـ ئەم بەروارە پێچەوانەی سەرچاوە عەرەبیەکانی ترە کە دەڵێ شەڕی عین جالوت لە ڕۆژی هەینی ١٥ ی ڕەمەزانی ساڵی ٦٥٨ کۆچی ڕوویدا.

بەڵام هەوڵەکانیان مەرگی خۆیانی تیا بوو، چونکە دەستیان بە کلکی چاوچنۆکی تاڵان کردنەوە گرتبوو لەبەرئەوە پەکیان کەوت.

هەستانیان بە ڕێگای سەرگەردانیدا بوو، وە کەشتی ئاواتیان لە دەریای ئاواتیان نقووم بوو،ئەوەش ئاواتێکی پووچەڵە، وە کەشتیەکی گومانی پەککەوتووە، ئەمە و سوپای موسڵمانەکان جێگیر بوو لەشوێنی خۆیدا، بوو بەهۆی کێش کردنی هەڵۆکانیان لە هێلانەکانی بۆرا و چیەکان، شێرەکانیان خۆیان لە بێشەدا حەشار دابوو، قاچی هیچ باوەڕدارێك نەخلیسکا، چونکە باوەڕی جێگیر بوو، وە بۆ یەك شەممە بەڵگەیەك جێگیر نەبوو مەگەر هەینی بیسرپیبایەتەوە، وە لێدانی زەنگ جێگیر نەبوو بەڵکوو خێرا بانگ دەدرا جێگەی دەگرتەوە، وە هیچ کتێبێك قسەی نەکردووەخێرا قورئان بێ دەنگی نەکردبێ.

بەردەوام هەواڵی موسڵمانەکان دەگوازرایەوە بۆ کافرەکان، وەهەواڵی کافرەکان دەگوازرایەوە بۆ موسڵمانەکان، تا بەرەبەیان زیوەکەی تێکەڵ بە زێڕی پوختە کرد، وە ئەمڕۆ وەك دوێنێی لێ هات، وە ئایەتی شەو سڕایەوە بە سوورەتی خۆر و چاوەکان بە کلی سڕبوون پڕکران، وە موسڵمانان هەموویان دەترسان لە دەرکردنی خەوتن:

ينام باحدى مقلتيه ويتقي     باخرى الاعادي فهو يقظان نائم

باس لە وریایی موسڵمانان دەکات کە چۆن بەچاوێ دەخەوتن و بەچاوێ تەماشای جمو جۆڵی دوژمنیان دەکرد، وەك ئەوەی کە هەم بەئاگابێت و هەم خەوتووش بێت.

تا ڕۆژبوویەوە و چاو چاوی دەبینی، ئاگری جەنگ کڵپەی کرد لەنێوان هەردوولادا، هەر لێدان بوون لە شیرەوە تیشکی دەهاویشت، وە لە سکی هەموو بێ باوەڕێکدا پارچەی پارچەی گۆشت بەجێ دەهێشت، تاوای لێ دەهات چۆڵەوانیەکە قەرەباڵغ بوو، وە پاوانی ئاسکەکان بۆ ئاسکەکان بوو بە گۆڕەپان، وە شێرە موسڵمانەکان ڕاوی بێ باوەڕەکانیان دەکرد، (ورأى المجرمون النار فظنّوا انهم

مواقعوها) وە شوێنی دەربازبوونیان نەبوو، باخچەیان نەدی قەڵغان نەبێ، جۆگە ئاویان نەدی شمشێر نەبێ، مادامیان نەدی خوێن نەبێ، ئاوازیا نەدی حیلکەی ئەسپ نەبێ، وە سەرخۆشیان نەدی بەکوژراوی نەبێ، تا وای لێ هات بڕوا بە ئایین بووە برای دایك و باوکی، وە ڕەنگی ووردە چەو بەهۆی خوێنەوە گۆڕا بۆ یاقوت، وە تەپ و تۆز لە ئاسماندا ڕێگای دروست کرد، وە ئەسپەکان لەبۆشاییدا هێندە زۆر بوون ئاسمانیان کردە تەنگەڵان، وە لە بێ بڕواکان هەموو سەرکەشێك کوژرا، ئەوەش بەهۆی کردەوەی خراپی خۆیان (وما ربّك بظلام للعبيد) پەروەردگاری تۆ ستەم لە بەندەکان ناکات.

دەڵێم[1]: ئەم بەشە لە دەمی هەندێ کەسەوە وەرم گرتووە، کە لەهەندێ کۆمەڵەوە وەریان گرتووە و لێیانەوە لەبەریان کردووە، ئەمەش لە ئەوپەڕی ڕەوانبێژیدایە، بەلاّم خاڵی نیە لە گۆڕان کە بەسەر هەندێ لەشوێنەکانیدا هاتووە، لەوانەیە هەندێ لەوانەی کە گواستویانەتەوە، لەو ڕووەی کە لەم پیشەدا شارەزا بوون، نەم توانی وازیان لێ بهێنم چونکە چاکەی ئێوە دیار بوو، وە لەبەرئەوەی بەشێوازێك لە شێوازەکان لەو نامە و پەیامانە دەچوو کە نێررا بوو بۆ پادشای یەمەن، هەر بەوشێوەیە هێناومە خوا پاداشتی ئەو کەسە بداتەوە کە نوسخە بنەڕەتیەکەی دەست بکەوێت لەگەڵ ئەمەدا بەراورد بکات و ڕاستی بکاتەوە و چاکسازی تیا بکات.

---

١ ـ ئەمە قسەی قەلقەشەندیە لەسەر پەیامەکە

# ناوەڕۆك

ئەوەی لە ماوەی وتنەوەی وانەی مێژووی مەمالیکدا بەدیمانکرد ئەوەبوو سەرباری گرنگی زۆری ئەم بابەتە و پەیوەندی قووڵی بە مێژووی ڕۆژهەڵاتەوە، کەچی تا ئێستا بەزمانی شیرینی کوردی هیچ سەرچاوەیەکمان نیە ئامازە بەم مێژووە و لایەنەکانی بدات، کتێبخانەی کوردی لەم بوارەدا گەلێك هەژارە، خوێندکار و خوێنەری کوردیش بە نەزانینی زمانەکانی تر بە تایبەتی عەرەبی زۆر ئاگاداری ئەو مێژووە نابێت و باش لایەنەکانی بۆ دەرناخرێ، بۆیە پاش وردبوونەوەمان بەنێو سەرچاوەکاندا و پرسکردنمان بەچەند مامۆستایەکی پسپۆڕی تری ئەم بوارە بریارماندا ئەم کتێبەی پرۆفیسۆری بەناوبانگی میسری (د.أحمد مختار العبادي) هەڵبژێرین، کە بۆخۆی مەنهەجی خوێندنە لە زانکۆی ئەسکەندەریەی میسر و بەشێوەیەکی زانستی و ئەکادیمیانەو بێلایەنانە نووسراوە .

م.زریان حاجی